چینی کرێکار لەگەڵ تەوژمدا دەڕوات. پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی بە تاڤگەی ئەو ڕووبارە دادەنرا کە چینی کرێکار لە گەڵیدا دەڕۆیی. ئەم بۆچوونە یەك هەنگاو دوور بوو لە وەهمی ئەوەی کە ئیشی کارگە، کە وا دانرابوو بەرەو پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی بڕوات، بە دەسکەوتێکی سیاسی دادەنا. ئاکارەکانی ئیشی پرۆتیستانتی لە نێو کرێکارە جەرمانەکاندا زیندوو کرایەوە، بەڵام بە فۆرمێکی دنیایی. بەرنامەی گۆتا[1](Gotha) شوێنکاری ئەم سەرشێوانەی پێوە دیارە، کاتێك کە پێناسەی ئیش بە "سەرچاوەی هەموو سامان و هەموو فەرهەنگێك" دەکات. مارکس لە پێچەوانەی ئەوەدا نووسی: "ئەو مرۆڤەی هیچ سەرمایەیەکی نیە بێجگە لە هێزی کار، دەبێتە کۆیلەی ئەو کەسەی کە خۆی خاوەنی کارەکە." لەگەڵ ئەوەشدا شێواندنەکە هەر بەردەوام بوو و خێرا یوسف دێتزگز. (Josef Dietzgez) رایگەیاند کە "رزگار کەری ئەم سەردەمەمان پێی دەوترێت کار. پێشخستنی کار ئەو سامانە پێکدەهێنێت کە دەتوانێت کاری وامان بۆ بکات کە هیچ رزگارکەرێك تا ئێستا نەیتوانیبێت بیکات". ئەم چەمکە مارکسییە بازاڕییە دەربارەی سروشتی کار لە مەسەلەی سوودوەرگرتنی کرێکاران لە بەرهەمەکانیان، کە هێشتا لەبەر دەستیاندا نیە، خۆی لادەدات و پێشکەوتن تەنها لە زاڵبوون بەسەر سروشتدا دەبینێت نەك لە داهێزرانی کۆمەڵگا، ئەو ڕەوشتە تەکنۆکراتیانە دەردەخات کە پاشان لە فاشیزمدا ڕووبەڕووی بووینەوە. یەکێك لەوانە ئەو چەمکە بوو دەربارەی سروشت کە بە تەواوەتی جیاوازبوو لەوانەی کە یۆتۆپیا سوشیالیستەکان پێش شۆڕشی 1848 هەیانبوو. ئەم چەمکە تازەیەی کار دەگاتە رادەی کەڵك وەرگرتن و بەکارهێنانی سروشت، کە ئەگەر بە لەخۆباییبوونێکی ساکارەوە سەیریان بکەین، دەتوانین بەراوردیان بکەین بەکەڵك وەرگرتن و چەوساندنەوەی پرۆلیتاریا بە بەراووردکردنی ئەم چەمکە پۆزەتیڤیستە لەگەڵ فەنتازیەکانی (فووریێ Fourier)دا، کە زۆرجار گاڵتەی پێدەکرێت، ئەوانەی فووریێ بەشێوەیەکی سەروسووڕێنەر، لە ڕاست دەچن. بەگوێرەی فووریێ، لە ئەنجامی کارامەی کاری هەرەوەزیدا، شەوانە چوار مانگ شەوانی زەوی رۆشندەکەنەوە، سەهۆڵ جەمسەرەکان تێدەپەڕێنێت و ئاوی دەریاکان ئیتر تامی خوێ نادەن، ئاژەڵەکانی ڕاووشکاریش ئیتر گوێڕایەڵی فەرمانی مرۆڤ دەبن. ئەمانە هەموویان وێنای جۆرە کارێك دەکەن کە، دوور لە بەکارهێنان و چەوساندنەوەی سروشت دەتوانێت ئەو دروستبووانەی کە لە مندااڵدانی سروشتدا ئارامیان گرتووە بزایێنێت. سروشت، کە وەکو دیتزگز دەڵێت "بەخۆڕایی هەیە" پاشکۆی چەمکی شێوێندراوی کارە.

## XII

## ئێمە پێویستیمان بە مێژوو هەیە، بەڵام نەك بەو شێوەیەی کە سوالکەرە پواوەکانی باخچەی مەعریفە دەیانەوێت

*(Neitzeche, of the use and Abuse of History)*

نەك بەپیاوێك، یان چەند پیاوێك، بەڵکو بەخەباتکردن، چینی چەوساوەی خۆی مەعریفەی مێژووییە، لای مارکس، ئەم چینە دوا چینی کۆیلەکراوە، ئەو چینە تۆڵەسێنەیە کە بەناوی هەموو نەوە پێشێلکراوەکانەوە فرمانی رزگارکردن جێبەجێ دەکات. ئەم باوەڕە، کە لە بزووتنەوەی گرووپەکەی سپارتاکۆس(2) دا زیندووبوونەوەیەکی کورتی هەبوو، هەمیشە لەلایەن سوشیال دیموکراتەکانەوە بەرهەڵستی

کراوە. توانیان بۆ ماوەی سی ساڵ ناوی بلانکی *Blanqui* بـە تـەواوەتی بکوژێننـەوە، لەگـەڵ ئەوەشدا کە ئەو ناوە لە سەردەمی پێشـوودا دەنگـی کۆکردنـەوەی خـەڵك بـوو. سوشـیال دیموکراتـەکان بـە باشـیان زانـی کـە ڕۆڵـی ڕزگارکەری نەوەکانی داهاتوو ببەخشن بە چینـی کرێکـارو بـەمجۆرەش شـادەماری گـەورەترین هێزیـان لێـبڕی، ئـەم مەشـقدانە وای لـە چینـی کرێکـار کـرد کـە گیـانی قـین و قوربـانیدانی لەبیربچێتەوە، چونکە ئەم گیانە بەهەستکردن بـە بەکۆیلـەبوونی باپیرانیـان گەشـەدەکات، نـەك بەگیانی ڕزگارکردنی نەوەکانی داهاتوویان.

### *XIII*

تیۆری سوشیال دیموکراتـەکان، بـەکردەوەش زیاتر، لەسەر چەمکێکی پێشکـەوتن دامـەزرا بـوو کـە لـە واقیعـەوە دووربـوو و تەنـها چـەند داواکارییەکی دۆگمایی بوو. ئەو پێشکەوتنەی کـە لـە زەینـی سوشیال دیموکراتـەکاندا وێنـاکرابوو بریتـی بـوو، لـەپێش هـەموو شـتێکەوە، لـە پێشخستنی خـودی مرۆڤایەتی (نەك بەتەنها لە تواناو مەعریفەتدا)، دووەم، ئـەم پێشخسـتنە بـێ سنوور بوو چونکە بێ خەوشییەکی بـێ سنووری بۆ مرۆڤایەتی دەویست، سێهەم، ئەم پێشـکەوتنە بە شتێك دادەنرا کە کـەس نـاتوانێت بەرهەڵستی بکات و بەشێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی بـەرەوتێکی ڕاست یان پێچاو پێچ بـەرەو پێشـەوە دەڕوات. هەریـەکێك لـەم بینینانـە نـاکۆك و ڕەخنـە هەڵدەگرن. لەگـەڵ ئەوەشدا، پاش لێکردنـەوەی لق و پۆپەکان، ڕەخنە دەبێت بگاتـە پشتی ئـەم بینینانـەو شـتە هاوبەشـەکانی نێوانیـان بدۆزرێتـەوە. چـەمکی پێشـکەوتنی مێژوویـی مرۆڤایەتی نـابێت لـە چـەمکی پێشکەوتن لـە زەمـانێکی چوونیـەکی (*Homogenous*) بـەتاڵ جیابکرێتـەوە. ڕەخنـە لـە چـەمکی ئـەم جـۆرە پێشکەوتنە دەبێت ببێتـە بناغـە بۆ ڕەخنـە لـە چەمکی خودی پێشکەوتن.

### *XIV*

### بنەچە ئامانجمانە

( *Karl Krans, Worte in Versen, Vol. 1* )

مێـژوو بابـەتی بونیادێکـە کـە شـوێنەکەی زەمانێکی بەتاڵی چوونیەك نییە، بەڵکو زەمانێکـە کە پڕکراوە بـەبوونی ئێستا[3] (*detztzeit*). بەم شێوەیە، لای ڕوبسپێر، ڕۆمای کـۆن ڕابوردوویـەك بـوو کـە بـەکاتی ئێسـتا بارگـە درابـوو. ئـەو ئێستایەی کە لە ڕەوتـی پەیوەستەی مێـژووەوەو (*Continuum of history*) دابتاشیبوو شۆڕشـی فەرەنسا خۆی وەك دونایدونکردنی ڕۆما دەبینـی. دەیویست گیانی ڕۆما زینـدوو بکاتـەوە، هـەروەك چـۆن لـە مۆدێلـی جـل و بـەرگدا (*fashion*) شێوازی جلـی کۆن زینـدوو دەکرێتـەوە، مۆدێلی جل و بەرگی مەیلی گەڕانی هەیە بەدووی بابـەتدا، گرنگیش نییە لە دارستانی چ سـەردەمێکدا بـە دەستدەکەوێت، وەك بازرەقـەی پڵنگێـك بـەرەو ڕابوردوو وایە. ئـەم بازدانـەش لـەو زۆرانگەیـە ئەنجامدەدرێت کە چینـە فـەرمانڕەواکان تیـایدا فەرماندەدەن. هەمان بازدان، ئەگەر لەمەودایەکی کـراوەی مێـژوودا بکرێـت بـە دایـەلێکتیکی دەژمێردرێت. مـارکس بـەمجۆرە لـە شـۆڕش دەگەیشت.

### *XV*

ئاگاداربوون لـەوەی کـە خەریکـە وا ڕەوتـی پەیوەسـتی مێـژوو بتەقێننـەوە یەکێکـە لـە سیفەتەکانی چینە شۆڕشگێڕەکان لـە ترۆکـەی (*MOMENT*) کردارەکەیاندا، شۆڕشـە مەزنەکـە ڕۆژژمێرێکی تازەی دروستکرد. ڕۆژە سەرەتاکانی ئەو ڕۆژژمێرە وەکو کامێرایەك تۆماری پچڕانی

مێژووی کات دەکات، لە بنەڕەتیشدا، هەمان ئەو ڕۆژەیە کە لەژێر پەردەی ڕۆژی بۆنەدا بۆ یادکردنەوە ڕوودەداتەوە. بەمجۆرە، مێژوو وەکو سەعاتەکان کات ناپێون، بەڵکو پەیکەری هەستێکی مێژوویین کە لەم سەد ساڵەی دواییەدا لە ئەورووپا هیچ شوێنکارێکیان بەجێ نەهێشتووە. لە شۆڕشی تەممووزدا ڕووداوێک ڕوویدا ئەوەی دەرخست کە ئەم هەستە هێشتا زیندووە. لە ئێوارەی یەکەم ڕۆژی شەڕدا هەموو سەعاتەکانی برجەکان پێکەوە کەوتنە ئیش و کاتێکیان تۆمار دەکرد کە سەربەخۆ بوو لەکاتی زۆر شوێنی دیکە، شایەتێک، کە ئەمەی بەچاوی خۆی بینیبوو، ئەم بینینەی خستە هەڵبەستێکەوە، بەم شێوەیە:

(کێ باوەڕی دەکرد! پێمان دەڵێن کە جۆشوایەکی تازە

لەبەر پێی هەموو بورجێکدا، وەک ئەوەی کات خۆی

وروژاندبێتی، سەعاتەکانی خستەگەڕ بۆ وەستانی ڕۆژ.

## XVI

لایەنگرانی مەتریالیزمی مێژوویی ناتوانن واز لەو بیرە بهێنن کە (ئێستا) ماوەی گوێزرانەوەی نیە، بەڵکو ئەو دەمەیە کە کات ئارام دەگرێت و دەبێت بوەستێت چونکە ئەمە ئەم بیرە ئەو ئێستایە دەناسێنێت کە ئەو خۆی تیایدا مێژوو دەنووسێتەوە. لایەنگری مێژووگەرای وێنەیەکی "هەمیشەیی" بەرابوردوو دەدات؛ مەتریالیزمی مێژووی ئەزموونێکی بێ هاوتا بەرابوردوو دەبەخشێت. لایەنگری مەتریالیزمی مێژووی ناهێڵێت قەحپەی "هەبوو، نەبوو.." کە لە قەحپەخانەی مێژووگەراییدا بیچەوسێنێتەوە.

## XVII

مێژووگەرایی بەراستی دەگاتە پۆپەی لە مێژووی جیهانیدا. نووسینەوەی مێژوو بە ڕێبازی مەتریالیزمی لە میتۆدا جیاوازیی هەیە زیاتر لە هەموو شتێکی دیکە، مێژووی جیهانی (ئارمێچەرێکی) تیۆریی نیە. میتۆدی خستنە سەر بەکار دەهێنێت و بارستێک داتا (*data*) کۆ دەکاتەوە بۆ پڕکردنەوەی ئەو کاتە چوونیەکە بەتاڵە. مێژوونووسی مەتریالی، لەلایەکی دیکەوە لەسەر بنەمایەکی بنیاتنەر دامەزراوە. بیرکردنەوە بە واتای تێپەڕبوونی بیرەکان نیە، بەڵکو گرتنیانیشە. کاتێک بیرکردنەوە لەسەر دیمەنێکی پڕ لە گرژی دەوەستێت خورپەیەک بەو دیمەنە دەدات کە بەهۆیەوە دیمەنەکە لە مۆنادێک (*monad*) (گەوهەری تاک) دەبلوورێت. لایەنگری مەتریالیزمی مێژوویی تەنها کاتێک نزیکی بابەتێکی مێژووی دەبێتەوە کە وەک مۆنادێک ڕووبەڕووی ببێتەوە. لەم بونیادەدا نیشانەی وەستانی ڕووداوەکانی بۆ دەردەکەوێت وەک ئەوەی زمانی مەسیحی ڕزگارکەر، یان، ئەگەر بەشێوەیەکی دیکە باسی بکەین، هەلێکی شۆڕشگێڕانەی بۆ هەڵدەکەوێت لە خەباتیدا لە پێناوی ڕابوردووی سەرکوتکراو. زانیارییەکی بۆ ڕووندەبێتەوە بۆ تەقاندنەوەی سەردەمێك لە ڕەوتی چوونیەکی مێژوودا– بۆ تەقاندنەوەی ژیانێکی تایبەت لەو سەردەمەدا، یان تەقاندنەوەی نیشێکی تایبەت لە کاری هەمیشەیی ژیاندا (*lIfewotrk*). لە ئەنجامی ئەم میتۆدەدا کاری هەمیشەیی ژیان دەپارێزرێت و لە هەمان کاتیشدا لەناو دەبرێت. لەکاری هەمیشەییدا سەردەمەکەو، لە سەردەمەکەشدا هەمەوو ڕەوتی مێژوو. ئەم میوە خۆراکدەرەی کە لە ئەنجامی تێگەیشتنی مێژووەوە بەرهەمهاتووە، کاتی تێدایە وەک تۆوێکی بەنرخ، بەڵام بێتام.

## *XVIII*

"له پەیوەندیدا بە مێژووی ژیانی ئۆرگانیکی لەسەر زەوی،" نووسەرێکی هاوچەرخی بایۆلۆجی دەنووسێت، "ئەو پەنجا هەزارە بێبایەخەی ژیانی مرۆڤ وەکو دوو چرکە وایە لە کۆتایی رۆژێکی بیست و چوار سەعاتیدا." بەپێی ئەم پێوانەیە، مێژووی شارستانیەتی مرۆڤ یەك لەسەر پێنجی دوا چرکەی دوا سەعات پێکدەهێنێت. (ئێستا که مۆدێلی زەمانی عیسای رزگارکەرە، تێکڕای مێژووی مرۆڤایەتی پێك دەهێنێت لە کورتکردنەوەیەکی مەزندا کە بە تەواوەتی لەگەڵ ئەو گرنگییەی کە مێژووی مرۆڤایەتی هەیەتی دەگونجێت.

## *A*

مێژووگەرایی خۆی بەدامەزراندنی پەیوەندییەکی هۆیی (سببی) لە نێوان دەمە جیاوازەکانی مێژوو قایلدەکات. بەڵام هیچ راستییەك کە هۆیە لەبەر هەمان هۆ مێژوویی نیە، بەڵام پاشوەختە بۆتە مێژوویی؛ هەرچەند رووداوەکان لەوانەیە هەزارساڵیان بەسەردا تێپەڕ بوبێت. ئەو مێژوونووسەی ئەمە دەکاتە خاڵی جیابوونەوە، وازی لە زنجیرەی رووداوەکان، کە وەك دەنکی تەزبیحی، هێناوە. لەبری ئەوە، ئەو برجە (*constellation*) دەگرێت کە سەردەمەکەی خۆی پێکهێناوە، لەگەڵ برجێکی دیاریکراوی پێشتردا. بەمجۆرە.

چەمکێك دەربارەی ئێستا دادەمەزرێنێت وەك "کاتی ئێستا" کە تەلەزمی کاتی مەسیحی رزگارکەری لێدەدرێت.

## *B*

ئەو پێشبینیکەرانەی کە هەر لەکات خۆیەوە بۆیان دەرکەوت کە کات چیی بۆ هەڵگرتوون بێگومان کاتیان تاقی نەکردۆتەوە، نەوەك شتێکی چوونیەك (متجانس) و نەوەك شتێکی بەتاڵ. هەر کەسێك ئەمەی لە مێشکدا بێت بیرۆکەی ئەوەی لا دروستدەبێت چۆن کاتی رابوردوو لە یادەوەرییەکاندا، بەهەمان شێوە تاقیکرانەوە. ئێمە دەزانین کە جوولەکەکان هەموو جۆرە لێکۆڵینەوەیەکیان لە بارەی داهاتووەوە لێ قەدەغە کرابوو. لەگەڵ ئەوەشدا تەورات و نوێژەکان لە یادکردنەوەدا رێنماییان دەکردن. ئەمەش ئەو سیحرەی لە داهاتوو داماڵی کە فریوی هەموو ئەوانە دەدات کە دەچن بۆ لای پێشبینیکەران بۆ رۆشنبینی. ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە داهاتوو لای جوولەکەکان ببووە زەمەنێکی چوونیەکی بەتاڵ، چونکە هەر چرکەیەکی زەمەن دەروازەیەك بوو کە لەوانە بوو مەسیحی رزگارکەر لێیەوە بێتە ژوورێ.

### سەرچاوە


Critcal theory

Hertfordshire, U.K. 11995


### پەراوێزەکان:

1-کۆنگرەی گۆتا **Gotha**، لە ساڵی **1875** هەردوو باڵی پارتی سوشیالیستی جەرمانی یەکخست، کە یەکێکیان فێردینان لاسال سەرکردایەتی دەکرد و ئەوی دیکەیان کارل مارکس و کارل لێبنێخت. پرۆگرامەکە لاسال و لێبنێخت دایانڕشتبوو بە توندی لەلایەن مارکسەوە رەخنەی لێ گیرا.

2-گرووپی چەپەکان، کە کارل لێبنێخت، و رۆزا لۆکسەمبرگ لە سەرەتای شەڕی جیهانی یەکەمدا دایانمەزراند بۆ لایەنگرانی شەڕ لەناو پارتی سۆشالیستی جەرمانیدا. پاشان ئەم باڵە لە پارتی کۆمۆنیستدا توایەوە.

3-بنیامین وشەی **detztzeit**، بەکاردەهێنێت و دەیخاتە ناو کەوانەوە، بەم جۆرە دووری دەخاتەوە لە وشەی **Gegenwart**، کە (ئێستا)یە، لەوانەیە وشەی **nurc stans**ی سۆفیگەریی لە مێشکدا بێت.

# وێستگە سەرەکییەکانی فیکری

# "ریمۆن ئارۆن"

• هاشم سالح

• و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

ریمۆن ئارۆن بەدرێژایی ژیانی پێکەوە لەیەک کاتدا وەکو رۆژنامەنووسێک و مامۆستایەکی زانکۆ مومارەسەی رۆشنبیری کردووە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە ساڵی *1955*دا نەبێت نەگەڕاوەتەوە بۆ زانکۆ، واتە پاش ئەوەی تەمەنی بۆتە پەنجا ساڵ. لەبەرئەوەی پاش جەنگی دووەمی جیهانی ئەو پۆستەی رەتکردەوە کە لە زانکۆی بۆردۆوە خرابووە بەردەستی و، پێی باش بوو وەکو رۆژنامەنووسێکی لێهاتوو لە رۆژنامەی "لیفیگارۆ"دا کاربکات.

ئارۆن رۆژنامەنووسێکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو سەروتارە سیاسییەکانی بۆ ئەو رۆژنامە فەرەنسییە دێرینە دەنووسی. ئەمەش مانای ئەوەیە کە کاریگەرییەکی دیاریکراوی لەسەر سیاسەتی فەرەنسی هەبووە، لەسەر ئاستی ناوخۆ یاخود لەسەر ئاستی دەرەوە.

سەرەڕای پیشەی رۆژنامەنووسی ریمۆن ئارۆن درێژەی بە توێژینەوەکانیشیدا لە بواری سۆسیۆلۆژیاو سیاسەت و فەلسەفەو ئاقارە ئایدیۆلۆژیە هاوچەرخەکاندا، بەتایبەتیش کێشەو ململانێی نێوان لیبرالیزم و کۆمۆنیزم.

پێویستە ئەوەش بزانین کە ریمۆن ئارۆن یەکەمین کتێبی گەورەی خۆی بەر لە جەنگی دووەمی جیهانی نووسیبوە. ئەم کتێبەش بەرەنجامی خوێندنیەتی لە ئەڵمانیا، لە بواری سۆسیۆلۆژیاو زانستی مێژوودا. پاشان لە ساڵی *1938*دا ئەم کتێبەی وەکو کارنامەیەک پێشکەش

کرد بۆ بەدەست هێنانی بڕوانامەی دکتۆرای دەوڵەت. لێکۆڵەرەوەکان پێیان وایە کە سەرجەم کتێبەکانی دیکەی لەم کتێبەوە سەرچاوەیان گرتووە. ناونیشانی کارنامەکەشی بەم جۆرەیە: "سەرەتایەك بۆ فەلسەفەی مێژوو". هەندێك لە رووی گرنگیەوە ئەم کارەی ئارۆن بەکارنامەکەی جان هیبۆلیت بەراورد دەکەن سەبارەت بە هیگڵ: "سەرەتایەك بۆ فەلسەفەی مێژوو لای هیگڵ"، یاخود بەکارنامەکەی میشیل فۆکۆ: "مێژووی شێتی لە سەردەمی کلاسیکی"دا بەراوردی دەکەن. بەڵام لێرەشدا تارمایی سارتەر ئامادەیە.

کاتێك رێبەری بوونخوازی فەرەنسی کتێبە بەناوبانگەکەی "بوون و نەبوون"ی بڵاو کردەوە، دانەیەکی لێ نارد بۆ "هاوڕێ بچکۆلەکەی"، سارتەر پێی خۆش بوو ئەم ناوە لە ئارۆن بنێت. کە کتێبەکەی پێشکەش کرد ئەوەی بۆ لەسەر نووسی بوو: "بۆ هاوڕێی بچکۆلەم ریمۆن ئارۆن، ئەم کتێبەم دەکەمە دیاری تا دەسگیرۆی بکەم بۆ ئەوەی ئەو پێشەکیە ئەنتۆلۆژیەی فەلسەفەی مێژوو لە دژی مۆدی بوونخوازی بنووسێت. لەگەڵ ئەوپەڕی دۆستایەتیم.. ژان پۆل سارتەر".

ئەمە لە سەرەتای سەردەمی گەنجێتی‌دا بوو، کاتێك تەمەن هەڵنەکشابوو هاوڕێیەتیش خونچەبوو. ئەمێستا ئێمە هێشتا زۆر دووریـن لەو شەڕو شۆڕە توندانەی لە پاش جەنگی دووەمی جیهانیەوە لە نێوان ئەم دووانەدا بەرپا دەبێت. ئەو پەیوەندییە گەرم و گوڕە هی سەردەمانێکە کە هەردووکیان وەك دوو خوێندکار هاوپۆلن و لەیەکتریەوە نزیکن. ئەوکات زۆر مەسەلەی هاوبەش لە نێوانیان دا هەبوو، وەك گرنگی دان بە خودناسی و ئەودی ناسی، یاخود بابەتی مەرجی مێژوویی مرۆڤ و، مەسەلەی ئازادی. پێدەچێت بیرۆکەی کارنامەکەی سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو بە شێوەیەکی وجودیانە بە مێشکیدا هاتبێت، وەکی ئەوەی خۆی لە بیرەوەریەکانیدا دەیگێڕێتەوە: "رۆژێکیان لە کەنار رووباری راین پیاسەم دەکرد، دەست بەجێ بڕیارم دا باسێك دەربارەی فەلسەفەی مێژوو بنووسم". ئەم بڕیارە شەخسیەی کەم تا زۆر لەو پرانسیپە وجودیە دەچێت کە ژان پۆل سارتەر بڕیاری لێ دابوو: (مرۆڤ بریتیە لەوەی کە پێی هەڵدەستێت) نەك شتێکی دیکە.

بەڵام باسەکەی ئارۆن سەرەڕای بایەخ و گرنگیەتی و ئەو دۆزینەوە تازانەی لە خۆیی گرتبوو، وەکی پێویست ئەو دەنگدانەوەیەی نەبوو لە فەرەنسای دوای جەنگدا. رەنگە هۆکاری ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە باسەکەی سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو بە تەواوەتی پشتی بە تێزی بیرمەندە ئەڵمانەکان بەستبوو، بەتایبەت ماکس ڤیبەر. وەك دەزانرێت ئەوکات زانکۆی فەرەنسی (واتە سۆربۆن) جگە لە کانت تەواوی فەلسەفەی ئەڵمانی فەرامۆش کردبوو. ئەمانوێل کانت و ئۆگست کۆنت، یان رونتر بڵێین نیو-کانتییزم و فەلسەفەی پۆزەتڤستی بە تەواوەتی سۆربۆنیان کۆنترۆڵ کردبوو. هەرچی هێگڵ و نیتشەیە ئەوا کەس هیچی لە بارەوە نەدەزانین، جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت لە کەسانی رۆشنبیر. هەروەها ئەدمۆند هۆسرەل و مارتن هایدگەریش، واتە فەیلەسوفانی



سارتەر

فینۆمینۆلۆژیــــاو ئیگستانسـیالیزم كـــەس نەیدەناسـین. لـێرەوە مامۆسـتایانی سـۆربۆن نەیانتوانی لە مانـای قوڵی ئـەم باسـە گرنگـە تـێ بگـەن. بـەڵام هـەرچۆنێك بێت كارەكـەی ئـارۆن بەشێوەیەكی راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ كاری كردە سەر زۆر لە مێژوونووسە فەرەنسیەكان و توانی لە ئامێزی فەلسـەفەی پۆزەتفست، فەلسەفەیەك كە گەیشـتبووە قۆنـاغی پـیربوون و كۆنـترۆڵی تەواوی نارەندی زانكۆی كردبوو دەریان بهێنێت.

لـە پـاش جـەنگی دووەمـی جیهانیـەوە ئـارۆن بەشێوەیەكی روون و ئاشكرا دایـە پـاڵ بلۆكـی خۆرئـاواو كەوتـە داكۆكـی كـردن لـە لیـبرالیزمی خۆرئاوایی. كارێك كە بـووە مایـەی ئـەوەی لانـی كـەم زۆریـەی توێـژی ئەنتلجنسـیای فەرەنسـی ئافەرۆزەی بكەن و پەیوەندی لەگەڵدا بپڕن.

ئیتر ئەوكات دەستی دایە بڵاوكردنـەوەی یـەك لـە دوایـەكی كتێبـە سـەرەكیەكانی و، لەگـەڵ دەرچوونـــی هـــەر كتێبێكـــی دا هەڵڵایـــەكی ئـایدیۆلۆژی گـەورەی دەنایـەوە. ئـەم كتێبانـەش بوونـە مایـەی دروستبوونی چـەند وێسـتگەیەكی سـەرەكی لـــەو ململانـــێ و كێشمەكێشـــە ئایدیۆلۆژیەی بەدرێژایی سەدەی بیست بـەردەوام بوو.

لـێرەدا ئێسـتێك لەبـەردەم گرنگـترین ئـەو كتێبانـەیدا دەكـەین و، سـەرەتاش بـە كتێبـە بەناوبانگەكەی دەست پێ دەكەین كە لەژێر نـاوی "ئـەفیونی رۆشـنبیران"دایەو لـە سـاڵی ***1955***دا بڵاوی كردەوە. واتە لە گەرمەی شەڕی ساردا، بـۆ بەرپەرچدانـەوەی بلۆكـی رۆژهـەڵات (كۆمۆنـیزم). "ئـەفیونی رۆشـنبیران" درێـژە پێـدەری هـەمان كتێبـی پێشـوویەتی "سـەرەتایەك دەربـارەی فەلسـەفەی مێـژوو"، سـەرەڕای ئـەوەی خەسڵەتێكی ئایدیۆلۆژیشی هەیە. ئـەم كتێبـەی لەیـەك كاتدا كتێبێكی فەلسـەفی و ئـایدیۆلۆژی شۆڕشگێڕانەیەو، تیایدا ئایدیۆلۆژیـای ستالینیەت

لـە نـاوەوەڕا لەبەریـەك هەڵدەوەشـێنێت و، لـەو ئەفسانانە دایدەماڵێت كـە زۆریـەی رۆشنبیران و بیركردنەوەیانی داگیركردبوو.

سـەبارەت بـەم بەرهەمـەی ریمـۆن ئـارۆن "فرانسوا فۆریـە" یـەكێك لـە مەزنـە مێژوونووسـە فەرەنسیە هاوچەرخەكان دەڵێت: "ئەم كتێبـە تـا ئێستاو تەنانـەت دوای سی ساڵ لـە دەرچوونـی هەر زیندووەو، ئەوە دەسەلمێنێت كە سـتالینیەت جگـە لـە درۆیـەكی گـەورە چیـتر نیـەو، دەبێتـە مایەی لەكارخستنی عەقڵی مرۆڤ، سەرەڕای ئـەو رووە زانسـتیە رووكەشـەی دەیـەوێت بـەخۆیی بدات".

ئـارۆن ئـەو تـێزە ستالینیە بـەدرۆ دەخاتـەوە بـەوەی هێڵێكـی حـەتمی دیـاریكراو هـەبێت بـۆ جوڵەو بزاوتـی مێـژوو. ئـەو پێـی وایـە ئەمـە هیـچ پەیوەندیەكی بە زانستەوە نیە، بـەڵكو بریتیـە لـە ئایدیۆلۆژیـاو دەبێتـە مایـەی ئـەوەی ئـازادی لـە مێژوودا بسڕێتەوە: بە واتای ئازادی تاكەكەس و كـردەی مرۆڤانـە. پاشـان ئـارۆن لـە كۆتـایی كتێبەكـەیدا باس لە سێ جۆر لـە رۆشـنبیران دەكـات: رۆشـنبیری ئینگلـیزی و رۆشـنبیری ئەمریكی و رۆشنبیری فەرەنسی و، لەم بارەیـەوە دەڵێت: "بەهرەو لێهاتوویی روناكبیرانی ئینگلیز لەوەدایە زۆرجـار بـە چـەمك و زاراوەی تـەكنیكی سـاردو سـڕ كێشـەو ململانـێ ئایدیۆلۆژیـەكان پـەردەپۆش بكـەن. لێـهاتوویی رۆشـنبیرانی ئـەمریكایش لـە گۆڕینـی مشتومڕە پراگماتیـەكان دایە بـۆ شـەڕو شۆڕی ئـەخلاقی. هـەرچی تواناو لێهاتوویی رۆشـنبیرانی فەرەنسیە ئـەوا لەوەدایـە كـە كێشـمەكێش و ململانـێ ناسـیۆنالیزمیەكان بگۆڕن بە كێشەو ململانێیـەكی یۆنێڤرسـاڵی كـە تـەواری مرۆڤایەتی بگرێتـەوە. ئـەوان ئـەم كـارە بەوپەڕی لـە خۆبـایی بـوون و لـوت بەرزیـەوە ئەنجام دەدەن".

له بەرامبەر ئەم کتێبەی ئارۆن دا کاردانەوەکان ئێجگار توند بوون و، ڕۆژنامەوانی فەرەنسیش بووە دوویەش:

بەشێك پاڵپشت و بەشێك ئۆپۆزسیۆن، بەشێك تەواو لەگەڵی بوون و، بەشێکیش تەواو لە دژی. تەنها گۆڤاری "ئێکسپرێس" هەڵوێستێکی بێ لایەنانەی وەرگرت. هەرچی ڕۆژنامەی ڕاست ڕەوەکانە پشتیوانیان لێکرد، بەڵام ڕۆژنامەی چەپەکان زۆر بەتوندی کەوتنە سەرکۆنەکردنی. "مۆریس دوڤێرجێ" مامۆستای بەشی زانستە سیاسیەکان ڕەخنەیەکی توندی ئاراستە کرد: "پرۆلیتاریا وەك ڕیمۆن ئارۆن پێی وایە تەنها ئەفسانە نیە، ململانێی چینایەتیش ئەفسانە نیە بەڵکو حەقیقەتێکی بەرچاوە. ئازادیەکانیش لە لایەن سەرمایەوە لەبەردەم هەڕەشەو مەترسی دان، زیاد لەوەی لەلایەن دەوڵەتەوە بێت. واتە مەسەلەکە بە پێچەوانەی ئەوەوەیە کە ڕیمۆن ئارۆن باسی دەکات. ئەوەندەش بەس نیە کە بەردەوام سەرکۆنەی ئۆردوگا زۆرەملێکانی سۆڤیەت بکەین. بەڵکو دەبێت ئیدانەی ئەو جیاوازیە کۆمەڵایەتیە بێ سنوورەو هەیمەنەتی سەرمایەداری بکەین".

دواتر ڕەخنەی زۆر شەخسی تر ئاراستەی ڕیمۆن ئارۆن دەکات و بە "خاین"ی ناوزەد دەکات، لەبەرئەوەی لە بەرەی چەپەوە گواستویەتیەوە بەرەی ڕاست. "دو ڤێرجێ" لە درێژەی ڕەخنەکانیدا دەڵێت: "گەورەترین شتێك کە ئارۆن سەرزەنشتی ڕۆشنبیرانی چەپی پێ بکات ئەوەیە کە ئەو چیدی لە ڕیزی ئەوان دا نەماوەو یەکێك نیە لەوان! هەڵوێستی ڕەخنەیشی لەمەڕ هەندێك مەسەلەی وردەکاری ناو سستمی سەرمایەداری تەنها بۆ خۆڵکردنە ناو چاوی خەڵکیە. ئەو سستمە خۆی ڕێی ئەوەی پێ



کانت

دەدات ئەوە بکات، بۆ ئەوەی ئابڕووی نەچێت و ڕاستیەکان بشارێتەوە. بەڵام حەقیقەتی لای هەمووان ئاشکرایە..".

دوابەدوای ئەم کتێبە ئارۆن سێ کتێبی دیکەی دەرکرد، کە بریتی بوو لەمانە: "هەژدە وانە دەربارەی کۆمەڵگەی پیشەسازی" ***1962***، "ململانێی چینەکان" ***1964***، دیموکراسیەت و تۆتالیتاریەت" ***1965***. لە تەواوی ئەم نووسینانەدا ئارۆن ئەوە دەسەلمێنێ کە شۆڕشی بەلشەفی نەبووە مایەی هێنانە ئارای کۆمەڵگایەك خاڵی لە چینەکان، وەکی ئەوەی دروشمە ئایدیۆلۆژیەکان باسی دەکەن، بەڵکو بەوە گەیشت کە چینێکی نوێ بگاتە کورسی دەسەڵات و بۆ خۆیی پاوان بکات. لێرەوە ئارۆن پێی وایە ئیستبدادی تاك حیزبی زیاد لە هەر سەرمایەداریەکی دی جێی هەڕەشەو مەترسیە. پاشان ئارۆن چەمکی "کۆمەڵگەی پیشەسازی" دینێتە ئارا، دوای ئەوەی سوود لە

شیکردنەوەکانی سان سیمۆن و ئۆگست کۆنت وەردەگرێت.

وەك دەزانرێت هەریەك لەم دوو بیریارە جۆرە جیاکاریەکیان لە نێوان سەردەمی کۆن (سەردەمێك کە پشتی بە رژێمی سەربازی و چینی ئۆرۆستۆکراتی بەستبوو) و، سستمی کۆماری نوێ (کە لەسەر زانست و تەکنیك و تەشەنەسەندنی ئابووری دامەزرابوو) کردبوو. ئارۆن بەم جۆرە دەست نیشانی کۆمەڵگەی پیشەسازی دەکات: "وەکی پێناسەکردن کۆمەلگەی پیشەسازی بریتیە لەو کۆمەڵگایەی کۆمپانیا زەبەلاحەکان باڵادەستن بەسەری داو، جڵەوی دابەشکردنی کار تێیدا بەدەستی ئەوانە. ئەمەش پێویستی بە بڕێکی دیاریکراو لە کەڵەکەبوونی سەرمایەو جیاکردنەوەی شوێنی نیشتەجێ بوون لە شوێنی کارکردن هەیە. هاوکات بڵاوبوونەوەی کۆمپانیاو کارگەکان لە کۆمەڵگەدا بە پێویست دەبێتە مایەی ئەوەی کرێکاران لە شوێنێکی دیاری کراودا گردبینەوە. ئەوکات نائارامی و شلۆقیەك لە نێوان کرێکاران و خاوەن کارەکان دا دروست دەبێت. لەم سەروبەندەدا کرێکاران ناچار دەبن سەندیکای تایبەت بە خۆیان پێکبهێنن، لە پێناو داکۆکی کردن لە مافەکانیان و دانوستانکردن لەگەڵ خاوەن کارەکان دا لەکاتی پێویست دا. ئەمەش ئەو شێوازەیە کە لە تەواوی کۆمەڵگە پیشەسازیە ئەوروپیەکان یاخود ئەمەریکیدا باوە".

لەگەڵ ئەمەدا ئارۆن جیاوازی لە نێوان کۆمەڵگەی پیشەسازی سۆڤیەتی و کۆمەڵگەی پیشەسازی خۆرئاوایی دا دەکات و دەڵێت: "ئامرازەکانی بەرهەم هێنان لە یەکەمیاندا لەلایەن دەوڵەتەوە قۆرغکراوە، لە خۆرئاوا مولکیەتی تایبەتە". پاشان دەڵێت: "سستمی پلانی پێنج ساڵی باڵادەستە بەسەر کۆمەڵگەی سۆڤیەتیدا، ئەمە لە کاتێکدا ئابووری بازاڕی ئازاد بەسەر کۆمەڵگەی ئەوروپی یاخود ئەمریکیدا باڵادەستە". دواجار دەگاتە ئەوەی بڵێت: "جیاوازی کۆمەڵایەتی لە سستمی سەرمایەداریدا گرفتێك نیە چارەسەرکردنی مەحاڵ بێت، ئەمە لە کاتێکدا دابڕان و گۆشەگیربوونی ئابووری سۆڤیەتی لە ئابووری دیکەی نێودەوڵەتی و ئاراستەکردنی نەخشەو پلانە ئابووریەکان بە شێوەیەکی توندوتۆڵ، وا دەکات لەسەر ئاستی ئابووری پاترۆنێکی سەرنەکەوتوو بێت و، لەسەر ئاستی سیاسیش دیکتاتۆری بێت. کەواتە سستمی سەرمایەداری خۆرئاوا باشترە، سەرەڕای هەموو ناتەواوی و کەموکوڕیەکانی. لەبەرئەوەی سستمێکی وا ئەگەری چاك بوون و ریفۆرمی لەسەرخۆی هەیە، لە ڕێگای خەباتی سەندیکایی و گفتوگۆو دانوستانی بەردەوام لەگەڵ خاوەن کارەکان دا. ئەوە لە کاتێکدا سستمی کۆمۆنیزم ئەگەری گۆڕان و بەرەو پێشچوونی نیە، چونکە خەسڵەتێکی ئایدیۆلۆژی و دیسپۆتیزمی هەیە. سستمێکی وا ڕێگە بە دیالۆگ نادات، لەبەرئەوەی پێی وایە کە خۆی خاوەنی حەقیقەتی رەهایە. لێرەوە پێ ناچێت سستمێکی وا هیچ داهاتوویەکی هەبێت". مێژووش راستی ئەم پێشبینی کردنەی ریمۆن ئارۆنی سەلماند.

هەرچی کتێبی "دیموکراسیەت و تۆتالیتاریەت"ە، ئەوا جەخت لەسەر بیرۆکەی سستمی دەستوری–پلورالسیزمی دەکاتەوە، سستمێك کە لە ڕێگای ڕێزگرتنی یاساوە دیاری کراوەو ڕێگاچارەی شێلگیرانەش قبوڵ دەکات هەر کاتێك پێویستی بەوە کرد. بەڵام پێی وا نەبوو پلورالیزمی سیاسی بەتەنها خۆی ئامانجێك بێت، بەڵکو ئامرازێکە بۆ پارێزگاری کردن لە ئازادی مرۆڤ و، هاوکات بۆ باشترکردنی ئاستی بژێوی زۆرترین ژمارەی خەڵك. لەم رووەوە دەڵێت: "پێ دەچێت باشترین فۆرمێك بۆ

حوکمڕانی لە جیهانی خۆرئاوادا پلورالیزمی سیاسی و حیزبی بێت. ئەمە دەڵێم سەرەڕای ئەوەی زۆر حەزم بە کێشەو ململانێی حیزبەکان نیە. بەڵام تەنها ئەم فۆرمە دەتوانێت پارێزگاری لەو پلورالیزمە روحی و فیکری و ئایدۆلۆژیە بکات". ئەگەرچی وەها فۆرمێك ئازادی و حورمەت و خۆشنودیەکی ئابووری بۆ خۆرئاوا دەستەبەر دەکات، بەڵام یەك لەسەر سێی مرۆڤایەتی فەرامۆش دەکات و لەسەر لاڕێکان دا جێیان دێڵێت و ئاوڕیان لێ ناداتەوە. ئارۆن پێی وایە خۆشخوانی خۆرئاواو هەژاری جیهانی سێیەم یاخود چوارەم لە ئایندەدا دەبێتە مایەی دروست بوونی چەندین کێشەو ململانێ، لەبەرئەوەی ناکرێت جیهان هەتاهەتایە لەسەر ئەم شێوەیە بەردەوام بێت. بۆیە پێویستە لەسەر خۆرئاوای بەهێزو پێشکەوتوو و سەرکەوتوو، کەمتر خۆپەرست بێت و زۆرتر دەستی هاریکاری درێژ بکات لەوەی لەمڕۆدا هەیە. لەم بارەیەوە ساڵی *1957* ئارۆن لە شاری لەندەندا لێکچەرێکی داو، دەنگدانەوەیەکی گەورەی لە سەرجەم نێوەندە رۆشنبیری و سیاسیەکاندا هەبوو. لێکچەرەکەشی بەناونیشانی: "جەنگ و کۆمەلگەی پیشەسازی" بوو. تێیدا هاتبوو: "دوای ئەوەی دەست بە پشکنینی ئەو تێزەی ئۆگست کۆنت دەکەین، کە تیایدا دەڵێت خۆرئاوای نوێ لە رژێمێکی سەربازی کۆنەوە -کە لەسەر هێرش و پەلامارو شەڕ دامەزرابوو- گواستویەتیەوە بۆ سستمێکی پیشەسازی تازە -کە مەبەستی گەیشتنە بە پێشکەوتن و خۆشنوودی ئابووری و ئاشتی- دەتوانین پێ لەسەر ئەمە دابگرین:

ناکرێت ئاشتی لە نێوان وڵاتانی جیهان لە سایەی سستمی پیشەسازی تازەدا بەرقەرار بێت، گەر ئەم سێ مەرجەی لای خوارەوە لە ئارادا نەبێت.

یەکەم/ کەمکردنەوەی ئەو کەلێنەی لەنێوان گەشەکردن و بەرەو پێشچوونی ئابووری وڵاتە پێشکەوتووەکان و، ئابووری وڵاتانی جیهانی سێهەمدا هەیە.

دووەم/ ئیعترافی دوو لایەنە بەسەروەری هەموو دەوڵەتێك لە سایەی سستمی نێودەوڵەتیدا. ئەمە بەو مانایەی: پێویستە وڵاتانی جیهان رێگر بن لەوەی هەر دەوڵەتێك پەلاماری دەوڵەتێکی بێ هێزتر لەخۆی بدات، بەهۆی هێزی چەکدارو زوڵم و ستەمێکی کوێرانەوە.

سێیەم/ کۆتایی هێنان بەو ململانێی ئایدیۆلۆژیەی نێوان هەردوو بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا".

وا دیارە دوو مەرجی دوایی بەرادەیەکی زۆر لە سێ ساڵی رابردوودا جیبەجێ بوبێت، بەتایبەت پاش هەرەسی بلۆکی رۆژهەڵات و کۆتایی جەنگی دووەمی کەنداو و سەرەتای دروست بوونی سستمی نوێی جیهانی. هەرچی مەرجی یەکەمیشە کە پەیوەندی بە نەهێشتن و کەمکردنەوەی ئەو جیاوازیە کۆمەڵایەتیەی نێوان خۆرئاوای دەوڵەمەندو وڵاتە هەژارەکانەوە هەیە، هەتا ئێستا جێبەجێ نەبووە. وەك ئاشکراو روونە تەشەنەسەندنی توندوتیژی و سەرهەڵدانی بزاوتە توندڕەوەکان و دەمارگیری ناسیۆنالسیزمی سربی بۆ نمونە لە یوگوسلاڤیادا، هەموو ئەمانە بەشێوەیەکی عەمەلی و بەرچاو بەڵگەن لەسەر راستی و دروستی تیۆرەکەی ریمۆن ئارۆن و، ئەوەش دەسەلمێنێت کە ئەو وەك لێکۆڵەرەوەیەکی سیاسی ستراتیژی لەسەر ئاستی جیهانی، چەند وردبین و دووربین بووە. لە پاڵ ئەو سێ کتێبەدا ئارۆن کتێبێکی بەناوبانگی دیکەی دەرکرد، کتێبێك کە تەواوی فەرەنسای هەژاند: ئەویش کتێبی "تراژیدیای جەزائیر" بوو (بڵاوکراوەکانی -بلۆن- *1957*).

ئارۆن لەم کتێبەیدا بە پێچەوانەی رای گشتی ئەوسای فەرەنسیەوە هەنگاوی نا، بگرە لە ناخەوە حەساسیەتی فەرەنسی توشی راچڵەکان دەکرد، کاتێك دەڵێت: دەست بەجێ و بەرلەوەی کارلەکار بترازێت دەست لە جەزائیر هەڵگرن و بکشێنەوە!..

ئارۆن بەو هەستە مێژووییە ئاست بەرزەی (ئەی کارنامەی دکتۆراکەی بۆ فەلسەفەی مێژوو تەرخان نەکردبوو) درکی بەوە کردبوو کە زوو بێت یان درەنگ جەزائیر سەربەخۆیی خۆی بەدەست دێنێت، هاوکات ئەمەش لەبەرژەوەندی فەرەنسادایە. ئەوەی زۆر ترسی لێی هەبوو ئەوەبوو فەرەنسا نەزانێت چۆن چۆنی خۆی لەو داوەی جەزائیر قوتار بکات و، بۆ هەتاهەتایە بکەوێتە ناو دەریایەك خوێنەوە. ئەمەشی بەهەرەشەو مەترسیەك دەزانی لەسەر ئایندەی فەرەنسا خۆی، چونکە تارمایی شەڕی ئەهلی خەریك بوو باڵی بەسەردا دەكێشا.

گەورە سیاسەتمەدارە فەرەنسیە منەوەرەکان لە سەرو هەمووشیانەوە ژەنەراڵ شارل دیگۆل، تەواو درکیان بەوە دەکرد. بەڵام لە ترسی رق و توورەیی رای گشتی جورئەتی ئەوەیان نەدەکرد باسی لێ بکەن.

وەك دەزانرێت سیاسی بە پێچەوانەی رۆشنبیرەوەیە، سیاسی دەربەستی شەعبیەتی خۆیەتی و سوورە لەسەر ئەوەی شەعبیەتی دانەبەزێت، بەڵام رۆشنبیر ناچاری ئەوە نیە. چونکە ئامانجی ئەو پارێزگاریکردنە لە حەقیقەت و راگەیاندنیەتی نەوەك شەعبیەت بێت. رۆشنبیر دەتوانێت رای گشتی راچڵەکێنێت، بەڵام سیاسی ناتوانێت لەبەرئەوەی دەست بەجێ بەلادا دێت و دەڕوخێت.

زۆرجار رۆشنبیر لە میانەی ئاشکراکردنی راستیەکان و ئامادەکردنی کەش و هەوای گشتیەوە بۆ وەرگرتنی ئەو بڕیارە قورسانەی کە رەنگە سەرکردایەتی سیاسی دەری بکات دەبێتە زەمینە خۆشکەرێك. گەر سەرکردایەتی سیاسی عاقڵ و رۆشنگەر بوو، رۆشنبیر خۆیشی هوشیارو منەوەر بوو، ئەوا سیاسەت و رۆشنبیری و هەروەها کۆمەڵگاش دەبەیتەوە. بەڵام گەر سەرکردایەتی سیاسی زۆردارو ستەمکار بوو، لە بەرامبەریش دا رۆشنبیرێکت هەبوو ریاکارو درۆزن بوو، باکی بە حەقیقەت نەبوو، ئەوا سیاسەت و فیکرو کۆمەڵگەو هەموو شتێکت لە دەست دەچێت. خۆشبەختانە ئەوکات فەرەنسا پیاوێکی داناو بەئەزموون سەرکردایەتی دەکرد، ئەویش ژەنەراڵ شارل دیگۆل بوو. هاوکات خاوەنی چەندین رۆشنبیری هوشیار و بەرپرس بوو وەك ریمۆن ئارۆن (بەڵام نەك هەر ئەم بەتەنها). بەم جۆرە فەرەنسا توانی خۆی لە گەورەترین کارەسات لە مێژووی نوێیدا قوتار بکات. بەڵام ئەم کارە هەروا بە ئاسانی تێ نەپەڕی، یاخود بەبێ پشێوی و دادپان و ئێش و ئازار نەگەیشتە ئەنجام.

دوای ئەوەی ئارۆن ئەم کتێبەی بڵاوکردەوە، هێندەی نەمابوو رۆژنامەی "لیفیگارۆ" لە دەستەی نووسەرانی دەری بکات. پاشان بەوەندەوە وەستا کە رێی پێ نەدا هیچ شتێك دەربارەی کێشەی جەزائیری بنووسێت. هەر بۆیە ئەو بابەتەیان دایە دەست رۆژنامەنووسێکی دیکە، سەربەو باڵەی بڕوای وا هەبوو جەزائیر بەشێکە لە فەرەنساو لێی جیانابێتەوە. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەش لەوکاتەدا بەسەر رای گشتی فەرەنسیدا زاڵ بوو.

بەڵام ئەو وتارو ریپۆرتاژە ئینفعالیانەی "تێری مۆلینیێ"ی رۆژنامەنوس نووسینی لەبیرچوونەوەو کتێبەکەی ریمۆن ئارۆن وەك خۆی مایەوە، لەبەرئەوەی گوزارشتی لە حەقیقەتێکی مێژووی دەکرد: واتا سەربەخۆیی جەزائیر. بەرلەمەش ئارۆن هەڵوێستێکی روون و

ئاشكرای هەبوو كە لە بەرژەوەندی سەربەخۆیی تونس و مەغریب دا بوو، لەم رووەوە پاڵپشتی سیاسەتەكانی هەریەك لە مەندیس فرانس و ئەدگارفۆری دەكرد.

ئارۆن پێی وابوو رەوتی مێژوو رووەو سەربەخۆبوونی گەلانی كۆلۆنیالی كراو دەچێت و، ناكرێت رێ بەم بەریانە بیگرێت و دژایەتی بكرێت. ئەمەو سەرباری ئەوەی كۆلۆنیالیزم خۆی پێچەوانەی ئەو بەها فكریە باڵایانەیە كە خۆرئاوا ماوەی دوو سەد ساڵێكە، واتە لە سەردەمی رۆشنگەریەوە هەڵگریەتی. ئەم بەهایانەش تەئكید لە پێشكەوتن و ئازادیو دادپەروەری دەكەنەوە بۆ تەواوی مرۆڤایەتیو سەرجەمی گەلانی دنیا. بەم پێیە ناكرێت میللەتێك دەست بەسەر میللەتێكی دیكەدا بگرێ و ئیرادەو كەسایەتی زەوت بكات و سەروەری پێشێل بكات. ئەمە بە تەواوەتی ناكۆكە لەگەڵ ئەو پرانسیپانەی ئیمانوێل كانتی فەیلەسوف لە كتێبەكەی دا دەربارەی (دەستوری گەردونی و بەرقەراركردنی ئاشتی هەمیشەیی لەنێوان نەتەوەكان)دا جەختی لەسەر دەكردەوە.

ئەو هەڵوێستەی ئارۆن لە مەسەلەی جەزائیر هێندەی نەمابوو باجێكی قورسی پێ بدات و، ژیانی بخاتە مەترسیەوە. لەم سەرو بەندەدا نامەیەكی هەرەشەئامێزی نهێنی بەدەست گەیشت لە لایەن راسترەوە توندرەوەكان و "رێكخراوی كاری نهێنی"یەوە.

ئەو رێكخراوە پێشتر هەوڵێكی سەرنەكەوتووی دابوو بۆ تیرۆركردنی ژەنەراڵ شارل دیگۆل لە كوچەو شەقامەكانی پاریس دا. نامەكە ئارۆن بەوە تاوانبار دەكات كە بە "كرێ گیراوی دەزگا موخابەراتیەكانی وڵاتانی بێگانەیە، لێرەدا مەبەست دەزگای موخابەراتی ئەمریكیە" و پێی دەڵێت: ئەو لە رای گشتی نەتەوەی فەرەنسی لای داوە. كەواتە ئارۆن خائینەو شایستەی توندترین سزایە، نامەكە بەوە كۆتایی دێت كە دەڵێت: ئەمە یەكەمین جارودوانجارە ئاگادار دەكرێیتەوە. حكومەت پێی راگەیاند كە ئامادەیە پاسەوانی پۆلیسی بۆ دابنێ، بەڵام ئارۆن ئەم پێشنیارەی رەت كردەوە، لەبەر ئەوەی پێی وابوو كارێكی وا ناهێڵێت بە ئازادی هەڵسوكەوت بكات. لە بەرامبەر ئەم هەرەشانەدا لەو بۆچوونانەی پاشگەز نەبووەوە كە داوای سەربەخۆیی جەزائیری دەكرد، بەمەش ئازایەتی راستەقینەی خۆی سەلماند. بێگومان رۆشنبیر لە ساتەوەختی قەیران و تەنگانەكاندا دەناسرێت نەك لەكاتی ئاساییدا.

پێویستە هەموو رۆشنبیرێكی حەقیقی ئەوە بزانێت كە رۆژێك لە رۆژان رووبەرووی هەرەشەو مەترسی دەبێتەوە، بەهۆی سووربونی لەسەر پاراستنی سەربەخۆیی شەخسی خۆی و پابەندبوونی بەو بنەمایانەوە كە ئەو بەراستیان دەزانێت. لەوكاتەدا دەبێت یان خۆی رابگرێت یاخود پاشەكشە بكات و پەشیمان بێتەوە، دەبێت مل كەچی فشارو شاڵاوەكان بێت یاخود تا دوا هەناسە بەرخورد بكات.

**سەرچاوە:**

هاشم صالح: قراءة في الفكر الاوروبي الحديث– كتاب الرياض، السعودية– الطبعة الاولى، 1994.

# جۆن ستیوارت میل و ئازادیی تاك

■ ج. و. ن. واتکینز

● و. له فارسییه‌وه: فه‌رۆخ نیعمه‌تپور

جۆن ستوارت میل(1806–73) یه‌کێك له به‌ناوبانگترین فه‌یله‌سووفه‌کانی وڵاتی ئینگلیزه. له‌سه‌ده‌ی نۆزده‌دا ره‌نگه بیرو بۆچوونه‌کانی زیاتر له هه‌ر بیرمه‌ندێکی دیکه کاریگه‌ری به‌ربلاوترو قووڵتری له جیهانی ئینگلیزی زمانه‌کاندا هه‌بووبێ. گه‌رچی میل له ئابووریش دا خاوه‌نی هه‌ندێك لێکۆڵینه‌وه بوو که‌له سه‌رده‌می خۆیدا تاراده‌یه‌ك نفوزی په‌یدا کردبوو، هه‌روه‌ها کتێبێکی گه‌وره‌و گرانی سه‌باره‌ت به مه‌نتق نووسی بوو که گه‌لێك بیروبۆچوونی تازه‌و وردی تێدا بووو تا ماوه‌یه‌کی باش سه‌رنجی مه‌نتق زانه‌کانی راکێشابوو(ئێستاش له هه‌ندێك بواردا سه‌رنج راکێشه)، به‌ڵام گرنگترینی نووسینه‌کانی میل له بواری کۆمه‌ڵ و سیاسه‌تدا بوو که کاریگه‌ریه‌کی باشترو درێژخایه‌نتری هه‌بوو. له‌م روانگه‌یه‌وه، به‌راستی میل ده‌بێ وه‌ك یه‌کێك له باوکانی ئه‌ندێشه‌ی دیموکراتیك سه‌یری بکرێ. ناودارترین به‌رهه‌می ئه‌و له‌م بواره‌دا کتێبێکه به نێوی"له‌ئازادیدا" که دووجار وه‌رگێڕدراوه‌ته سه‌ر زمانی فارسی(له‌لایه‌ن دکتۆر مه‌حموودی سه‌ناعی و دکتۆر جه‌وادی شێخه‌لئیسلامی)، ره‌نگه ئه‌م کتێبه به‌هێزترین و روونترین به‌رگریه‌ك بێت که‌له مێژووی فه‌لسه‌فه‌ی کۆمه‌لایه‌تی و سیاسیدا له ئازادیی تاك کرابێت نه‌ته‌نیا له به‌رامبه‌ری ده‌ست درێژیه‌کانی حکوومه‌ت دا، به‌ڵکوله‌وه بالاتر له‌به‌رامبه‌ر سه‌ره‌ڕۆیی زۆرینه‌ش دا. کتێبێکی دیکه‌ش هه‌ر له‌م نووسه‌ره به‌نێوی"حکوومه‌تی هه‌ڵبژێردراو"له‌لایه‌ن "عه‌لی رامین"ه‌وه کراوه به‌فارسی که‌شایانی خوێندنه‌وه‌یه‌کی قووڵه. ئه‌م وتاره‌ی که ئێستا

لەبەردەم خوێنەراندایە، لە نووسینی یەکێك لە فەیلەسووفە هاوچەرخەکانی ئینگلیزە. ئەم فەیلەسووفە سەبارەت بە بیروبۆچوونەکانی میل لە کتێبی "لەئازادیدا" دەدوێ‌و نموونەیەکی جوان‌و شیاومان لە وردبینی‌و هاوسەنگی لەرەخنەی فەلسەفیدا پێشکەش دەکا. ع. ف

کتێبی "لەئازادیدا"[1] لە ساڵی **1859** چەند مانگ لە دوای مەرگی هاوسەری میل کە ناوی هاریت بوو، بڵاو کرایەوە. میل لە کتێبی "ژیانی من"[2] باس لەوە دەکا کە خۆی‌و هاوسەرەکەی نیازیان وابووە بەیەکەوە بە کتێبی "لەئازادیدا" بچنەوە، بەڵام دەڵێ چونکە هاوسەرەکەی مردووە، ئیتر هیچ گۆڕانێك لە کتێبەکەدا پێك ناهێنێ، چونکە لە کتێبی "لەئازادیدا"، "هەموو ئەو شتانەی کە نێوی منیان بەسەرەوەیە، بەمانایەکی راستەقینەترو بە شێوەیەکی راستەو خۆتر بەرهەمی هاوبەشی ئێمە بووە، لەراستیدا رستەیەکی تێدا نیە کە پێکەوە چەند جار پێیدا نەچووبینەوە."

چەند ساڵ بەر لەبڵاوبوونەوەی "لەئازادیدا"، میل ئاگادار کرابوو کە ئەویش وەك هاوسەرەکەی نەخۆشی سیلی هەیە. کتوپڕ تێگەیشت کەژیانی هاوبەشیان شتێکی ئەوتۆی بەبەرەوە نەماوە. هەر بۆیە هەوڵیان دا تائەو جێگایەی پێیان دەکرێ ئەو بیروبۆچوونانە بێننە سەر کاغەز کە زۆر لەوەو پێش لێی دووابوون. یەکێك لەدیارترینی ئەم بیروبۆچوونانە، بیروڕایان بوو سەبارەت بە ئازادی. ساڵێك لەوە پێش میل وتارێکی سەبارەت بە ئازادی نووسیبوو، ئێستاش گەلێك لەبیری ئەوەدا بوو کەلەگەڵ هاوسەرەکەی زیاتر لێی بدوێ‌و بیکا بە کتێبێك. میل هەستی دەکرد کە کتێبێکی لەم چەشنە گەلێك پێویستە، بەڵام لەسەر ئەو بڕوایە بوو کەمەترسیی سەرەکی بریتی نیە لە هێرشی ئاشکراو راستەوخۆ بۆ سەر ئازادی، ئێستا ئیتر ئەوانەی وا پەندی ئەخلاقمان دەدەنی‌و ئەوانەی وا خۆیان بە ریفۆرمیستی سیاسی دەزانن، وردە وردە ئازادی دەسوون‌و بچووکی دەکەنەوە، کەئەمە لەخۆیدا مەترسیەکی گەلێك گەورەترە. هەر لەم بوارەدا بۆ هاوسەرەکەی نووسی: "تەقریبەن ئێستا هەموو پرۆگرامەکانی ریفۆرمیستە کۆمەڵایەتیەکان خنکێنەری ئازادین."

ئەم بیرە گەلێك هاریتی جوولان. "میل"یش بەو ئەنجامە گەیشت کە ئەمە گرنگترین کارێکە کە "لەچەندساڵی‌کۆتاییتەمەنماندارەنگەبتوانین ئەنجامی بدەین" لەسەر ئەو بڕوایەش بوو کەئەم کتێبە "بارودۆخەکە دەهەژێنێ" هەروەها گوتی "ئەو شتانەی کە نامانەوێ بە نەگوتراوەیی بمێننەوە، تا ئەو جێگایەی بۆمان دەکرێ دەبێ زیاتر لەم کتێبەدا بیانگونجێنین."

کتێبی "لەئازادیدا" وەك هەموو نووسراوە سیاسیە مەزنەکان، کاردانەوەیەك بوو لە بەرامبەر مەترسیدا. ئەو کەسەی کەلە چەندین ساڵ لەوە پێشەوە میلی سەبارەت بەم مەترسیە ئاگادار کردبووەوە ئالکسی دو توکڤیل بوو لە کتێبی هەرەبەنرخی "دیموکراسی لە ئەمریکادا."[3]

توکڤیل پێی وابوو کەگەشەو هەڵدانی دیموکراسی کۆمەڵایەتی بەهەر حاڵ رێگەی لێ ناگیرێ. توکڤیل دژایەتی دیموکراسی کۆمەڵایەتی نەدەکرد، بەڵام هەندێك مەیلی مەترسیداری تێدا دەبینی کە ماهییەتی گشتی هەموویانی لەم دەستەواژەیەدا کۆکردبووەوە: "سەرەڕۆیی زۆرینە". ئەندێشەی توکڤیل زیاتر لە هەر شتێکی دی باسی لە سەرەڕۆیەکی وردو بچکۆلانە دەکرد کەنەریت‌و بیروباوەڕو بایەخە گشتیەکان بەسەر باوەڕە تاکەکەسیەکاندا دەیسەپێنێ، نەك یاسا

دیموکراتیکەکان یان ئەو بڕیارو کردارە سیاسیە ئاشکراو بەقەستانەی کە مرۆڤە نائازادیخوازەکان دەیانسەپاندن‌و بەڕێوەیان دەبردن. میل لە کاتی لێکۆڵینەوەی کتێبی توکڤیل لە گۆڤاری ئێدینبۆرۆ ریڤیو[4] ئەم بیرەی ناوبراوی پەسەند کرد کە لەم ڕۆژانەدا دەبێ لە "سەرەڕۆیی فیکری‌و ڕۆحی بترسین، نەك لە سەرەڕۆیی جەستەیی" هەروەها کۆتی ئەو مەیلە ترسناکانەی کە توکڤیل لە ئەمریکای دیموکراتیك دا بینیوویەتی لە ئینگلتەرەش هەن، هەروەها سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەم وڵاتە وەها گرفتاری پێکهاتە چینایەتیە کەبە هیچ شێوەیەك ناتوانین سیفەتی دیموکراتیکی بخەینە پاڵ.

میل لەکتێبی "لەئازادیدا" سەر لەنوێ باسەکەی توکڤیل دێنێتەوە گۆڕێ‌و پێ لە سەر ئەوە دادەگرێ کە نابێ وابیر بکەینەوە کە "سەرەڕۆیی زۆرینە" بەشێوەیەکی گشتی لە سەرچاوە دەوڵەتیەکانەوە دەکەوێتە کار، دیموکراسیی کۆمەڵایەتی دەتوانێ "سەرەڕۆییەکی کۆمەڵایەتی پڕ مەترسی ترو بەهێزتر لە زۆربەی جۆرەکانی زوڵمی سیاسی بێنێتە ئاراوە، چونکە ئەگەرچی زۆر کەم پاڵی بە سزای توندو تیژانەوە داوەتەوە، بەڵام کەمتر ڕێگای دەرباز بوون دەهێڵێتەوەو زیاتر لە وردەکاریەکانی ژیاندا نفوز دەکاو ڕۆح کۆیلە دەکا."

لەم سەردەمەدا خەڵکی بەرادەیەکی کەمتر خووو نەریت‌و ئاکارەکانی کۆمەڵگا بەزاڵمانە‌و سەرکوت کەرانە دەزانن(جگە لە هاوجنس کەراکان)، بۆ هێنانە بەر چاوی ئەو فەزا قورس‌و نەفەس گرەی کە تاکەکانی چینی ناوەڕاستی ئینگلتەرە لە ڕۆژگاری میل داتێیدا دەژیان، رەنگە دەبێ لەهێزی خەیاڵی مێژوویی کەڵك وەربگرین. بەکێك لەبیرمەندان بە نێویز.ب.مکالم[5] لە پێشەکیەکدا کە بۆ کتێبی "لەئازادیدا" نووسیوویەتی(چاپی ئۆکسفۆرد،1946) بەم شێوەیە جیاوازیی گەورەی ئینگلتەرەی ئەوڕۆ لەگەڵ ئینگلتەرەی نیوەی سەدەی19 لە بواری ئازادیی سیاسی‌و ئازادیی کۆمەڵایەتی لێك داوەتەوە:" ئەگەر گەنجێکی ئەوڕۆ خاوەنی سامانێکی نێوەنجی بووایە و بگەڕایەوە بۆ دەیەی 1860، سەری سوڕدەما لە ئارامی ژیان‌و لەچاوەڕوانیە کەمەکانی دەوڵەت سەبارەت بەخۆی‌و لەو زەرییە کەمەی کە بۆی دیاری کرابوو... هەروەها ئازاد دەبوو لە یاساو ڕێساکانی پاسپۆرت‌و چاپ‌و جەوازی کارو ئەوانی دی. بەڵام لەلایەکی دیکەوە لەگەلێك بواری دیکەی ژیانی تایبەتی‌و فیکری‌و پەیوەندیە عاشقانەکان‌و بیروبۆچوونە ئایینی‌و زانستی‌و پەیوەندیە جنسیەکاندا خۆی لە چوارچێوەی تەسك‌و تەنگەبەری بیروبۆچوونە وشکەکاندا دەبینییەوەو لە قسەو کردەوەدا دەبوایە ئەوپەڕی لێخورد بوونەوەو بەکاوە خۆ هەنگاوهەڵهێنانی ڕەچاو بکردایە."

میل ئەوەی قبووڵ بوو کە بیروباوەڕو بایەخە وشك‌و ڕەقەکانی سەردەمی ڤیکتۆریا(لەسەدەی 19)دا– یان بەوتەی خۆی" هەڵنەکردنی کۆمەڵایەتی ئێمە"– بەشێوەیەکی بێدەنگ‌و تارادەیەك بێ ئازار لەکۆمەڵ دا کاردەکاو بەبێ زیندانی کردن یان کوشتن‌و جەریمە کردن کاریگەریان لەسەر کۆمەڵگا هەیە، تەنانەت ئەو ئێزنە بەنەیارانی خۆشی دەدا (ئەوانەی وا بە تووشی نەخۆشیی بیرکردنەوەوە بوون) لانی کەم لە خەڵوەتداو بەمەرجی شاردنەوەی بیروڕا نائاساییەکەیان لە جیهانی دەورووبەریان، عەقڵیان بخەنە گەڕ. میل لەسەر ئەو بڕوایە بوو ئەم بەرنامەیە" بەرنامەیەکی ڕەحەتە بۆ ڕاگرتنی

ئارامی لە جیهانی ئەندێشەداو درێژەدان بەهەموو شتێك وەك رابردوو. بەڵام ئەو نرخەی کەلەم پێناوەدا دەدرێ بریتیە لە قوربانی کردنی هەموو ئازایەتی ئەخلاقیی مرۆڤ." میل لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە "نیری بیرورای گشتی" بەرادەیەك قورس بووە کە هاوچەرخەکانی دی تەنیا لە بازرگانیو سەنعەتدا دەتوانن بە جیدیەتو سەربەخۆ عەمەل بکەن.

میل پێش بینی دەکرد کاتێك زۆرینەی خەڵك لە هێزی خۆیان تێدەگەن، ئەو مەیلە خراپە لە نێویاندا سەر هەڵدەدا کە زێدەرۆیانە کەڵکی لێ وەربگرن. هەر بەو شێوەیە کە بیرورای گشتی دەست درێژی کردۆتەسەر هەرێمی ئازادیی کۆمەڵایەتی، حکوومەتیش دەست درێژی دەکاتە سەر هەرێمی ئازادیی مەدەنی. روانگەی من ئەوەیە کە ئەم پێش بینیە ناهومێدانەیە لە ئینگلتەرە نەهاتووەتە دی. هەڵبەت سەردەمانێك وادەهاتە بەرچاو کە بێتە دی. لەدەیەی *1920*، هەندێك لە بیرمەندانی سۆسیالیست کە چەپگەراتر بوون لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە بۆپێش گرتن لە جموجۆڵە دژەشۆڕشەکانی باڵی راست، هەر حکوومەتێکی هەڵبژێردراوی حیزبی کرێکار دەبێ لەیەکەم هەنگاویدا، یاسایەك لەلایەن پەرلەمانەوە پەسەند بکات کە ئەو ئیزنە بەدەوڵەت بدات بەرنامەی سۆسیالیزەکردنی کاروبارەکان بەخێرایی لەلایەن زنجیرەیەك فەرمانەوە بەئەنجام بگەیەنێت کە وەزارەتەکان دەری دەکەن. ئەگەر وەها دەکرا، پێش بینی میل راست دەردەچوو. بەڵام بە کردەوە، حکوومەتی کرێکاری کە سەرەداوی کاروبارەکانی بەدەستەوەبوو لە *1945*تا *1951*هیچ کردەوەیەکی گرنگی بە پێچەوانەی یاسای بنەڕەتی وڵات بەڕێوە نەبرد. هەڵبەت شارۆمەندی ئەورۆکەی بەریتانیا زیاتر لە رۆژەکانی پێش شەڕی یەکەمی جیهان لە ژێر فشاری یاساو رێساکاندایە. بەڵام هێشتا زیاتر لە هەر شارۆمەندێکی هەر کۆمەڵگایەك لە جیهاندا کە شێوەی دیموکراتیکی کەمتر تێدایە، لە ئازادیی مەدەنی بەهرەمەندە.

کەواتە ئەمە بریتیە لەو مەترسیەی کە کتێبی"لەئازادیدا" بەمەبەستی خەبات لەگەڵی نووسرابوو ئێستا با بزانین چۆن خەبات دەبێ بەرێوە بچێ. میل دەیگوت پشت نابەستم بە هیچ جۆری مافی سروشتیی ئازادی:"من چاوپۆشی دەکەم لە هەر شتێکی باش کەماناى هەمەکیو ئینتزاعیی ماف، واتە شتێك سەربەخۆ لە بەکەڵك هاتوویی، بۆ ئیستدلالەکانم بەدیاری بێنێ. بەبڕوای من، لەمەسەلە ئەخلاقیەکاندا باڵاترین بەڵگە بەکەڵك هاتوویيە"

باوکی میل، واتە جەیمزمیل، لایەنگرو پارمەتیدەری سەرەکی"جرمی بنتم" (*1832*–*1748*)، بنیات نەری قوتابخانەی ئینگلیزی پراگماتیزم[7] بووو، هەر بۆخۆی سەرپەرشتی خوێندنە سەرەتاییەکانی کوڕەکەی دەکرد. (بەرنامەی سەیری جان ستوارت میل بۆ فێر بوون لەسەرەتای کتێبەکەیدا بەنێوی"ژیانی من" باسی لێکراوە). کەواتە بنەماکانی پراگماتیزم بەتەواوی تێکەڵی گیانی جۆن ستوارت میل ببوو. بەگوێرەی ئەو بنەما فیکریەی کە پراگماتیزمی لەسەر راوەستاوە، هەموو شتێك دەبێ لەسەر ئەم بنەمایە حوکمی لەسەر بدرێ کەداخوا زۆرترین شادیو خۆشبەختی بۆ زۆرترین خەڵك بەدیاری دێنێ یان نا. بەڵام میل لەسەردەمی لاویەتیدا، لەدوای قەیرانێکی توندو تیژی عاتفی، هەستی کرد ئەم بنەمایە زیاد لەرادە بەرتەسکەو

دەبێ بۆ کامل کردنی لە هەندێك بنەمای عاتفی کەڵك وەربگیردرێ کە باشتر مرۆڤ رازی دەکەن.

هەڵبەت ئەو قەت بە شێوەیەکی رەسمی بنەمای پراگماتیزمی بەرنەداو بەردەوام وەك زەمینەیەك کەڵکی لێوەرگرت بۆ بەڵگە هێنانەوەکانی لەلایەنگری کردن لە ئازادی. بەڵام لە کتێبی "لە ئازادیدا"، ئەو بنەمایەی کەبەشێوەیەکی سەرەکی و راستەوخۆ پاڵی پێوەدا بنەمایەکی دیکەیە کەبەم شێوەیە لێی دەدوێ: "مەبەست لەم نووسینە بڕوا هێنانە بەبنەمایەکی گەلێك سادەیە کەبە حەق دەبێ بەشێوەیەکی رەها حاکم بێت بەسەر رەفتاری کۆمەڵ لەگەڵ تاکەکەس دا کاتێك کە دەیەوێ تاك مەجبوور بەکارێك بکات یان کۆنترۆڵی بکات، جا ئەو ئامرازەی بەکاری دێنێت هێزی جەستە بێت...یان ئەو پێویستیە ئەخلاقیانەی کە لە بیروڕای گشتییەوە سەرچاوە دەگرن. ئەو بنەمایەش ئەوەیە تاقە ئامانجێك کە مرۆڤەکان ئیزنیان هەیە بۆ گەیشتن پێی بەشێوەیەکی فەردی یا گشتی دەست وەردەنە ئازادیی کردەوەی تاکێکی کۆمەڵ، بریتیە لە پاراستنی خود، تەنیا ئامانجێکیش کەبە مەبەستی گەیشتن پێی، مومکینە بەحەق هەر ئەندامێکی کۆمەڵگای شارستانی بەپێچەوانەی ئیرادەی خۆی بەسەریدا بسەپێ، ئەوەیە کە نەهێڵێ ئازار بە خەڵکانی دیکە بگەیەنێ. قازانجی خودی خۆی، جاچ جەستەیی بێت یا دەروونی، رێ پێدەرێکی تەواو نییە بۆ ئەم کارە."

ئەم "بنەما زۆر سادەیە" نە تەنیا جیاوازە لەگەڵ بنەمای پراگماتیزم، بەڵکو بەرواڵەت لەگەڵیشی لە ململانێدایە، چونکە پراگماتیزم دەتوانێ لە هەندێ بواردا ئێمە مەجبوور بە دەخالەت بکا لەکاتێکا ئەم "بنەما زۆر سادەیە"ی میل بەرواڵەت لە دەخالەت کردن دەمانگێڕێتەوە. بانموونەیەکی ئەمڕۆیی بێنینەوە وای دابنێین تا رادەیەك رێگایەکی ئاسان لە بەردەستدایە بۆ ئەوەی پێشگیری بکەین لەوەی کە ئەو مرۆڤانەی هێشتا جگەرە ناکێشن، فێری ئەبن. کەواتە ئەگەر بوونی پەیوەندی هۆو هۆکری لەنێوان کێشانی جگەرەو سەرەتانی سیەکان شتێکی حەتمی بوو، ئەوا بە گوێرەی بنەمای قازانج خوازی ئەو مافەمان هەبوو بەر بەو کەسانە بگرین، چونکە بەرگری کردن لە خواردنی جگەرە زیاتر لەوەی کە ببێتە هۆی رەنج و ئازارێکی زیاتر، لەم رەنج و ئازارەی کەم دەکردەوە. بەڵام کارێکی وەها، بەگوێرەی بۆچوونی میل نادروست بوو، چونکە کۆمەڵگا لە جیاتی ئەوەی نەهێڵێ خەڵکانێ ئازار بەوانی دی بگەیەنن، ئەوا بەمەبەستی خێرو قازانجی خۆیان ئەو ئیزنە دەدرا کە دەخالەت لە ژیانیاندا بکرێ.

رەنگە رەخنە بگرن کەزۆربەی ئەو کەسانەی دوچاری سەرەتانی سیەکان دەبن، دەبنە هۆی رەنج و ئازاری خەڵکانی دیکە، هەر لە دۆستان و خزم و کەس و کارەوە بیگرە هەتا بنەماڵەی خۆی، کەواتە "بنەمای زۆر سادە"ی میل لێرەدا بەحەتمی بەربەوە ناگرێ کە کۆمەڵگا دەخالەتی خۆی نەکا، چونکە مەبەست بریتیە لە پێشگرتن لە ئازاردانی حەتمی خەڵکی دیکە، نەك خێرو قازانجی ئەوانەی وا جگەرەو شتی دیکەی لەم بابەتە بەکاردێنن. ئەم رەخنەیە باس لەلاوازیەکی گرنگ لە بۆچوونی میل دا دەکا. میل زۆربەی کات بەجۆرێك دەدوێ و بەڵگە دێنێتەوە کە دەڵێی پەیڕەوی کردن لە بۆچوونی ئەو نەتەنیا دەبێتە هۆی سەرچاوەی قازانجی زۆر، بەڵکو بۆ کۆمەڵگا بە خێرایی

دەکەوێتەوە(هەڵبەت بە هەڵاواردنی ئەو دوو زمانانە، واتە ئەوانەی کە ئیتر مافی دەخالەت کردن لە ژیانی تایبەتی خەڵکیان نابێت، لەوە دوا دەبێ هەر خۆیان بخۆنەوەو هیچ کارێکیان لە دەست نەیەت). نووسراوەکەی میل زۆربەی کات وامان پیشان دەدات کە کۆمەڵ دەبێ تەنیا لە دەستێوەردانی ئەو کارانە خۆی بپارێزێ کە هیچ کاریگەریەکیان لەسەر کۆمەڵگا نیە، یان ئەگەر هەیانە بەرادەیەك کەمە کە دەکرێ بەحسێبی نەهێنین. بەرواڵەت قسەی ئەو ئەوەیە کەکۆمەڵ تەنیا دەبێ لە دروست کردنی فشار بۆ ئەو کردەوانە خۆی بپارێزێ، کەتەنیا بکەرەکەی دەگرێتەوە. تەنانەت وادێتە بەرچاو کەئەم بنەمایەی میل لەراستیدا تەنیا پارێزەرو نیگابانی بیرورواوهەستە دەروونیەکانی مرۆڤەکانە، نەك کارە دەرەکیەکانیان. بواری سەرەکیی ئازادی لەلای میل بریتیە لە"قەڵەمڕەوی دەروونیی شعورو وشیاری" بنەماکەی ئەو لێرەدا پێویستی هەیە بە"ئازادیی ویژدان لە کۆترین مانادا؛ واتە ئازادیی ئەندێشەو هەست، ئازادیی ڕەهای بیروباوەڕو هەست لە هەر بوارێکدا، لە کردەوەوە بیگرە هەتا بواری تیۆری‌و زانستی‌و ئاکاری یا خودایی."

کەواتە دیتمان میل لە سەرەتای وتارەکەیدا، بنەمای بە قازانج بوونی کردووە بە دوا پێوانە لە مەسەلە ئەقلانیەکانداو، دواتر گەڕایەوە سەر بنەمایەکی دیکە کە لەگەڵ بنەمای یەکەم بە تەواوی نەدەهاتەوە(بەو مانایە کە کت‌و مت وەك ئەو بێت) بە گوێرەی ئەم بنەمایە، دەبا کۆمەڵگاخۆی ببوێرێ لە دەخالەت کردن لە ژیانی ئەو مرۆڤانەی کە تەمەنی منداڵیان تێ پەڕاندووە، ئەمەش تەنیا لە بەر قازانجی خۆیان. تەنانەت ئەگەر ئەم دەست تێوەردانە ئەوان شادترو بەختەوەرتر بکا(ولە شادی‌و بەختەوەریی کەسانی دیکە کەم نەکاتەوە). دواتر ئەوە دەڵێم کە بە گومانی من ئەوەی بە ڕاستی مەبەستی"میل"ە، بریتیە لە بنەمای سێهەم کە لەگەڵ هیچ کام ئەو دوو بنەمایەدا نایەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە کۆمەڵگا نابێ هیچ گیرو گرفتێك بۆ ئەو مرۆڤانە ساز بکات کە بە شوێن حەقیقەتدا دەگەڕێن، تەنانەت ئەگەر لە ئاکامی ئەم گەڕانەش دا بە هەندێك بۆ چوون بگەن کە بۆ کۆمەڵگا جێگای مەترسی بێت. "بنەمای زۆر سادە"ی میل، بە ڕواڵەت کاتێك کە کردەوەکانی تاك پەیوەندی بە کەسانی دیکەوە پەیدا دەکا، گرنتی ئازادیی ئەو تاکە ناکات. بەڵام با جارێکە بزانین میل چۆن دەیویست بەم بنەمایەی بگات بە شیکردنەوەی ئازادیی بەیان‌و چاپەمەنی (سەرەرای ئەوەی کەرەنگە قسەو نووسینەکانمان لە ئاستێکی بەرزدا پەیوەندی بە خەڵکانی دیکەوە پەیدا بکاو کاریگەریی هەبێت لە سەر بارودۆخ‌و کارەکانیان).

ئازادیی لێ توێژینەوە، بابەتی بەشی دووهەمی کتێبی"لە ئازادیدا"یە. زۆربەی خوێنەران ئەم بەشە بە باشترین بەشی کتێبەکە دەزانن. میل بۆ خۆی باس لەوە دەکا کە پەیوەندی ئازادیی لێ توێژینەوە لەگەڵ"بنەما زۆر سادە"کەی ئەو ئەوەندەش جێکەوتوو و ئاسان نیە. ئەوە دەنووسێ: "ئازادیی بەیان و بڵاوکردنەوەی بیرورا رەنگە پەیرەوی لە بنەمایەکی دیکە بکا، چونکە پەیوەندی بەو بەشە لە رەفتاری تاکەوە هەیە کە ئەویش پەیوەندی هەیە بەخەڵکانی ترەوە" بەڵام بەگوێرەی بەڵگە هێنانەوەو شیکردنەوەکانی، میل لە دوو قۆناغ دا بە ئاکامێکی خوازراو دەگا، "بنەمای زۆرسادە"ی میل پێویستی هەیە بە ئازادیی بیرکردنەوەی

خسووسی، کـە ئەمـەش پێویسـتی هەیـە بـە دەربڕینی بیر لە بەردەم گشتدا.

بـەڵام ئـەم شیکردنەوەیە لاواز دێتـە بـەرچاو، چونکـە دەتوانرێ ئیستدلالی ئـاوەژوو بکرێتـــەوە رەنگـە کەسێك بنـەمای بـە قـازانج بوونـی قبـوڵ بێت، بەڵام ئـازاد بخـواز نـەبێت و ئاوەهـا وەڵامـی میل بداتەوە:"من لەسەداسەد لەگەڵ تـۆ هاوبـیرم کە ئازادیی ئەندێشەو ئازادیی بەیان وبڵاوکردنـەوە بە کردەوە لێك جیاناکرێنەوە. هەروەها لەگەڵ تۆ هاورام کە کۆمەڵگا ئەو مافەی هەیە کە لە بەرابەر کردەوەی خراپ دا لە خۆی بەرگری بکـات، بـەڵام رەنگـە تۆیش لەگـەڵ مـن هـاوڕا بیـت کـە بـڵاو کردنەوەی هەندێك کتێب مومکینە گەلێك زەرەری هـــەبێت بـــۆ کۆمـــەڵگا. ئـــەوەندە بەســـە هەڵیسـەنگێنیت کـە بڵاوکردنـەوەی راگەیـەندراوی کۆمۆنسـتی(مـارکس وئەنگـەڵس) رەنگـە ببـێ بەهۆکاری چیـهأ بـەد بەختی کەواتـە بـەو ئاکامـە دەگـەم کـە یەکـەم، کۆمـەڵگا مـافی خۆیـەتی بڵاوکراوەکان سانسـۆڕ بکـات، دووهـەم، تەنانـەت مافی ئەوەی هەیە کە بە سـەرنج دان بـەوەی کـە بیرکردنەوەی خسووسی و رادەربڕیـن لـە بـەردەم گشـتدا پـەیوەندی نزیکیـان پێکـەوە هەیـە، نارادەیـەکی چـاوەدێری بـیروڕای تایبـەتی وخسووسی بکا."

کەواتە "بنەمای زۆر سادە"ی میـل نـەوەندە بـەهێز نـەبوو کـە بتوانـێ بـەو شـتەی بگـا کـە دەیویست. بەڵام لێرەدا جارێکە واز لـەم بنەمایـە دێنین تـا دواتـر بگەرێنـەوە سـەری، هـەروەها دێینەسـەر هـەندێك لـەو هۆکـارە سـەربەخۆیانەی کـەمیل بەلایـەنگری لـە ئـازادیی لێ تۆژینـەوە دەیانهێنێتـە گـۆڕێ بـەرای میـل، ئەوەشـتێکی سـەلمێنراوە کـە ئاگـاداری لـە حەقیقەتـە نـا ئاساییەکان (غیر بدیـهی) شـتێکی چاکـەو، ئەگـەر هـەر شتێکی دیکـەش لـە جێگـای خـۆی پـارێزراو بێت و، دیسـان لەمـەکۆی هـەر کۆمەڵگایـەکدا لـەم حەقیقەتانــە زیـاتر هـــەبێت، ئـــەوا ئاســـتی بەختەوەریەکەی زیاتر دەچێتـە سـەرەوە، میـل دەیگوت ئەگەر بەڵێنە رادەی حەقیقەتـە ئاشـکراو زانراوەکان بچنە سەرێ ، ئەوا ئازادی لێ تۆژینەوە گرنگیەکی بنەڕەتی هەیە، بەڵکە هێنانەوەکەیشـی بەم شێوەیە بوو کە جگە لـە بوارەکـانی مـەنتق و "ریاضیات" ئەوا تەنیا بـە بیستنی فیسـارە بـیرو بۆچوون ناتوانین بگەینە حەقیقەتەکەی. هەروەها ناتوانین پـاڵ بدەین بـەو هەستە دڵنیاییـەوە کـە تیامـاندا پێك هـاتووە (چونکـە بیروڕایـەك رەنگـە ناراست بێـت ئەگـەرچی وا هەسـت بکـەین کـە راستە). ئەوشتەی کە ئـەو مافـە بە ئێمـە دەدات بەدڵنیاییەوە بڕوا بە بیروبۆچوونێك بێنین، ئەوەیە کە ئەو بیرو بۆچوونـە تائێستا بـە سـەربەرزی لـە رەخنەی وردی نەیارانی رزگاری بووبێت. کەواتـە کـاتێك بـیرو بۆچوونێکـی تـسەقلیدی و مـیراتی بەراسـتی دروسـت بێـت و بـیرو بۆچوونێکـی لادەرانـەو نەیاریشـی ناڕاست بێت، ئـەوا دیسـان بـەرگرتن لـەو بـیروڕا ناڕاسـتە خیانەتـە بـە حەقیقەت، چونکە کارێکی وەهـا ئـەو ئیمکانـەمان لە دەست دەسێنێتەوە کە ئەو بیروڕا راستە تاقی بکەینەوەو ئەزموونی بکەین. بیروڕای دروست تـا کەمتر ئەزمون بکرێ، ئـەوا بەلگەیـەکی کـەمترمان بەدەستەوە دەبێ بۆ دەرخستنی راسـتیەکەی، هەروەها لەو ماناو هێزەی کە لە زاتیدایە بـێ ئاگا دەمێنینـەوە. کـاتێك راسـتیەکان لـە رەخنـە بەدووربن، وشـك دەبـن و سـیفەتی دۆگمـا بـە سـەریاندا زاڵ دەبـێ، هـەروەها پێشـکەوتنی فیکـریو عەقڵی هێـواش دەبێتـەوەو سـەرئەنجام رادەوەستێ. میل دەنووسێ: "هەر کە مەیدان لـە دوژمنـان بـەتاڵ بـوو، مامۆسـتاو قوتـابی هـەر

دووکیان خەو دەیانباتەوە." هەروەها ئەگەر مرۆڤ ئاگای لە بیروڕا نەیارەکان نەبێت، ئەوا پێداگرتن لەسەر هەر بیروڕایەك، تەنانەت بیروڕای راستیش کردارێکی عەقڵانی نیە، چونکە: "ئەو کەسەی کە لە مەسەلەیەکدا ئاگای لە قسەکانی خۆی بێت، ئەوا هیچی لێ نازانێت. رەنگە ئەو کەسە بەلگەکانی بە هێزبێ و تائێستا هیچ کەس نەیتوانیبێ رەدیان بداتەوە، بەڵام ئەگەر بۆ خۆشیی نەتوانێ بەلگەو قسەکانی ئەوەی بەرانبەری رەد بداتەوە و، تەنانەت نەزانێ کە ئەو بەلگانەش چین، بنەمایەك بۆ سەرخستنی هیچ کام لەو بیروڕایانە بە دەستەوە نابێت."

هەڵبەتە رەنگە بیروڕایەکی لادەرانەی راست و بیروڕایەکی تەقلیدی ناراست بێت، یان–وەك ئەوەی زیاتر روو دەدات– هەر دووکیان لە لایەنێکەوە راست بن و لە لایەنێکی دیکەوە ناراست بن. بەرپرسی دەوڵەتیی سانسۆر ناتوانێ لەوەپێش بزانێ کە داخۆ ئەو بیروڕا تەقلیدیە بە تەواوی راستە، چونکە تازە لە دوای روو بەروو بوونەوەی بیروراکان دەتوانرێ ئەمە دیاری بکرێت. میل دەڵێ:"ئەو پەڕی جیاوازی هەیە لە نێوان ئەوەی کە بیروڕایەکی بەراست بزانین چونکە لە ململانێدا هیچ دەرفەتێکی بە تاڵ کردنەوەی بۆ نەڕەخساوە لەگەڵ ئەوەی کە راستیەکەی بە حەتمی بزانین لەبەر ئەوەی دەرفەتی بەتاڵ بوونەوەی لەململانێیەکاندا بۆ نەڕەخسێنین."

کتێبی"لەئازادیدا" وکتێبەکەی داروین"بنیاتی جۆرەکان" لە یەك ساڵدا کەوتنە بەردەستی خوێنەران. رەنگە بتوانین بڵێین کە لە روانگەی میلەوە، گەشەی زانست و مەعریفە پەیڕەوی لە جۆرێك پرۆسەی پێگەیشتن دەکرد کە بە گوێرەی ئەم رەوتە، ئەگەر ململانێ بۆ مانەوە(تنازع بقاء) بەرادەی پێویست توند بوایە، ئەوا بیروڕا راست و دروستەکان بەهێزتر و زۆرتر دەبوون. بەپشت بەستن بەوەها بۆ چوونێك لە بەرەوپێش چوونی فیکری و عەقڵی بەرەو حەقیقەت بوو کەمیل لە دەستپێکی دووهەمین بەشی"لە ئازادیدا" ئەم رستە بەرزانەی نووسی:"خراپەی تایبەتی بەرگرتن لە بڵاوبوونەوەی بیروڕای نەیار ئەوەیە کە دزی لە نەوعی مرۆڤ دەکرێ، تەنانەت ئەم دزییە زیاتر لەنەوەی داهاتوو دەکرێ تا نەوەی ئێستا، هەروەها ئەم دزییە زیاتر لە نەیارانی ئەو بیروڕایە دەکرێ تا ئەو کەسانەی کە بڕوایان بەو بیروڕایە هەیە. ئەگەر ئەو بیروڕایە دروست بێت، ئەوا ئەوان ئیدی ئەو دەرفەتەیان نابێ کە هەڵە لەگەڵ حەقیقەتدا بگۆڕنەوە، ئەگەریش ئەو بیروڕایە ناراست بێت، ئەوا کەڵکێك لە کیسیان دەچێ بەهەمان گەورەییەوە، واتە ئیتر ناتوانن بەشێوەیەکی روونتر لە حەقیقەت تێ بگەن کە لە خۆیدا ئاکامی رووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ هەڵە... ئەگەر هەموو مرۆڤایەتی جگە لە تاقە کەسێکیان لەسەر بیروڕایەك بوون و تەنیا کەسێك بڕوای بە بیروڕای نەیار هەبوو، هەر بەو شێوەیە ئەو تاقەکەسەش مافی ئەوەی نەبوو دەنگی مرۆڤەکان خامۆش بکا(ئەگەر لە دەسەڵاتدابوو)، مرۆڤایەتیش ئەو مافەی نەبوو دەنگی ئەو تاقە کەسە بنەبڕ بکا".

"سەبارەت بە تاکایەتی" سەردێڕی بەشی سێهەمی کتێبی "لە ئازادیدایە" پەیامی میل ئەوەیە کە هەرکام لە ئێمە دەبێ مرۆڤێکی وەها بین"کە خۆمان، خۆمان پێگەیاندبێت" بەو مانایەکە کەسێك بۆ خۆی شێواز بە بیروڕاکانی خۆی دەبەخشێ و بۆ خۆی بەرنامەی ژیانی خۆی رێك دەخا، نەك ئەو کەسەی کە بیروڕای پلە دووهەمی هەیەو بەوە رازیە کە لەگەڵ خەڵکی لە

بارودۆخێکی وەك یەکدا بژی. لەم بوارەدا، میل تەنانەت ئامادە بوو رێزی خۆی بەرامبەر بەو کەسانە دەربڕێ کە خاوەنی کردەوەی سەیرو سەمەرە بوون، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسانەش نەك بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی تاکەکەسی، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکانی دیکە جیاوازبن، کردەوەی سەیرو سەمەرە لە خۆیان پشان بدەن. میل دەنووسێ: "لەم دەورەو زەمانەیەدا، تەنیا ئەوەی کە کەسێك نموونەی جیاوازی بێت و، تەنیا لە بەرئەوەی لە بەرانبەر داب ونەریتەکاندا چۆك دانادا، خۆی لە خۆیدا خزمەتێکە." چون "ئیستبدادی بیروڕای گشتی" ئاکارو کردەوەی نائاسایی "بە شایانی لۆمەو سەرکۆنەکردن" دەزانێ. هەر بۆیە وا چاکە "خەڵکی خاوەنی ئاکاری سەیرو سەمەرە" بن. دەبێ ئاگامان لەوە بێت کە ئەگەرچی میل رای لەسەر ئاکاری سەیرو سەمەرە هەیە، بەڵام لەڕاستیدا تەنیا لەبەر ئەوە بەبایەخی دەزانێت کە داب ونەریتەکان تێك و مەکان دەدات، نە لەبەر خودی کردارەکە. ئەوەی میل بەراستی دەیەویست خودی ئەو ئاکارو کردەوە نامۆیانە نەبوو، ئەوشتەی ئەو دەیەویست کۆمەڵگایەك بوو کە تێیدا هەر تاکێك بەگوێرەی هێزو لێهاتووییەکانی خۆی بەشێوەی تایبەت بەخۆی بژی. ئەو بەڵگەو هۆکارانەش کەمیل لێرەدا دەیانهێنێتەوە هەر لەو بەڵگەو هۆکارانە دەچێ کە بۆ دیفاع لە ئازادیی رادەربڕین باسیان لێ دەکا، بەو مانایە کە هەر چەندە جۆراوجۆری و هاودژیی نێوان شێوەی ژیانی مرۆڤەکان زۆرتر بێت، ئەگەری پێشرەوی بەرەو دۆزینەوەی شێوەکانی باشتری ژیان پترە. میل دەنووسێ: "هەر بەو شێوەیەی کەتا مرۆڤ بە ئاستی کەماڵ وپێگەیشتوویی نەگەیشتووە، بوونی بیرو بۆچوونی جیاواز بەکەڵکە، هەروەك ئەوەیش بە کەڵکە کە تاقیکردنەوەی جۆراوجۆرسەبارەت بە ژیانی خەڵك لە ئارادا بێت، جگە لەمانە تا ئەو جێگایەی کە زیان بە خەڵکی دیکە نەگەیەنێ، ئازادانە مەیدان بدرێ بەکەسایەتیە جۆراوجۆرەکان. هەروەك تا ئەوکاتەی کەسێك بیربکاتەوە کە بایەخی شێوە جۆربەجۆرەکانی ژیان شایانی ئەزموون کردنە، بەکردەوە بسەلمێندرێ بەکورتی واشیاوە لەو کاروبارانەیدا کە پەیوەندی بەخەڵکانی دیکەوە نیە، تاکایەتی دەرفەتی خۆ دەرخستن بۆ بڕەخسێ."

لە سەریەك ئەو هۆکارانەی کە میل بۆ دیفاع لە ئازادی رادەربڕین دەیهێنانەوە قەناعەت هێنەرتر بوون لەو هۆکارانەی کە بۆ بەرگری کردن لە تاکایەتی دەیهێنانەوە.

ئەو تاقمە خوێنەرەی سەدەی *19* کەوایان هەست پێدەکرد ماشێنی هەڵم زیانی گەیاندووە بە ناوچە گوندنشینەکانی ئینگلتەرە، رەنگە لەسەر ئەو رایە نەبووبن کە پێویستە ئاسنگەر و قەشەو جوتیاری گوند بە تەواوی بە نەریتە فیکریەکانی خۆیاندا بچنەوەو بەپێی خواست و زانیاری و لە رێگای تاقیکردنەوەوە، سەر لەنوێ بۆ ژیانی خۆیان بەرنامەدابڕێژن.

من وەك خۆم را بیردەکەمەوە کە بیروبۆچوونەکانی میل سەبارەت بە ئازادیی رادەربڕین، لە بنەمادا راستەو، بەسەرکەوتنیان لە هەر شوێنێکدا کە مرۆڤە پێگەیشتووەکان(بالغ) دەژین، خۆشحاڵ دەبم. بەڵام بۆ چوونی میل سەبارەت بە تاکایەتی، بەرای من، زۆرتر خاوەنی بایەخی ریفۆرمیانەیەو لە هەر کوێیەکدا سەرکەوتن بۆ ئەو بیروباوەڕانە بێت کە لەدژی ئەم بۆ چوونەن، ئەوا دەبێ گوێی لێ بگیردرێ،

نەك ئەوەیكە لە جیاتی ئەوان سەركەوێ وزاڵ ببێ. لەراستیدا، بەپێی خودی بنەماكانی میل، ئێمە دەبێ لەپێك هێنانی شاینێك بە ناوی تاكایەتی دووری بكەین. بەگوێرەی ئەوبنەمایانە، فەزای بیروباوەڕە ئاكاریەكان تەنیا دەبێ بۆ ئەو كەسە دژوار بێت كە بەكردەوەكانی ئازاربە كەسانی دیكە دەگەیەنێ، نەك بۆ ئەو كەسەی كە ئازار بەهیچ كەس ناگەیەنێ، بەڵام هەر لەو كاتەدا بەو رادەیەی كە شیاوە لە ژیاندا ئازایەتی و مەیل بە تاقیكردنەوەو خۆ جیاكردنەوەو خۆ دەرخستن نیشان نادات. ئەگەر كەسێك بێ ئەوەی خۆی ئاگای لێ بێت، بەكاوە خۆ بە ژیانی ئاسایی وبێ ئازادی خۆی رابێت، بەگوێرەی ئەو بنەمایەی میل كەباس لە دەخالەت نەكردن دەكا، ئەوا ئەو ما فەمان نیە كە بە كەڵك وەرگرتن لە فشاری ئەخلاقی وڕۆحی، بەزۆر لەم جۆرە ژیانەی دوور بخەینەوە.

من گومانم لەوە هەیە كە میل بەراستی دەیویست خەڵكی بەرەو تاك گەرایی هان بدات و وەهایان لێ بكات كە لەگەڵ ئەوانی دی جیاواز بن. ئەو پێش لە هەرشتێ دەیویست كە خەڵكی لە بازنەی بیروڕای گشتی گرفتار نەبن و تاكایەتی خۆیان لە دەست نەدەن و واز لە لاسایی كردنەوەو یەكدەنگی بهێنن. رەنگە میل ئەوەی قبوڵ دەكرد كە بەڵگە هێنانەوەی بۆ دیفاع لە تاكایەتی تاڕادەیەك یەك لایەنەیە، چونكە تێیدا دان بەوەدا نانرێ كە بوونی داب و نەریتە ئامادەكان كە دەتوانین پەیڕەویان لێ بكەین، بێ ئەوەی كە هەر جارەی مەجبوور بین بە گوێرەی بنەما سەرەتاییەكان بیربكەینەوە كە چ رەفتارێكمان لەم بوارەدا هەبێ، تا چ رادەیەك یارمەتی دەگەیەنی بە كەم كردنەوەی كات و زەحمەتەكانمان. لەبیرمان بێت كە بەوتەی خودی میل: "تا ئێستا قەت هیچ كارێك بە ئەنجام نەگەیشتووە كە كەسێك بۆ یەكەم جار ئەنجامی نەدابێت. هەر شتێكی چاك كە لە گۆڕێدایە ئاكامی داهێنان و بیركردنەوەی داهێنەرانەیە."

هەروەها دەكرێ ئەوە قبوڵ بكەین كە هەركام لە شێوە باوەكانی رەفتار، توانای چاكسازیی تێدامەیە. بەڵام، لە لایەكی دیكەوە، نابێ لە بیرمان بچێتەوە كە لە هەوڵماندا بۆ چاكسازیی لە هەرشێوەیەكی كردار یا دامەزراوەیەكدا، دەبێ كەڵك وەربگرین لە جۆرەها شێوەی كردەیی و ئەو دامەزراوانەی كە جارێكە نامانەوێ چاكسازییان تێدا بكەین. دەكرێ سەرەتا فیسارە نەریت لاببەین و دواتر نەریتێكی دی، بەڵام ناتوانین بەیەكجاری هەموو نەریتەكان لابەرین. وا بیردەكەمەوە میل بە ئەگەرێكی زۆر لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا بوو.

ئەگەر "هاریت" هاوسەرەكەی میل نەمردبوو، پێش لە بڵاوبوونەوەی كتێبی "لە ئازادیدا" جارێكی دیكە پێیدا دەچوونەوە. ئەگەر لە ئێمەیان پرسیبا حەزتان دەكرد بە چ شێوەیەك پێیدا بچنەوە، چ وەڵامێكمان دەدایەوە؟

من پێش لە هەر شتێك حەزم دەكرد میل و هاوسەرەكەی بە وێنە جۆربەجۆرەكانی "بنەمای زۆر سادە"دا بچنەوە، واتە ئەو هەوڵانەی كە دەیاندا سەبارەت بە دیاریكردنی سنوور لە نێوان ئەو شتانەی كە لە ژێر دەسەڵاتی تاكدان و ئەوانەی وا لە قەڵەمڕەوی كۆمەڵدان. هەندێك جار میل سنوورێك لە نێوان دوویەشی ژیانی تاك دادەنێ: یەكەم ئەو بەشەی كە تەنیا پەیوەندی بە تاك خۆیەوە هەیە (یان بەوتەی میل "ئەو هەڵس و كەوتانەی كە تەنیا تاك دەگرێتەوەو پەیوەندیی بە خۆیەوە هەیە")، دووەم ئەوەی كە بەخەڵكی دیكەوە پەیوەستە. میل دانی بەوەدا

دەنا کە رەنگە هەندێك لە خەڵکی ئەم جیاوازی دانانە لە کردەوەدا بە نەشیاو بزانن و خودی خۆی یەکەمین کەس بوو کە رەخنەی لەوەگرت (ئەو رەخنەیەی کە دواتر زۆر جاران لەلایەن رەخنەگرەکانەوە دووپات کرایەوە). میل دەنووسێ: "رەنگە بپرسن چلۆن هیچ بەشێك لە رەفتاری یەکێك لە ئەندامانی کۆمەڵ دەتوانرێ لای ئەوانی دی گوێی پێ نەدرێ؟ هیچ کەس بە تەواوی بوونەوەرێکی جودا و دابڕاو نیە، مەحاڵە کەسێك کارێك بکا کە زیانێکی جیددییان بەردەوامی پێ بگەیەنێ، بێ ئەوەی کە ئەو زیانە لانیکەم خزمەنزیکەکانی بگرێتەوە (کە زۆر جاران لەوانیش واوەتر دەگرێتەوە)... وای دادەنێین کە کەسێك بە تایبەتمەندییە خراپەکانی خۆی یاخود بە بێ عەقڵیی خۆی راستەوخۆ زیان بە خەڵکانی دیکە نەگەیەنێ، رەنگە دیسان بڵێن بەو نموونەیە کە پێشکەشی دەکا لە راستیدا زیان دەگەیەنێ."

هەروەك میل بۆ خۆیشی گوتی، کاتێك جیاوازییەکی وەها دابنرێ، جگە لە دەسەڵاتی تاك بەسەر بیرو هەستی تایبەتی خۆیدا، ئیتر کەمتر شتێکی دیکە بۆ تاك دەمێنێتەوە. بەڵام هەر بەو جۆرەی کە جی. سی. ریس (نووسەری کتێبی میل و یەکەم رەخنەگرەکانی")1 پێی لەسەر داگرتووە، ئەو جیاوازیەی کە میل پێی قایلە، لەنێوان ئەو رەفتارەیە کە زیان بە بەرژەوەندی خەڵکانی دیکە دەگەیەنێ و ئەو رەفتارەی کە زیان ناگەیەنێ. ئەم جیاوازیە بوارێکی بەربلاوتر بۆ تاك دێڵێتەوە، چونکە رەنگە رەفتارێك کاریگەری سلبی هەبێ بۆ خەڵکانی دیکە، بێ ئەوەی زیان بە بەرژەوەندییەکانیان بگەیەنێ. ئەگەر کەسێك خۆشەویستی کەسێکی دی بۆ لای خۆی رابکێشێ، رەنگە تارادەیەکی زۆر نارەحەتی بکا، بەڵام ناتوانین بڵێین کە زیانی بە بەرژەوەندیی ئەو کەسە گەیاندووە، بەو مانایەکە کاتێك کرێکارێك لە یەکیەتی کرێکاران دەردەکەن، ئیتر ناتوانێ کەڵك لە تواناکانی خۆی وەربگرێ و هەر بۆیە زیان بە بەرژەوەندیەکانی دەگا. هەندێك جار میل کەمێك دەچێتە پێشتر و جیاوازی دادەنێ لە نێوان رەفتارێك کە دەبێتە هۆی زیان گەیاندنی حەتمی بە بەرژەوەندیەکانی ئەوانی دی (یان مەترسیی زیانێکی لەم چەشنە دێنێتە گۆڕێ)و، ئەو رەفتارەی کە ئەم زیانە ناگەیەنێ. ئەم جیاوازیە دیسان مەیدان بۆ تاك بەرفراوانتر دەکا. بۆ وێنە ئەگەر کەسێك لە بورسدا بەیەکجاری رادەیەکی زۆر "سهام"** بفرۆشێ و ببێتە هۆی دابەزینی کەمی نرخی "سهام"، ئەگەرچی کاریگەری سلبی دەبێ بۆسەر پشکدارەکانی دی، بەڵام ناتوانین بڵێین کە زیانێکی حەتمیی بە ئەوانی دیکە گەیاندووە.

وای دادەنێین میل چەند وێنەیەکی یەککرتوو و بەدوور لە هەر چەشنە کەم و کوڕی لەجیاتی ئەم وێنانەی کە داویەتی پێشکەش بکات، وەها کە بێ هیچ ناسازگارییەك لەگەڵ فیکری سەرەکی ئەو، زۆرترین ئیمکانی بەتاك دەدا. داخۆ ئەو وێنە یەککرتووانەش بنەمای پێویستی بۆ بەرگری کردنی ئەو لە ئازادیی رادەربڕین و چاپەمەنیەکان دابین دەکرد؟

بڕواناکەم. خودی میل ئەوەی قبوڵ بوو کە بەحەق هەندێك جار مومکینە ئازادیی رادەربڕین سنووردار بکرێ. وای دابنێین کەسێك وتارێك لە رۆژنامەیەکدا بڵاودەکاتەوەو بەڵگەش بێنێتەوە کە ئەوە بازرگانانی دانەوێڵەن کە دەبنە هۆی برسیەتی هەژاران. میل دەڵێ نابێ رێگا لە نووسەری وتارەکە بگرین، بەڵام هەر لەو کاتەدا دەڵێ ئەمە جیاوازیی هەیە لەگەڵ پێشکەش

کردنی ئەو بەڵگانە لە وتارداندا بۆ ئەو بەرەڵڵاهەڵچوونانەی کە لە بەرانبەر ماڵی فیسارە بازرگانی دانەوێڵەدا کۆبوونەتەوە. بەرای میل کردەوەیەکی لەم چەشنە "بەراستی شیاوی سزادانە".

بەڵام رەنگە کتێبێکمان هەبێ کە بتوانرێ پێش بینی ئەوە بکرێ تا چ ماوەیەك لە دوای بڵاوبوونەوەی زیانێکی چەند قات زۆرتر دەگەیەنێ لە چاو ئەو زیانەی کە وتاربێژی ناوبراو لەبەردەم ماڵی بازرگانی دانەوێڵەکەدا دەیگەیاند. داخۆ دیسان بەگوێرەی ئەو بنەمایانەی کە میل دایناون، کۆمەڵگا مافی بەرگرتن بە بڵاوبوونەوەی ئەو کتێبەی لە ئەستۆ نیە؟ یان ئەو زنجیرە وتارە زانستیانە بێننە بەرچاوتان کە بوونە هۆی دروست بوونی بۆمبی ناوکی. داخۆ نەدەبا بەر بەبڵاوکردنەوەی ئەو وتار و لێکۆڵینەوانە بگیرایە؟

پێشتر گوتم میل کاتێك لایەنگری لە ئازادی دەکا، لە بەڵگە هێنانەوەی خۆیدا پێ لەسەر سێ بنەمای جودا دادەگرێ: یەکەم، بنەمای بەقازانج بوون. دووهەم: بنەمای دەخالەت نەکردن لەو کردەوانەدا کە بۆ خودی کەسەکە دەگەرێتەوە.(8). سێهەم، ئەو بنەمایەی کە رەنگە ناوی بنرێ گەران لەدوای حەقیقەت (بەو مانایەکە بەرگرتن لە دەربڕینی هەر بیروڕایەك، جا ئەو بیروڕایە چ دروست بێت چ نادروست، خیانەتە بە حەقیقەت). من بە تەواوی لەسەر ئەو بڕوایەم کە هەردوو بنەمای یەکەم و دووهەم، نە بە تەنیاو نە پێکەوە، هێزی پێویستیان نیە بۆ سەلماندنی قسەکانی میل، لەراستیدا میل بەپشت بەستن بەوانە، بناخەی قسەکانی خۆی شل کردووە. وای دابنێین میل هەندێك لە خۆی دوور دەکەوتەوەو ئەو دوو بنەمایەی سەرەرای لێك نزیك بوونی جوان و زۆر بایەخداریان لە حەقیقەت تارادەیەك عەیبدار دەبینی، جا لەم کاتەدا، چۆن دەکرا پاساوی ئەم پێشنیارە بداتەوە کە نووسراوە سیاسیە مەترسیدارەکانی وەك راگەیەندراوی کۆمۆنیستی (مارکس و ئەنگلس)، یان بەرهەم گەلی مەترسیداری وەك وتارەکانی ئەنشتاین و نیلس بور و فریش (مەترسیدار لەروانگەی تەکنەلۆژیەوە) دەبێ سانسور بکرێن؟ رەنگە بەم هۆکارانە: "گەران لە دووی حەقیقەت کارێکی پڕ مەترسیە. رەنگە هەندێك کەڵکی بۆ کۆمەڵگا هەبێت، بەڵام رەنگە مەترسی گەورەشی هەبێت. ئێمە ناتوانین بەر بە لێکۆڵینەوەی مرۆڤ بگرین وەها کە هیچ مەترسیەکی نەبێت و تەنیا قازانج بگەیەنێ. کەواتە یان دەبێ واز بە حەقیقەت خوازی بێنین یان مەترسیەکانیش قبوڵ بکەین. تەنانەت ئەگەر واز هێنان لە حەقیقەت خوازی لەبەر سەلامەتی و ئاسایش ئیمکانی دەبوو، هێشتا بەمانای لە خوارەوە بوونی پلەو پایەی مرۆڤ بوو. نابێ گومانمان هەبێت (هەروەك خوێندنەوەی ئەو رستەدەست لێنەدراوانەی وا لە کتێبی "لە ئازادیدا"ن بەرەو ئەم گومانەمان ببات) کە ئازادی هەروا بە خوت و خۆڕایی بەدەست دێت. دەبێ لەوە تێ بگەین کە رەنگە ئازادی زۆر گران بۆمان تەواو ببێ، دەبێ ئامادە بین بۆ پێشکەش کردنی ئەو نرخە گرانە."

سەرەرای هەموو ئەمانە، لە بیرمان بێت کە ئامانجی میل بریتی بوو لە بەڵگە هێنانەوە بۆ لایەنگری لە ئازادی. ئەم بەڵگە هێنانەوەیەش قورسایی و گرانیی خۆی هەیە. بەڵام کاتێك کەسێك بەمەبەستی لایەنگری لە بنەمایەك بەڵگە دێنێتەوە کە لای ئەو زیاتر لە هەرشتێکی دیکە بایەخدارتر بێت، ئەوا دیاردەیەکی نامەعقول روو دەدات. قایل بوون بە بنەمایەکی وەك ئەلف فەرقی هەیە لەگەڵ بەڵگەهێنانەوە بۆ لایەنگری

کردن لێی. بەڵام کەسێك کە بیەوێ بەلایەنگری بە ئەلف بەڵگە بێنێتەوە، دەبێ پشت بەستێ بە بنەماکانی دیکەی وەك ب و ج. بەڵام ئەلف لای ئەو لە هەموو بنەماکانی دیکە بایەخدارتر بێت، کەواتە ب و ج لەلای وی کەمتر بایەخیان هەیە. کەواتە، بنەمای سەروتر لەسەر بناغەی بنەماخوارترەکان شی دەکرێنەوەو، رەنگە بنەما خوارترەکانیش بۆ شیکردنەوەیەکی کاریگەر تەواو نەبن. من وا گومان دەکەم، لە بەڵگە هێنانەوەی میل بۆ لایەنگری لە ئازادی شتێکی لەم بابەتە رووی داوە و ئەمە بووەتە هۆی ئەو گرفتانەی کە هاتوونەتە پێشەوە.

بەڵام "لەئازادیدا" سەرەڕای هەموو کەم و کوڕیەکانی هێشتا کتێبێکی گرنگە، بەتایبەت بۆ لایەنگرانی دیموکراسی. ئەم کتێبە هەندێك مەیلی شاراوەی "ئازادی کوژ" لە دیموکراسی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئاشکرا دەکا و لەم رێگایەوە یارمەتیمان دەدا بۆ کۆنتڕۆڵ کردنیان.

## پەراوێزەکان:

*J. W. N. Watkins, "John Stuart mill and the Liberty of the Individual."

1-John stuart mill, on Liberty

2-Autobiography

3-Alexis de Tocque Ville, Democracy in America.

4-The Edinburgh Rewiew.

5-R. B. Mccallum.

6-J. C. Rees, mill and Early Critics (London, 1956)

7-اصالت سودمندی

**سهم: پشك

8-واتە ئەو کردەوانەی کە رادەربڕینەکانی ئەو کامڵ دەکەن لە زیان پێگەیاندن بە بەرژەوەندیی خەڵکانی دیکە.

## سەرچاوە:


خرد در سیاست - ترجمه: عزت الله فولادوند، ص ص 107 - 120.

# ڕوشدیزم
# یان ڕۆشنگەری خەفەکراوی ئیسلام

• خوێندنەوەی: شاهۆ سەعید

*ناوی کتێب : ئیبن روشد.. ژیننامەو فیکر*
*ناوی نووسەر: د. محمد عابد الجابري*
*بڵاوکراوەی : مرکز دراسات الوحدة العربية*
*بەیروت: چاپی یەکەم/1998*

ئیبن روشد ئەو فەیلەسوفەیە زۆر ناوی دەبیستین‌و کەم دەربارەی دەزانین، زۆر جار ئاماژە بۆ گرنگیی پێگەی لە نەخشەی فیکری ئیسلامیدا دەکرێ‌و کەمجار پەنجە دەخرێتە سەر گەوهەری ئەو گرنگیە. بەشێکی زۆری سەرسامی ئێمە بەرامبەر ئەم فەیلەسوفە دەگەڕێتەوە بۆ سەرسامیی خۆرهەڵاتناس‌و بیریارە خۆرئاواییەکان بەرامبەری.. ئەمەش قەیرانێکی ڕاستەقینەی کەلتوری ئێمەیە، کەلتورێك تەنها جوانی‌وگەورەیی لەچاوی کەسانی‌دیکەوە دەبینێ‌و،


مركز دراسات الوحدة العربية

ابن رشد
سيرة وفكر
دراسة ونصوص

ئەو کاتە پەی بە خەزنە فیکریەکانی خۆی دەبا کە پێشتر کەسانی تر بۆیان ئاشکراکردبێت و لەسەر سینییەکی زێڕ پێشکەشیان کردبێ.

لێرەوە بیریاری ناسراوی عەرەب(د. محمد عابد الجابری) بایەخ و گرنگیی پرۆژەیەکی فیکریمان پێدەڵێ بۆ بوژاندنەوەی روشدیزم و کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی دەقە فەلسەفی و فیقهی و زانستیەکانی ئیبن روشد، چونکە بەبڕوای ئەو قەیرانی شوناسی فیکری عەرەب و ئیسلام، دیاردەی ئیسلامی سیاسی هاوچەرخ و، تەوژمی توندوتیژی ئاینی و مەزەبی لە کۆمەڵگا ئیسلامی و عەرەبیەکاندا سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بێتوانابیمان لە ئاشکراکردنی گرنگترین تەوژمی ئەقڵانی فیکری ئیسلام کە بریتی یە لە روشدیزم و ئیبن روشد نوێنەرایەتی دەکا، ئەو تەوژمەی گەر ئاڵۆزی و پاشاگەردانیی سیاسی سەردەمەکەی لێگەڕایە دەبووە هەوێنی رێنیسانسێکی ئیسلامی و، کەلتوری ئیسلامی دەکردە میراتگری فیکری یۆنانی، لەهەمووشیان گرنگتر عەقیدەی ئیسلام و فەلسەفەی ئەقڵانی لە گەڵ یەکدا ئاشت دەکردەوە و ئەو کەلێنەی نێوانیانی پڕدەکردەوە کە بەهۆی تەشەنەسەندنی ئایدیالیزمی ئیسلامی لە خۆرهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا دروست ببوو.

جگە لە ئیبن روشدی فەیلەسوف، ئیبن روشدی فەقیهو موشەرریع هەیە کە هەست بەو بنبەستیە دەکا کە فیقهی ئیسلامی بەرەو ڕووی دەچێ و، زۆر رادیکاڵانە دەست دەداتە پرۆژەیەك بۆ راستکردنەوەی باری ئیجتهادو، نوێکردنەوەی شەرع و سنووردارکردنی جەبەروتی زانستی عەقیدەو کەلام، کە ئاینی ئیسلامی بە ئاقارێکی دوور لە ئەقڵانیەتدا دەبرد. هەر بۆیە (جابری) بڕوای وایە تاقە فەلسەفەیەکی ئیسلامی کە توانای هەبێت لەم سەردەمەدا درێژە بەژیان بداو هاوتەریب لەگەڵ فیکری جیهانیدا گەشە بکا تەنها فەلسەفەی روشدیزمە.

### *ژیان و ئاکاری فەیلەسوف*

مێژووی ژیانی ئیبن روشد تەنها مێژووی زاناو فەیلەسوف و ریفۆرمیستێکی فیقهی نیە، بەڵکو مێژووی مرۆڤێکە هەوڵی داوە فەلسەفەو فیکر لە تاق و ڕەفەی کتێبخانەکان دابگرێ و لە ژیانی رۆژانەو ئاکاری تایبەتی خۆیدا پراکتیزەیان بکا، چونکە ئەو بڕوای وابوو کە فەزیلەت و چاکسازی لە یاسا باوەکان و مۆراڵی کۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسیدا دوا غایەتی فەلسەفەو ئیجتهادن، بۆیە هەرزوو ئەم فەیلەسوفەمان توشی ڕووبەڕووبوونەوە بوو لەگەڵ گوتاری شەرعی و عەقاندیی باڵادەستی کلتوری ئیسلامیدا، ئەو گوتارەی کە هەمیشە لە هەوڵی ئەبستراکت کردنی فیکرو فەلسەفەدا بووە بە مەبەستی خۆدزینەوە لە شەڕە مەعریفیەکان و سازشکردن لەگەڵ دەسەڵاتی خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامیداو، تەنازولکردن لە سەرمایە مۆراڵیەکان بەرامبەر سەرمایە مادی و سیاسیەکان.

هەر بۆیە نووسەر گرنگیەکی زۆری بە ژیاننامەو ئاکاری تایبەتی ئیبن روشد داوە، فەسڵەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمی کتێبەکەی بۆ ئەو لایەنە تەرخان کردوە. لە فەسڵی یەکەمدا کە لەژێر ناونیشانی (خوێندن و خولیایەکی بیداگۆجی)دایە نوسەر ئاماژەیەکی زیرەکانە دەکا بۆ گەورەیی و تەوازعی گەورەترین فەیلەسوفی ئیسلام و تاقە فەیلەسوفی جیهان لە چاخەکانی ناوەڕاستدا، دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئاکاری تایبەتی ئیبن روشد ئەو فەیلەسوفەی بە ئاقارێکدا بردووە زۆر لەخۆبردوو بێت و هەموو

خۆپەسندییەك لە خۆیدا بکوژێ، چونکە لەکاتێکدا غەزالیو ئیبن سینا کە دووزانای ئیسلامیی دژ بە بەرەی فیکری ڕوشدیزم بوون ژیننامەی خۆیان بەووردی تۆمار کردووە تاخۆیان لە ژیاندا بوون.. ئیبن ڕوشد هیچ لاپەڕەیەکی دەربارەی ژیانی تایبەتی خۆی بەدەستو قەڵەمی خۆی لەدوای خۆی بەجێ نەهێشتووە. بەڵام ئەوەندە بەسە بۆ ئیبن ڕوشدو ڕوشدیزم کە سنوری تەقلیدی کلتووری ئیسلامیان بەجێهێشتووەو بوونەتە هەوێنی ڕوشدیزمی لاتینی کە لە چاخی سیازدەهەمەوە تا چاخی هەژدەیەمی زاینی لە ئەوروپادا لە بەرەوی فیکردا بووەو، چەندین شەڕی مەعریفیو عەقڵانی گەورەی لە دژی دەسەڵاتی غەیبیانی کەنیسە بەرپاکردووە، تا ئەو ئاستەی کەنیسە بڕیاریدا هەڵمەتێکی کوێرانە دژی ئیبن ڕوشدو پەیڕەوانی ڕوشدیزم لە ئەوروپا بەرپا بکا.

نوسەر دوای ئەوەی ئاماژەی بۆ نەسەبو بنەماڵەی فەیلەسوف دەکا باس لە کاروانی خوێندنو وانە وتنەوەکانی دەکا، کە شێوەیەکی سیستماتیکی بەخۆوە بینیوەو، بەسەر هیچ زانستێکی ئەو سەردەمەدا بازی نەداوە. لەتەمەنی *23* ساڵیدا هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردوەو شارەزایی تەواوی لە زانستەکانی تەفسیرو شەرعو زمانو بەلاغەو ئەدەبیاتو شیعردا پەیداکردووە، بەڵام ئەوەی کە ئەم خوێندەوارە گەنجە لە هاوتەمەنو تەنانەت لە مامۆستاکانیشی جیادەکاتەوە ئەو بایەخدانە پێشوەختەیەتی بە زانستی (لۆجیك ***Logic***)ی ئەرستۆو ماتماتیكو ئیلاهیاتو زانستی پزیشکیو فەلسەفەی میتافیزیکیو فیکری بورهانی یۆنانی، دواتر گرنگیەکی تایبەت دەدا بە دەقەکانی ئەفلاتونو ئەرستۆ، بەڵام بە پێچەوانەی ئەفلاتۆنەوە کە گرنگیەکی زۆر بە ماتماتیك دەدا لە نێو زانستەکاندا، ئەو بڕوای وایە کە پێویستە خوێندەواری ڕاستەقینە جگە لە زانستە تەقلیدیەکان شارەزاییەکی تەواوی لە لۆژیكو ئەندازەو مۆسیقاو میتافیزیکدا هەبێت، لەپێناو فراوانکردنی ئاسۆکانی بیرکردنەوەو خستنەگەڕی ئەقڵ، ئیتر لەوێوە ئیبن ڕوشد بنەماکانی فەلسەفەی بەڵگەگەری لەزەینیدا دەخەملێ کە دواتر وەك قوتابخانەیەکی فیکری خۆی نومایش دەکا کە پێیەکی لەشەرقی ئیسلامیدایەو پێیەکەی تری لە غەربی ئەورووپیدایە.

لە فەسڵی دووەمدا نوسەر باس لە چالاکیە پەروەردەییو کۆمەڵایەتیەکانی ئیبن ڕوشدو پەیوەندیەکانی لەگەڵ خەلیفە (ئەبو یەعقوب موتەنەوین)دا دەکا. دوای ئەوەی ئیبن ڕوشد بەشداری لە داڕشتنی بەرنامەیەکدا دەکا بۆ خوێندنو وانەوتنەوە لە مەراکشداو بەشداری لە پڕۆژەیەکی کلتوریدا دەکا بۆ پێشخستنو بنیاتنانی عەقیدەیەکی ئاینی دروست کە ئاستێك بۆ لایەنگیری خێڵەکی دابنێت لە دەوڵەتی ئیسلامیدا.. ساڵی ***548ه*** کاتێ تەمەنی ***30*** ساڵ دەبێ (قورتوبە) جێدەهێڵێو ڕوودەکاتە (ئەشبیلیە) پاشان بۆ یەکەمین جار چاوی بە ئەمیر(یوسف بن عبد المؤمن) دەکەوێو، بەگوێرەی هەندێ سەرچاوەش دوای ئەوەی پەیوەندیەکی باش لەگەڵ ئەمیردا دروست دەکا، بەهۆی شارەزایی زۆریەوە لە زانستەکانی فیقهو شەرعو دادوەریدا، لەو تەمەنە گەنجەدا بۆ یەکەمین جار دەبێتە دادوەری ئەشبیلیە. هەروەها دەگێڕنەوە گوایا هەرچەندە ئیبن ڕوشد لەسەرەتای ژیانیدا شارەزاییەکی زۆری لە فەلسەفەی یۆنانیدا هەبووە، بەڵام هەرگیز وەك شارەزایەکی ئەو بوارە خۆی نیشان نەداوەو هەندێ جار لەبەر شەرمو هەندێ جار لەبەر تەوازوع نکوڵی لەوەکردوە کە ئاگاداری فەلسەفە

بێت، بەتایبەتی سەردەمی ئەو سەردەمی هێرشێکی بەربڵاوی هەندێ لەزانایانی ئیسلام بوو بۆ سەر فەلسەفە بەگشتیو فەلسەفەی یۆنانی بەتایبەتی. بەڵام یەکترناسینی سیاسیو فەیلەسوف، واتە ئەمیرو ئیبن روشد، خاڵێکی وەرچەرخان بوو بۆ هەردوو لا چونکە ئەمیر تەنها سیاسیەکی خاوەن دەسەڵات نەبوو بەڵکو شارەزایی لە زانستو فیکری سەردەمەکەیشیدا هەبوو، تەنانەت یەکەم کەس بوو داوای لەئیبن روشد کرد فەلسەفەی ئەرستۆ شیبکاتەوە بەشێوەیەك لە ئاستی تێگەیشتنی خەڵکیدا بێت.. لەبەرامبەردا ئیبن روشد کەلاوێك بوو خەونی بەبڵاوکردنەوەی فیکرو زانستی بورهانییەوە دەبینی لەنێو عەوامی خەڵکدا هەرزوو پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ ئەمیردا پەیداکردو، ستراتیجی دەسەڵاتو جیهانبینی ئەوی بە ئاراستەیەکدا برد کە ڕێز بگەڕێنێتەوە بۆ فەلسەفەو خاوەنی دووربینیەکی کلتوری بێت. ئیبن روشد لەزۆر شوێندا سەنای ئەبو یەعقوبی یوسفی کردووەو بە دەسەڵاتدارو سیاسیەکی رۆشنگەری لەقەڵەم داوە.. بەگوێرەی هەندێك سەرچاوەش ژمارەیەك لەکتێبە گرنگەکانی بە ئاگاداریی ئەو نوسیوە.

بەڵام هاوکێشەی ئەم پەیوەندیە هاوسەنگەی نێوان خەلیفەو فەیلەسوف، تا ئەو شوێنە بەردەوام دەبێت کە خەلیفە ئەبویەعقوبی یوسف لە ژیاندا دەبێ، بە مردنی ئەو سەردەمی یەعقوبی مەنصوری کوڕی دەست پێدەکا، واتە سەردەمی پاشەکشەی دەسەڵاتی سیاسی لە بواری بنیاتنانی ئەو تەلارە کەلتورییەی کە لەسەردەمی خەلیفە موتەنەویری باوکیدا لە ئارادابوو. خەلیفە موتەنەویری باوکید لە ئارادا بوو خەلیفەی تازە نەك هەر درێژەی بە پرۆژەکانی باوکی نەدا بەڵکو بەپێچەوانەوە ستراتیجی کەلتوریی دەوڵەتی ئیسلامی گۆڕیو، لە جێی لۆژیكو زانستە سروشتیەکانو فەلسەفەی بەڵگەگەری، دەستی دایە ژیاندنەوەی ئایدیالیزمی ئیسلامیو زوهدگەریو لەشکرێکی لە پەیڕەوانی ئەهلی سەلەفو تەقلید دژی پەیڕەوانی ئەهلی ڕەئیو فیکری ئەقڵانی بەڵگەگەری دامەزراند، کە بێگومان ئەوە خاڵی سەرەتای ساردبوونەوەی پەیوەندیی نێوان خەلیفە مەنسورو ئیبن روشدی فەیلەسوف بوو کە خەونی بە لەدایکبوونی ڕێنیسانسێکی سیاسیو رۆشنگەرییەکی فیکرییەوە دەبینی. بەڵام خەلیفەی تازە نەك هەر خەونی ڕێنیسانسێکی سیاسی موتوریەکراو بەفیکری ئەقڵانی لە باربرد، بەڵکو گەورەترین تەنگژەو قەیرانی بۆ خۆیو دەسەڵاتەکەی دروست کرد کاتێك کەوتە دژایەتیکردنی فیکری بەلگەگەری، فەرمانیدا بە سوتاندنی کتێبەکانی ئیبن روشدو، بۆ ماوەی ساڵێك لە گوندی (ئەلیسانە)ی نزیکی قورتوبە ئیبن روشدی بەدەستبەسەری هێشتەوە.

بەگوێرەی هەندێ سەرچاوە خەلیفە چەند جارێك ویستویەتی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئیبن روشدا ئاسایی بکاتەوە، بەڵام ئیبن روشد کە خاوەنی ئاکارێکی تایبەت بووەو پارێزگاری لەسەرمایەی مەعنەوی خۆی کردووە تەسلیمی فریوی سیاسیو مادی نەبووە، هەرگیز پەیوەندی خۆی لە گەڵ دەسەڵاتی سیاسی ئەو سەردەمەدا نەگایاندۆتە ئاستێك ناچاری بکا سازش لە هەڵوێستە مەعریفیو فیکریەکانی خۆی بکا، تەنانەت زۆر جار لە زۆر شوێندا هێرشی توندی کردۆتە سەر ئەو دەسەڵاتە سیاسیانەی کە پشت دەکەنە عەوامی خەڵكو شێوازی سزادانی قورسو پاکتاو کردن پەیڕەو دەکەن لە حوکمدا.. چونکە بەبڕوای ئەو دوو جۆر مۆدێلی دەسەڵاتی سیاسی لە ئارادان، یەکێکیان مۆدێلی (شاری



محەمەد عابد ئەلجابری

فەزیلەت)ە کە خوازیاری پەیوەندییەکی هاوسەنگی نێوان دەسەڵاتداران و ڕەعیەتە، ئەوی تریان مۆدێلی (شاری زۆرەملێ)یە کە پەیوەندییەکانی ناوی هاوسەنگ نین و، کەسی دەسەڵاتدار تیایدا بە پێچەوانەی خواستی ڕەعیەتەوە حوکم دەکاو، هەوڵ دەدا هەموو دەسەڵاتەکان لە خۆیدا کۆبکاتەوە.

کاتێ ئیبن روشد بەراورد لە نێوان هەردوو مۆدێلی دەسەڵاتی سیاسی(شاری فەزیلەت)و(شاری زۆرەملێ)دا دەکات حیکایەتی چارەنووسی مۆدێلی شاری دووەممان بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (پاش ئەوەی خەڵکی ئەو شارە دەبینن سەرۆکی شارەکەیان بە پێچەوانەی خواستی ئەوانەوە حوکم دەکا(...) هەوڵ دەدەن شاربەدەری بکەن، بەڵام ئەو لەبەرامبەردا هەموویان چەك دەکاو دەیانکاتە کۆیلەی خۆی، ئیتر خەڵکی ئەو شارە—هەروەك پەندەکە دەڵێ خۆیان لە دۆزەخدان و کەچی پەنا بۆ ئاگریش دەبەن، بەو مانایەی ئەوان خۆیان لەدەست کۆیلە بوون ڕاپانکردووە کە چی لە ئەنجامدا دەکرێنەوە بە کۆیلە ....). بەڵام فەیلەسوفەکەمان تەنها گرفتی لەگەڵ ئەم جۆرە مۆدیلەی دەسەڵاتدا نیە، بەڵکو گرفتی لە گەڵ ئەو جۆرە زانا ئایدیالی و فەقیهو موشەریعانەشدا هەیە کە بێ فەنتازیایەکی ڕوو لە ئایندە وانەی مامۆستاکانی سەلەف دەڵێنەوەو، شەڕێکی بێ ئامان دژی ئیبن روشدو روشدیزم بەرپا دەکەن، بۆیە (جابری) لە کۆتایی ئەم فەسڵەدا ئیبن روشد ناو دەنێ (فەیلەسوفێك لەنێو دڕندەکاندا).

*فەلسەفەو ریفۆرمی فیقهی*

لە سەردەمی خەلیفە مەنسورەوە ئیتر ئیبن روشد لە زۆربەی چالاکیە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی دادەبڕێ و، دەچێتە گۆشەگیریەکی تەواوەوە بۆ دەستپێکردنی پڕۆژەیەکی مەعریفی گەورە لە بواری عەقیدەو فەلسەفەو فیقهو زانستە سروشتیەکاندا، ئەو پڕۆژەیە بەڕاستکردنەوەو ریفۆرم لە بواری فیقهدا دەست پێدەکاو، بە فەلسەفەو زانستە سروشتیەکاندا تێدەپەڕێ و بەڕاستکردنەوەو ریفۆرم لە سیاسەت و فیکری سیاسیدا کۆتایی پێدێت. ئەو بەپێچەوانەی ئەو زاناو بیریارانەوە کە لە کۆتایی ژیانیاندا دەچنە کونجی موحافزکاریەوە.. بە ڕۆحیەتێکی پڕ لە ڕادیکاڵیەتەوە داو ڕۆژەکانی تەمەنی دەژی و، ڕووبەڕووی ئەو تەوژمی نانەقلانیەتە دەبێتەوە کە بەردەوام تەشەنە دەکاو، دزە دەکاتە ناو عەقڵیەتی حوکم و گوتاری سیاسی خەلیفەوە، بۆیە ئیبن روشد پڕۆژە فیکریەکەی لە بواری ڕاستکردەوەنەدا بە تیۆریزەکردن بۆ ریفۆرمی

فیقهی دەست پێدەکات لە کتێبێکدا لە ژێر ناونیشانی (پێداویستیەکانی ئسوڵی فیقهـ) و، بەتیۆریزەکردن بۆ ریفۆرمی سیاسیش کۆتایی پێدێنێ لە کتێبێکدا لەژێر ناونیشانی (پێداویستیەکانی سیاسەت).

لەپشت ئیبن روشدی فەقیهو زانای سروشتییەوە.. هەمیشە ئیبن روشدی فەیلەسوف دەبینین کە لۆژیکو فەلسەفە بەداینەمۆی هەموو مەعریفەو فەزیلەتێك دەبینێ لە هەموو بوارو کایە جیاوازەکاندا. چونکە ئەو پێش ئەوەی پرۆژەی ڕاستکردنەوەو ریفۆرمی مەعریفی دەست پێ بکا شۆڕشێکی فیکری لە سەرتاسەری کەلتوری ئیسلامو خۆرئاوا بەرپادەکا کاتێ دەستدەکا بە ڕاڤەکردنو لێکدانەوەی دەقەکانی ئەرستۆ بەشێوەیەك لەگەڵ زمانی فیکری سەردەمەکەیدا بگونجێو، لە زمانی ئەبستراکتەوە تەرجەمە بکری بۆ زمانێك کە زۆربەی خوێندەواران توانایان بەسەریدا بشکێ. ئەو ڕاڤەکردنو لێکدانەوانە لە چوار بەرگدا کۆکراونەتەوە لە ژێر چەند ناونیشانێکی وەك (ئاسمانو جیهان)،( گەردوونو فەساد)و(هەستو هەست پێکراو)و(لۆژیك)و..هتد.

نوسەر لە فەسڵی چوارەمی کتێبەکەیدا کە لەژێر ناونیشانی (کاروانی زانستی) دایە باس لەو پرۆژە پێشوەختەی ئیبن روشد دەکا. بەڵام پێش ئەوە بەشێوەیەکی کورت ئاماژە بۆ گرنگترین کتێبەکانی لە بواری لۆژیکو پزیشکیو زمانو زانستە سروشتیەکاندا دەکاو، هەروەها باس لە دەقە ڕەخنەییە فیکریەکانی دەکا کە گرنگترینیان وەڵامە ڕەخنەییەکانیەتی بۆ (غەزالی)و (ئەشاعیرە).

### *واڵاکردنی دەرگای ئیجتهاد*

لە کتێبی پێداویستیەکانی ئسوڵی فیقهدا ئیبن روشد بڕوای وایە دوو جۆر خوێندەواری ئاینی هەن: فەقیهەکان و موقەلیدەکان، هەرچی فەقیهەکانە زەمانیان بەسەر چووە، چونکە زەمانی ئیجتهاد بەسەر چووەو لەدوای ئەوانەوە ڕێگا نەدراوە کەس ئیجتهاد لە بواری شەرعدا بکا.. هەرچی موقەللیدەکانیشە وەك عەوامی خەڵك ڕۆڵی نەخوێندەوارو بێ سەواد دەبینن، چونکە ئەرکیان تەنها وەرگرتنو نەقڵکردنە نەك تێفکرینو وردبوونەوە. بۆیە ئەو لەباسکردنی ئیجتهادا بڕوای وایە ئەوانەی کە لەسەردەمی ئەودا بە فوقەها ناوزەدکراون وەکو عەوامی خەڵك درێژە بە تەقلیدی سەلەف دەدەنو، دەرگای ئیجتهادیان کلۆم داوە. تەنها جیاوازیشیان لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا ئەوەیە ئەوان دەقەکانی پێش خۆیان لەبەردەکەنو، خەڵکی ئاسایش جێبەجێیان دەکەن.

لە کتێبی (سەرەتای موجتەهیدو کۆتایی مەبەست)دا ئیبن روشد روانینی فیقهی خۆی سەبارەت بەبابەتی ئیجتهاد فۆرمەلە دەکاو، پاش ئەوەی لە ڕوانگەیەکی بەراوردکارییەوە باس لە فیقهی ئیسلامیو مەزهەبە جیاوازەکان دەکا، دوور لە هەر لایەنگیرییەکی مەزهەبی باس لەمەرجەعیەتی ئیجتهاد لە ئسوڵی فیقهدا دەکاو، دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە زاناو فەقیهە ڕاستەقینەکان لەڕێگای کردنەوەی دەرگای ئیجتهادەوە چونەتە دنیای شەرعو یاسادانانەوە، بۆیە بەبڕوای ئەو دەبێ ئەو دەرگایە تا هەتایە بەکراوەیی بمێنێتەوە.

ئەگەر ئەم کتێبە تیورە فیقهیەکانی ئیبن روشدی سەبارەت بەئیجتهادو کردنەوەی دەرگای

ڕەئی مرۆیی لە وردەکاریەکانی شەرعی یەزدانیدا لەخۆگرتبێ.. ئەوا پێشتر ئیبن روشد ئەو تیورانەی بەعەمەلی لە ژیانی رۆژانەو دادوەریدا پراکتیزە کردووە، بەتایبەتی کاتێ لە پۆستی قازی ئەشبیلەو قورتوبەدا بووە.

ئیجتهاد تەنها رەگەزێکی روانینی فیقهیی ئیبن روشد نیە، بەڵکو لە دەقەکانو کایە جیاوازەکانی تریشدا ئیجتهادو ڕوانینی فەردی دەکاتە ستراتیژێکی مەعریفی. لەکتێبی (فصل المقال)داو لەوەڵامی فەتوایەکی غەزالیدا کە فەیلەسوفەکانی تێدا تەکفیرکردووە، ئیبن روشد دەچێتە شەڕێکی مەعریفی گەورەوە لەگەڵ غەزالیدا، بەڵام ئەو لەوێدا وەك فەیلەسوفێك بەرگری لە فەیلەسوفەکان ناکا، بەڵکو وەك فەقیهێکی خاوەن ئیجتهادو لەڕێگەی بەڵگەی شەرعیەوە، ئەو فەتوایەی غەزالی بە فەتوایەکی نوێ ڕەت دەکاتەوە کە لەم سێ خاڵەدا چڕ دەبێتەوە:

*1*—فیکری بەڵگەکەری— کە بنەمای فەلسەفەی یۆنانیو روشدیزمەو پشت ئەستورە بە بەڵگەی ئەقڵیو ئەزموونی واقعی— هیچ کێشەیەکی لەگەڵ شەرعدانیە.. واتە فەلسەفەو شەرع هەردووکیان نوێنەرایەتی هەق دەکەن، هەرگیزیش شەڕی هەق بەهەق ناکرێ. هەر بۆیە فەلسەفە هاوڕێو خوشکی شیریی شەریعەتە.

*2*—ئەگەر بورهان، یان ئەنجامگیری ئەقڵانی، لە خاڵێك لە خاڵەکاندا کێشەی لە گەڵ شەرعدا هەبێت... ئەوا دەبێت تەئویلێکی زمانەوانی بۆ شەرع بدۆزینەوە تا لە گەڵ بورهاندا یەکبێتەوە. واتە دەلالەتی وتە لە دەلالەتی حەقیقەتەوە بگۆڕدرێ بۆ دەلالەتی ئیدیۆمو میتافۆر.

*3*—تەکفیرکردنی فەیلەسوفەکان بەوەی کە گوایا سنورەکانی ئیجماع دەبەزێنن، حوکمێکی بەتاڵەو پێچەوانەی چەمکی خودی ئیجماعە.. چونکە هەرگیز زانایانی ئیسلام لە بابەتە تیوریو زانستە ئەقڵانیەکاندا لەسەر ئیجماعێکی یەقینی کۆنەبوونەتەوە، چونکە ئەو جۆرە ئیجماعە تەنها لەکاروباره عەمەلیو شەرعیەکاندا بڕیاری لەسەر دەدرێ.

بەم شێوەیە ئیبن روشد لەخانەی فەقیهێکی ڕۆشنگەرەوە بەرگری لە فەیلەسوفەکان دەکاو، بەبەڵگەی نەقلکراو لەدەقە کۆنەکانەوە فەتوای گەورەترین زانای خۆرهەڵاتی ئیسلامی کە غەزالییە بەتاڵ دەکاتەوە. بەڵام لەپشت ئیبن روشدی فەقیهەوە ئیبن روشدی فەیلەسوف دەبینین کە لەدیدێکی ئەقڵانیەوە بەها دەبەخشێتەوە بە ئیجتهادو ئەقلو ئاینو، لەگەڵ یەکدیدا ئاشتیان دەکاتەوە.

نوسەر فەسڵیشەشەمی کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ بابەتی ئیجتهاد لەدیدی ئیبن روشدەوە، بەڵام تێبینی ئەوە دەکا کە شێوە ئاڵۆزییەك لە شێوازی نوسینو دەقەکانی ئیبن روشدا هەیە، هۆکارەکەی بەبڕوای ئەو دەگەڕێتەوە بۆ پابەندبوونی فەیلەسوف بە مانایەکی دیاریکراوو، خۆ بەدوورگرتنی لەهەر جۆرە حەشوو درێژدادڕیەك کە مانای زیادە دوور لەمانای مەبەست لای خوێنەر یان وەرگر جێبهێڵێ.

لە شوێنێکی تری هەمان فەسڵدا نوسەر ئاماژە دەکا بۆ ئەوەی کە ئیبن روشد دوو قەوارەی جیاوازی سەربەخۆی بەخشیوە بە ئاین لەلایەكو فەلسەفە لەلایەکی ترەوە، چونکە فەلسەفە بوارێکە بۆ تێفکرینی تیۆری بەڵام ئاین بوارێکە جیا نابێتەوە لە کارو باری رۆژانەی ئینسان.. هەروەها ئاین ڕووی لەهەموو کەسێکەو بەو ئاقارەدا کاردەکا کە لەڕێگای شێوازەکانی ئیقناعەوە زۆرترین کەس بۆ لای خۆی ڕاکێشێ،

بەڵام ئەوە ئەرکی فەلسەفە نیە.. هەروەها مامەڵەی فەیلەسوف لەگەڵ ئاییندا مامەڵەی کەسی ئاسایی نیە، چونکە ئەو لە پشت هونەرە زمانەوانیەکانەوە لەمانا شاراوەکانی دەقی ئاینی دەگا. بەڵام دواجار جیاوازییەك لە گەوهەری مرۆییبووندا لەنێوان فەیلەسوفەکانو خەڵکی ئاساییدا نیە، چونکە جیاوازی نێوانیان جیاوازییە لە وردەکاریەکانی بابەتی مەعریفەدا.

## *ریفۆرم لە عەقیدەدا*

جگە لە فەلسەفەو شەرعو زانستە سروشتیەکان، ئیبن روشد لەدەرگای چەند تەوەرێکی عەقائدیو زانستی کەلامی دەداو، لەدیدێکی فەلسەفەی قوڵەوە تەوەرەکانی ئیلاهیات هەڵدەسەنگێنێ. (جابری) لە فەسڵی حەوتەمو هەشتەمی کتێبەکەیدا ئەو تەوەرانەی لەچەند تایتلێکی فەرعیدا پوخت دەکاتەوە:

تەوەری یەکەم / ئەفراندن:

بەپێچەوانەی باوەڕی ئەشعەریو موعتەزیلەکانەوە کە پێیان وایە یەزدان گەردوونی لەعەدەمەوە دروست کردووەو، سەرەتا تەنها گەوهەرێکی تاكو تەنها لە گەردووندا پایەدار بووە، پاشان نیشانە لاوەکیەکانی وەك ڕەنگو بۆنو تامو هتد.. هاتوونەتە بوونەوە، ئیبن روشد بڕوای وایە کە ئەوە جگە لەئیش کردن لە میتافیزیکدا هیچی تر نیە، دەپرسێ دلخۆ بۆچی ئەشعەریوموعتەزیلەکان جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکەنەوە، لەکاتێکدا دوا ئامانجی ئەوان سەلماندنی کردەی ئەفراندنو بوونی ئەفرێنەرە؟.. ئەو بڕوای وایە کە مادامەکی ئامانجی عەقیدە سەلماندنی بوونی ئەفرێنەرە ئیتر هیچ پێویستیەکمان بەو شێوە بەلگانە نیە، چونکە خودی گەردون کە بوونێکی ڕێكو پێكو دیسپلین کراوی هەیە بەلگەیەکی ئاشکرای بوونی ئەفرێنەرەو، پێویست ناکا بچینە گەمەیەکی میتافیزیکی ئەوتۆ کە دەمانگەیەنێتە دژەیەقین.

### تەوەری دووەم/

### *ئیرادەی یەزدانو ئیرادەی سروشتی:*

ئیبن روشد بڕوای وایە جیاوازیەك لەنێوان فاکتەرە سروشتیەکانو ئیرادەی یەزداندا نیە، چونکە ئیرادەی باڵا واتە ئیرادەی کردەو دژە کردەش. بەڵام جگە لەو ئیرادە باڵایە ئیرادەی فەرعی هەیە کە لەژێر رکێفی یەکەمین ئیرادەدایەو، ئەو ئیرادە فەرعیانەش لە گەردوندا سەربەخۆیی خۆیان هەیە، نکوڵیکردنیش لەو ئیرادە فەرعیانە نکوڵی کردنە لە ئیرادەی باڵا.

بەم شێوەیە ئیبن روشد لەناو خودی ئاینەوە بەرگری لەزانستو بەڵگەی ئەقڵانی دەکاو دوور لە دۆگمای موتەکەللیمەکانی بواری عەقیدە بەها دەبەخشێتەوە بە پرنسیپەکانی زانستی کەلام. لە دەربڕینێکی وردبینانەدا دەڵێ دەقە ئاینیەکان کە بوونەتە مەرجەعی عەقیدەو کەلام لەسەردەمێکی مێژویی دیاریکراودا هاتونەتە خوارەوە کە سەردەمی چاندنی فەزیلەتو خێر بووە نەك سەردەمی وردبوونەوە لە گەردوونو، دوا بڕیاردان سەبارەت بە نهێنیەکانی. بەبڕوای ئیبن روشد فەیلەسوفەکان نهێنیەکانی گەردوون دەکەنە ئامرازێك بۆ بەڵگە هێنانەوەو ڕۆچون لە ئەندێشەدا، بەڵام ئاین نهێنیەکانی گەردوون دەکاتە ئامرازێك بۆ وریاکردنەوەی خەڵكو دواتر بۆ هوشیار کردنەوەی لە کاروباری دنیادا. دواتر فەیلەسوفی قورتوبە ئاماژە دەکا بۆ یەکێك لەخەتەرناکترین پرسیارەکانی عەقیدەی ئیسلام کە پرسیاری (جەبرو ئیرادە)یەو، بەپێچەوانەی ئەو کەسانەوە کە مرۆڤ وەك بونەوەرێکی بێ

ئیرادە لەبەردەم ئیرادەی باڵادا نمایش دەكەن، ئەو بڕوای وایە مرۆڤ خاوەن ئیرادەیەكی ئازادەو، ئەو ئیرادەیەش پێچەوانەی ئیرادەی باڵا نیە، چونكە بزوێنەری ئیرادەی مرۆڤ لە دوو هێزی سەرەكیدا چڕ دەبێتەوە:

—هێزێكی ناوەكی: كە ملكەچی سیستمێكی سەبەبیيە لەناو جەستەی مرۆڤەكاندا.

—هێزێكی دەرەكی: كە ملكەچی سیستمێكی سەبەبیيە لە گەردوندا (دەرەوەی جەستەی مرۆڤەكان).

## تەوەری سێهەم/

*لەنێوان شەریعەت و موعجیزەدا/*

ئیبن روشد بڕوای وایە بەڵگەی یەكەمی پێغەمبەرایەتی شەریعەو فەزیلەتە كە دایەلۆگ لەگەڵ هوشیاری و ئەقڵی مرۆڤدا دەكەن، بەڵام بەبڕوای موتەكەلیمەكان موعجیزە بەڵگەی یەكەمی پێغەمبەرایەتیە.. لێرەوە جیاوازی نێوان ئیبن روشدو ئەوان دەست پێدەكات كە خۆی لەڕاستیدا جیاوازی نێوان بەڵگەی ئەقڵانی و بەڵگەی غەیبیانیە، چونكە فەزیلەتی ئاینی هەوڵ دەدا لە ڕێگای بەڵگەی ئەقڵیەوە قەناعەت بەمرۆڤەكان بكا، بەڵام موعجیزە كردەیەكی واقع بەزێنەو لەڕێگای غەیبیەوە مرۆڤەكان سەرسام دەكا.

## تەوەری چوارەم /

*ڕەخنە لە ڕەخنە:*

لە سەردەمی خەلیفە موستەزهیری عەباسیدا.. دەسەڵاتی سیاسی لەبەغدا فەرمانی دا هەڵمەتێكی ئایدیۆلۆجی دژی ئیسماعیلی و فاتمیەكانی میسر بەرپابكرێ.. لەچوارچێوەی ئەو هەڵمەتەدا ئەبو حامدی غەزالی كتێبی (تهافت الفلاسفة)ی نوسی كە تیایدا تەكفیری فەیلەسوفەكان دەكاو، قسەكانیان بە بیدعەو گومرایی لەقەڵەم دەدا. هەرچەندە ئەو كتێبە زیاتر دژی فەلسەفەی ئیبن سینا نوسرا، بەڵام ئیبن روشد كە خاوەن ئاكارێكی مەعریفی دوور لە خۆپەسەندی بوو لەوەڵامی ئەو كتێبەی غەزالیدا یەكێك لەگرنگترین كتێبەكانی (تهافت التهافت)ی نوسی، كە تیایدا پەیوەندیەكانی نێوان ئاین و فەلسەفە ڕێكدەخاتەوەو، درێژە بەهەمان جیهانبینی دەدا كە لە (فصل المقال)دا هاتووە، هەروەها بەپێچەوانەوەی غەزالیەوە جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كەهیچ دژایەتیەك لەنێوان ئاین و فەلسەفەدا نیە جگە لەوەی ئاین و فەلسەفە دووكایەی جیاوازن و هەریەكەیان پرنسیپ و بنەماو میتۆدی خۆیان هەیە. بەڵام ئەو ئەمجارەیان وەك فەقیهێك بەرگری لەفەلسەفە ناكا، بەڵكو وەك خاوەن ماڵێك بەرگری لەماڵەكەی خۆی دەكاو، دەست دەداتە پرۆژەیەك بۆ (ڕاستكردنەوەی باری فەلسەفە) لە فیكری ئیسلامیدا.

دوای ئەوەی ئیبن روشد ڕاو بۆچوونی هەریەك لە غەزالی و ئیبن سینا تاوتوێ دەكاو، بەشێوەیەكی بابەتیانە ئاماژە بۆ خاڵە بەهێزو لاوازەكانی هەردوو زانای ئیسلام دەكا، دەگاتە ئەو دەرەنجامەی كە كتێبەكەی غەزالی زیاتر شەڕێكی ئایدۆلۆجی نێوان دوو مەزهەبی ئاینی لە خۆدەگرێ نەك شەڕی نێوان عەقیدەو فەلسەفە. لە بابەتی تەكفیركردنی فەیلەسوفەكانیشدا ئیبن روشد بەشی زۆری بەڵگەكانی غەزالی بەبەڵگەی بورهانی ڕەت دەكاتەوە، كە پێشتر ئاماژەمان بۆ هەندێكیان كرد.

ئەوەی كە ئیبن روشد زیاتر نیگەران دەكا بەرامبەر غەزالی، پەنابردنی غەزالییە بۆ خەڵكانی ئاسایی لەپێناو بەهێز كردنی بەرەی خۆیدا دژی فەلسەفە، چونكە فەیلەسوفی قورتوبە پێی وایە كە فەلسەفەش وەك زانستی ئەندازە یاسای تایبەتی خۆی هەیەو كەسێك شارەزای ئەو یاسایانە نەبێت ناكرێ وەك شایەت بەشداری بكا،

هەروەها بڕوای وایە کە پێویستە خەڵکی ئاسایی بانگێشتی وردەکاریەکانی فەلسەفەو عەقیدە نەکرێن تاوەکو گومان لە عەقیدەیاندا چەکەرە نەکات، پاشان بەو قسەیەی غەزالی دڵگران دەبێ کەدەڵێ: ((مەبەستی ئێمە دروستکردنی تەشویشە دژی فەیلەسوفەکان))، لەوەڵامدا دەڵێ: "ئەو جۆرە قسانە لەزانا ناوەشێتەوە(...)، چونکە ئەرکی زانا گەڕانە بەدوای حەقیقەتدا، نەك چاندنی بەدگومانی...".

## بۆچی ئەرستۆ..؟!

پێش ئیبن روشد، فارابیو ئیبن سینا هەندێ لە دەقە یۆنانیەکان بەگشتیو دەقەکانی مامۆستای یەکەم (واتە ئەرستۆ)یان بەتایبەتی تەرجەمە کردبوو، بەشێکیشیان بەشێوەیەك ڕاڤەکردبوو کە لەگەڵ بنەماو پرەنسیپەکانی عەقیدەی ئیسلامدا بگونجێو هیچ ناکۆکیەکیان لەگەڵ وردەکاریەکانی ئایندا نەبێ.. لێرەوە ئیبن روشد هاوکات لەگەڵ هەردوو پرۆژەی (رەها کردنی ئیجتهاد)و (ریفۆرمی عەقیدە)دا دەست دەداتە پرۆژەیەکی فەلسەفی گرنگ کە بریتیە لە ڕاڤەکردنو لێکدانەوەیەکی دەقەکانی ئەرستۆ بەشێوەیەکی بابەتیو دوور لەهەر تەسك بینیەکی ئایدۆلۆجیو مەزهەبی.

دەکرێ بپرسین داخۆ بۆچی ئیبن روشد لەنێو فەلسەفەی سەردەمەکەیدا فەلسەفەی یۆنانیو، لەنێو فەلسەفەی یۆنانیشدا ئەرستۆی هەڵبژارد؟

یەکێك لەهۆکارەکان وەك پێشتر باسمان کرد پەیوەندی بەو ڕاسپاردەیەی (خەلیفە موتەنەور)ەوە هەبوو کە داوای لە فەیلەسوفی قورتوبە کردبوو ئەرستۆ تەرجەمە بکات بۆ زمانێکی ئاسانتر لە زمانی خۆی. بەڵام هۆکاری بنەڕەتی، پەیوەندی بەو پاشاگەردانیە فیکریەوە هەبوو کە لەسەردەمی ئیبن روشدا لەئارادابوو، پاشاگەردانیەك کە فەلسەفەی وەك چەکێکی ئایدیۆلوجی دەستی مەزهەبو ئاراستە نەیارەکان وێنادەکرد، لە ئەورووپا پیاوانی کەنیسە لەرێگای تێزەکانی ئەفلۆتینو پلاتۆیزمی نوێوە هەوڵیان دەدا تێزە ئایدیالیو غەیبیانیەکانی خۆیان بڵاوبکەنەوە.

لە خۆرهەڵاتی ئیسلامیش ستراتیژی شەڕی کەلتوری نێوان عەباسیو باتنیەکان بووە شەڕی نێوان فیکری بەلگەگەری یۆنانیو فیکری گنۆسی خۆرهەڵاتی.. لەگەرمەی ئەو شەڕە ئایدیۆلۆجیەدا خەلیفە مەئمون فەرمانی دا دەقەکانی ئەرستۆ تەرجەمە بکرێن بۆ سەر زمانی عەرەبی وەك چەکێکی لۆژیکی دژی چەکی گنۆسی باتنیەکان. لەبەرامبەردا ئەوانیش هەمان چەکیان بەکارهێنا، واتە لۆژیکی ئەرستۆیان بەشێوەیەك تەوزیف کرد کە لەگەڵ گنۆسیەتو عیرفاندا بگونجێ. بەکورتی فەلسەفە بەگشتیو فەلسەفەی ئەرستۆ بەتایبەتی کرابووە ئامرازێك بۆ شەڕێکی ئایدیۆلۆجی، نەك ئامرازێك بۆ تێفکرینو شەڕی مەعریفی. لەو پاشا گەردانیە فیکریەدا کە بنەماکانی مەنهەجیەتو مەوزوعیەتی فەلسەفەی لەباربردبوو، ئیبن روشد دەستی دایە ڕاڤەکردنی بابەتیانەی دەقەکانی ئەرستۆ بەم جۆرە:

*1*–دەقەکانی ئەرستۆ دەربارەی زانستە سروشتیەکان، وەك: ئاسمانو جیهان، گەردوونو فەساد.. هتد.

*2*–دەقە پوختەکانی ئەرستۆ دەربارەی: هەستو هەستپێکراو، میتافیزیك، لۆژیك، دەروون، سیاسەتنامەی ئەفلاتون.

*3*–شازدە دەقی کورت: هەشتیان دەربارەی لۆژیکی ئەرستۆ، شەشیان دەربارەی زانستی سروشتی، یەکێکیان دەربارەی میتافیزیكو، یەکێکی تریان دەربارەی مۆراڵ.

*4*–لێکدانەوەی دەقەکانی ئەرستۆ دەربارەی بەڵگەگەریو لۆژیكو زانستە دەروونیو سروشتیەکانو.. هتد.

ئیبن روشد (*38*) ساڵی تەمەنی بۆ ئەم پرۆژەیە تەرخان کرد، واتە لە (*522*)ی کۆچییەوە تا (*590*)ك.

## *روشدیزم لە ئەورووپا*

پرۆژەی راستکردنەوەی باری فەلسەفەو راڤەکردنی دەقەکانی ئەرستۆ زێدی جوگرافیی خۆی بەجێهێشتو، لە چاخی سیازەی زاینییەوە وەك بابەتێکی گرنگی فەلسەفیو مەنهەجی لە ئەڵقە ئاینیو فەلسەفیو فیکرییەکانی ئەورووپا دەستکرا بەخوێندنو دیراسەکردنی، پاشان تەرجەمەکران بۆ سەر زمانی ستانداری ئەو سەردەمەی ئەورووپا واتە زمانی لاتینی. دەقەکانی ئیبن روشد تەنها وەك بابەتێکی خوێندنی فەلسەفی لە ئەورووپا رەواجیپەیدا نەکرد، بەڵکو دواتر وەك ئاراستەیەکی ئەندێشەو بیرکردنەوە بەشێکی زۆری خوێندەوارانی ئەو سەردەمەی ئەورووپای لە دەوری خۆی خڕکردەوە، تا دواتر وەك قوتابخانەیەکی فیکری بەناوی (روشدیزمی لاتینی)یەوە لە ئەورووپا سەری هەڵدا.

(ئارنست رینان) لە کتێبی (ئیبن روشدو روشدیزم)دا کە ساڵی *1852*ز بڵاوکراوەتەوە، ئاماژە بۆ پێگەی گرنگی ئیبن روشد دەکا لە فیکری خۆر ئاواییداو، وەك پردێکی گرنگی نێوان فیکری یۆنانیو فیکری خۆرهەڵاتی مۆدێرن وێنای دەکا. لەو تەرجەمە لاتینیانەی ئیبن روشدا—هەروەکو رینان باسی دەکا—ئیعجابی ئیبن روشد بۆ ئەرستۆ گەیشتۆتە ئاستێك کە وەك سوپەر مرۆڤێك وێنای دەکاو، لەسەروی مرۆڤی ئاساییەوە تەماشای دەکا. بەڵام (محمد عابد الجابری) بڕوای وایە بەشێك لەو تەقدیسکردنە حەشوی وەرگێڕانە لاتینیەکانەو لەدەقە عەرەبیەکاندا بەرچاوناکەون.

پاشان دوای ئەوەی جابری لە فەسڵی دەیەمی کتێبەکەیدا ئاماژە بۆ بۆچوونەکانی رینان دەکا دەربارەی روشدیزم لە ئەورووپا.. هەوڵ دەدا بەشێوەیەکی بابەتیانە باس لە هۆکارەکانی ئیعجابی ئیبن روشد بەرامبەر بە ئەرستۆ بکا. یەکێك لەو هۆکارانە دەگەڕێتەوە بۆ بایەخدانی بەردەوامی ئەرستۆ بە مەسەلەی بوونو رەهەند ئەنتۆلۆژیەکانی مرۆڤو ژیانو گەردوون، بە پێچەوانەی ئەو ئاراستە لاهوتیانەی کە پێیان وابوو یەکەمین ئەفراندنی گەردوونی لە رەشاییو عەدەمەوە دەستی پێکردوە.

ئەرستۆ، دواتر ئیبن روشد، کە فیکری فەلسەفەی خۆیان بە بنەماکانی ماتماتیكو زانستی سروشتی موتوربە کردبوو دوور لەمیتافیزیكو تیزی لاهوتی لە رەهەند ئەنتولۆژیەکانی گەردوون ورد دەبوونەوە.

هەروەها نووسەر ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە پەیوەندی نێوان ئیبن روشدو ئەرستۆ زۆرجار لەپەیوەندی نێوان بینەرێکی زیرەكو تابلۆیەکی هونەری چووە.. چونکە ئەرستۆ خاوەنی ئیستاتیکایەکی تیوریو عەقڵانیەو، ئیبن روشدیش راڤەکارێکی فەلسەفەی جوانناسە.

گەڕانی بەردەوام بەدوای هەقیقەتدا خاڵی هاوبەشی نێوان ئەرستۆو ئیبن روشدە، چونکە فەیلەسوفی قورتوبە بڕوای وایە تێگەیشتنی ئەو بابەتە فەلسەفیانەی مامۆستای یەکەم باسی کردوون پێویستی بەخوێندنەوەیەکی وردو بابەتیانەی دەقە فەلسەفیەکان هەیە دوور لە حوکمدانی پێش وەخت. حەقیقەت لە دیدی هەردوکیانەوە لەگەڕانی بەردەوامو بێوچاندا بەرجەستە دەبێ، ئەو گەڕانەش شێوەیەکە لە عیبادەت.

## *پۆست ئەرستۆیزم*

ئیبن روشد لە زۆر شوێنی لێکدانەوە فەلسەفیەکانیدا تیزە فیکریە تایبەتەکانیخۆی لەپاڵ تیزەکانی ئەرستۆدا تۆمار دەکاو، زۆرجار جیهانبینی مامۆستای یەکەم سەبارەت بە (بوون،

ئەقڵ، پەیوەندی) تێدەپەڕێنێو جیهانبینیەکی نوێمان دەربارەی ڕەهەندە زەینیو مادیەکانی گەردوونو ڕەگەزەکانی بوون کە بریتین لە (گڵ-ئاو-ئاگر-با) پێشکەش دەکا، هەروەها باس لە هەردوو چەمکی هێزو جوڵە دەکا. دەربارەی مەزهەبە ئەنتۆلۆژیەکان ئیبن روشد بۆچوونێکی تەواو جیاوازی لەگەڵ پەیڕەوە تەقلیدیەکانی ئەرستۆدا هەیە، بڕوای وایە جیهانبینیو ئەندێشەی فەلسەفی بەرامبەر گەردوونو بوون بەسەر دوو تەوەری سەرەکیدا دابەش دەبن:

یەکەم/ مەزهەبی لەنێویەك بوون (الکمون): کە بڕوای وایە هەموو شتەکان زادەی شتی ترنو، لەعەدەمەوە نەهاتوون. کەسی بکەریش تەنها بزوێنەرێك بووە ڕەگەزە ئەنتۆلۆژیەکانی لێکدی جودا کردۆتەوە.

دووەم/ مەزهەبی ئەفراندن: کە پەیڕەوانی بڕوایان وایە بکەر جیهانی لە عەدەمەوە ئەفراندووە.

پاشان ئیبن روشد بەرگری لە مەزهەبی یەکەم دەکاو، پێمان دەڵێ کردەی ئەفراندن بریتیە لە گۆڕانکاریەك لە گەوهەردا نەك لە بووندا چونکە هەموو بونێك ڕەهەندێکی ئەنتۆلۆژی هەیە نەك نیهلیستی.

پاشان ئیبن روشد باس لە هێزی ناوەکیی مادەو هێزی ئیرادەی بکەر دەکاو، ئاماژە دەکا بۆ ئەوەی ئەرکی بکەر دروست کردن نیە. بەڵکو جوڵاندنە، ئەو کردەی جوڵاندنەش پێویستی بە هێزی بکەر هەیەو، بکەریش پێویستی بە بوونێکی پێش وەخت هەیە چونکە ئەو لە بۆشاییدا کارناکا.

دواتر ئیبن روشد باس لەوزە دەکا وەك هێزێکی ئەنتۆلۆژی کە زاینگای هەموو هێزو جوڵە سروشتیو زەینیەکانە، لە ئەنجامدا دەگاتە ئەو بڕوایەی کە بەشێکی زۆری چەمكو یاسا فەلسەفیەکان فۆرمێکی ئەزەلییان هەیەو، پێش ئەوەی لە ئەقڵی ئینساندا لەدایك ببن هەر هەبوون، دوای مردنی ئینسانیش هەر بەئەمری دەمێننەوە.

نوسەر فەسڵی پانزەهەمی کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ خستنە ڕووی ئەو میکانیزمە ئەپستمۆلۆجیو تێزە فیکریانەی کە ئیبن روشد هێڵە گشتیەکانی سەبارەت بە بوونو میتافیزیك دەستنیشان کردووە، پاشان لە فەسڵی دوازدەهەمدا ئاماژە دەکا بۆ گرنگترین تێزەکانی ئیبن روشد سەبارەت بە هەردوو زانستی گەردووناسیو پزیشکی، ئەوەش دەخاتە ڕوو کە ئەم فەیلەسوفەمان خواستی دامەزراندنی پرۆژەیەکی تیۆریشی هەبووە بۆ ڕاستکردنەوەی باری گەردوناسی لە سەردەمەکەیدا.

*لەگەردوونەوە بۆ سەر زەمین*
*(سیاسەت)*

ئیبن روشد بەپێچەوانەی زۆر زاناو فەیلەسوفەوە کە بەڕادیکاڵیەت دەست پێدەکەنو بە موحافیزکاری کۆتایی بە ژیانیان دێنن.. ئەو لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا وازی لە کەشفکردنی رازو نهێنیەکانی گەردوون هێناو گەڕایەوە بۆ سەر زەمین تا ببینێ چ پاشا گەردانیو ناڕێکوپێکیەك لە کاروباری ڕۆژانەی خەڵكو پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی خەلیفەو ڕەعیەتدا هەیە.

دوا هەمین کتێبی ئەم فەیلەسوفەمان (پێداویستیەکانی سیاسەت)ە، کە جابری لەدوا فەسڵی کتێبەکەیدا ئاماژە بۆ گرنگترین تەوەرەکانی دەکاو، بەهەنگاوێکی بوێرانەی کلتوری عەرەبو ئیسلام لە قەڵەمی دەدا کە دواتر بوغزی دەسەڵاتی خەلیفەی بەرامبەر ئەو فەیلەسوفە پیرەی قورتوبە جوڵاند. دەکرێ بایەخی ئەو کتێبەی ئیبن روشد کە خۆی لەبنەڕەتدا دەربارەی سیاسەتنامەی ئەفلاتون نوسراوە بەسەر ئەم تەوەرانەدا دابەش بکەین:

***یەکەم/*** **داهێنانی ئەپستمۆلۆجی یان بەزانست کردنی سیاسەت:**

ئیبن روشد بەپێچەوانەی پۆلێنکردنە تەقلیدیەکانی زانستەوە هەوڵدەدا سیاسەت لە یەکەیەکی فیکری تازەدا ڕێکبخاو وەك زانستێکی سەربەخۆ وێنای بکا، هەروەها دەخوازێ جەمسەری پراکتیکی سیاسەت ببەستێتەوە بە جەمسەرە تیوریەکەیەوە. سیاسەت پێش ئیبن روشد بەشێك بوو لە زانستی (شارسازی-تدبیر المدینة) کە لەگەڵ زانستی (مۆراڵ-الاخلاق)دا (زانستی مەدەنی-العلم المدني) یان پێك دەهێنا. زانستی مەدەنیش لقێك بوو لە دوولقە سەرەکیەکەی زانست واتە زانستی تیۆری‌و وزانستی مەدەنی. هەرچی زانستی تیۆریشە-بەگوێرەی ئەو پۆلێنکردنە- لە چەند لقێکی وەك (ئەندازە، مۆسیقا، گەردونناسی، پزیشکی‌و، دەروونناسی..) پێك دەهات.

بەڵام لە (پێداویستیەکانی سیاسەت)دا ئەم پۆلێنکردنە دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، چونکە سیاسەت پەیوەندیەکی دیالیکتیکی لەگەڵ مۆراڵدا هەیە، مۆراڵیش زادەی دەرونە، دەرونیش بەشێکە لە زانستە سروشتیەکان.

***دووەم/*** **زانستی سروشتی‌و زانستی مەدەمەنی:**

سیاسەت تەنها پێویستی بەزانستی مۆراڵ نیە، چونکە ئەخلاق‌و ئاکارەکانی ئادەمیزاد ملکەچی یاسای زانستە سروشتیەکانن کە بەسەر چەند دوالیزمەیەکی وەك : گەوهەرو دەرکەوت، هێزو کردە، تاك‌و کۆدا.. دابەش دەبن. بۆ ئەوەی هێزە دەرەکیەکانی سروشت‌و هێزە ناوەکیەکانی مرۆڤ پێکەوە فەزیلەتی سیاسی لە ئاستی شارو دەوڵەتدا دروست بکەن، دەبێ هەمان ئەو یاسایانەی کە بەسەر ئادەمیزادا جێبەجێ دەبن بەسەر شارو دەوڵەتیشدا جێبەجێ ببن.

بەمانایەکی تر بۆ ئەوەی ئادەمیزاد دادوەر بێت پێویستی بەحیکمەت‌و ئازایەتی‌و دەروونپاکی هەیە، واتە دەبێت هاوسەنگی لە نێوان ئەو سێ هێزەدا رابگرێ. بەهەمان پێودانگ بۆ ئەوەی دادوەری لە سیستمکی سیاسیدا پایەداربێت پێویستە هاوسەنگی لەنێوان چین‌و توێژەکانی ڕەعیەتدا پایەداربێت.. پاراستنی ئەو هاوسەنگیەش ئەرکی (زانست/ فەلسەفە)یە.

***سێیەم/*** **ئەگەری پایەدار بوونی شارێکی ئایدیالی:**

هەرچەندە مۆدێلی شاری فەزیلەت بەو چەمکەی ئیبن روشد دەیخاتە ڕوو مۆدێلی جیهانە ئایدیالەکەی ئەفلاتونە، بەڵام ئیبن روشد لەو خاڵەدا لەگەڵ ئەفلاتۆندا کۆك نیە کە پێی وایە ئەگەری پایەداربوونی ئەو شارە لە واقعدا مەحاڵە. ئیبن روشد ئەو گومانە ڕەت دەکاتەوەو دەڵێ: دەکرێ مرۆڤگەلێك پەروەردە بکەین کە خاوەنی ئەو سیفاتە سروشتیانە بن کە پێشتر باسمان کردن‌و، پێکەوە پابەندی ناموسێکی هاویەش بن (مەبەستی دەستور یان شەریعەتە).. کە خۆیان هەڵیانبژاردبێ، چاریش نیە هەر دەبێ ئومەتێك لە ئومەتەکان هەڵبژێرێ..)).

***چوارەم/*** **ئافرەتانیش وەك پیاوان دەکرێ فەیلەسوف‌و سەرکردەبن:**

دوای ئەوەی ئیبن روشد بۆچوونی ئەفلاتۆن بەرامبەر ئافرەت دەخاتە ڕوو، ڕوانینی خۆیشی دەربارەی پێگەی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی ئافرەت باس دەکاو بەسەر چوار لایەندا دابەشی دەکا:

-لایەنی مەبدەئی: ئافرەتان‌و پیاوان بەشداری یەك غایەت دەکەن کە غایەتی مرۆیی بوونیانە، هەرچەندە کاروباری پیاوان‌و ژنان لەهەندێ ڕووە جیاوازن بەڵام لە ئەنجامدا پێکەوە دواغایەت فەراهەم دێنن، پەیوەندی نێوان ئافرەتان‌و پیاوان وەك پەیوەندی کاملێ نێوان

دەنگی مرۆڤو ئاوازی مۆسیقا وایە لە گۆرانیەکدا ئاوازدانەرەکەی پیاوو گۆرانیبێژەکەی ئافرەتە.

-لایەنی پراکتیکی: هەرچەندە ئافرەتان لەپیاوان لاوازترن، بەلأم لە هەندێ کاروباردا زیرەکن وەك چنینو درومان. بەشداری کردنی ئافرەتان لە جەنگدا ئەرکێکی دوورە وەك دووری نێوان دانیشتوانی سەر دەریاو دانیشتوانی وشکانی، بەلأم ئەگەر ئامادەییو زیرەکی لە ئافرەتدا هەبێ ئەوا دەشێ ببنە فەیلەسوف یان سەرکردە.

-لایەنی شەرعیو کۆمەلأیەتی: لێرەدا ئیبن روشد باس لە بۆچوونی هەندێ مەزهەبی فیقهی ئیسلامی دەکا کە حەرامیان کردووە ئافرەت دەسەلأتی سیاسی لە سەر ئاستی بالأ بگرێتە دەست. دواتر باس لە ڕەوشی ئافرەتان دەکا لە کۆمەلگای ئیسلامیداو، باس لە قەیرانی ڕەگەزی مێ دەکا لەو سەردەمەی ئەودا کە هەر بۆ منداڵبوونو بەخێوکردنو شیردان بەکارهێنراوونو، وزەکانیان لە بوارەکانی ترا بەتاڵ کراوەتەوە.

*پێنجەم/* مەرجەکانی سەرکردە:

پێویستە ئەو کەسەی لەسەر کورسی یەکەمی دەسەلأتی سیاسی دادەنیشێ خاوەنی سیفاتی زانستیو سەربازیش بێت. بەلأم هەندێ جار ڕێکدەکەوێ ئەو سیفەتانە لەیەك کەسدا کۆنابنەوە.. ئەوکاتە دەبێ کەسێکی زاناو کەسێکی شارەزا لە بواری سەربازیدا سەرکردایەتیەکی هاوبەش پێك بێنن.

*شەشەم/* دەسەلأتی جەماعی (دیموکراسی):

مۆدێلی شارێکە کە دانیشتوانەکەی سەربەخۆیی خۆیان هەیەو بە ئاگاداری سەرکردەکانیان کاروباری خۆیان بەڕێوە دەبەن. بەلأم لەم شارەدا هەموو کەس خۆی بەخاوەن مافی زیاتر دەزانێ لەوانی تر.

*حەوتەم/* تاکڕەوی لە دەسەلأتدا:

مۆدێلی حوکمی ستەمکارێکە کە دانیشتوانی ژێر رکێفی دەسەلأتەکەی دەکا بەکۆیلە لەترسی ئەوەی لێی یاخی نەبن، بەلأم هەرگیز ئارەزوەکانی تێر نابن.. بۆیە ئەو هەمیشە لەخەمو خەفەتدایە. ئەم جۆرە دەسەلأتدارانە دەرونێکی لاوازیان هەیەو، ستەمکارو حەسودنو هیچ کەسێکیان خۆش ناوێت.

*هەشتەم/* ریفۆرم:

هەروەکو چۆن ئەگەری پایەداربوونی شاری فەزیلەت لە ئارادایە، بەهەمان شێوە دەکرێ چاکسازی لە سروشتی دەسەلأتی سیاسیدا ئەنجام بدرێو، گۆڕانکاری لە دۆخی سیاسیدا لە ڕێگای گۆڕینی سیستمی دیاردە سروشتیەکانو یاسای سەبەبیەتو حەتمیەتەوە بێتە ئاراوە. لێرەوە هەروەکو چۆن مرۆڤ لە ڕێگای خوێندنەوەوە فێری زانستە تیوریەکان دەبێ، بەهەمان شێوە دەکرێ لە ڕێگای خۆڕاهێنانەوە فێری فەزیلەتە پراکتیکیەکان ببێ.

### *کۆتایی*

نوسەر بە پوختەیەکی گشتیو ژمارەیەك لە دەقە شەرعیو عەقائیدیو فەلسەفیەکانی ئیبن روشد کۆتایی بەکتێبەکەی دێنێت کە دەکەوێتە دووتوێی (*343*) لاپەڕەوە. لە پوختەکەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە دەبێ بابەتی روشدیزم بەکراوەیی بمێنێتەوەو، وێنەی ئیبن روشد ئەدگارێکی نوێ لە فیکری هاوچەرخی عەرەبدا وەرگرێ. هەروەها لە دەرگای چەند ئەنجامگیرییەك دەدا کە دەکرێ لەم خاڵانەدا چڕی بکەینەوە.

*1*-بۆ ئەوەی لە فەلسەفەو مێلە گشتیەکانی فیکری ئیبن روشد بگەین، دەبێ ئاگاداری باکگراوندی شەخسیو کۆمەلأیەتی ئەو فەیلەسوفە بین.. چونکە ئەو تەنها نوێنەرایەتی چرکەیەکی گرنگی مێژوی فەلسەفەی ئیسلامو

خۆرهەڵات ناکا، بەڵکو نوێنەرایەتی جۆرە ناکارێکی کۆمەڵایەتیو شەخسی دەکا کە موتوربەکراوە بە کەرەستەکانی فیکر. هەروەها نوسەر ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە ئیبن روشد تا ئەو شوێنە پەیوەندی لەگەڵ خەلیفەدا ئاسایی بووە کە سەردەم سەردەمی (خەلیفە موتەنەوبر) بووە، ئەو خەلیفەیەی کە بایەخێکی زۆری بە بوژاندنەوەی کەلتورو فەلسەفەی یۆنانی داوە، بەڵام لەدوای سەردەمەکەی ئەوەوە، پاش ئەوەی کودەتایەك دژی سیاسەتی کلتوریو دژی ئیجتهادو کرانەوە دەستپێدەکا ئیتر کەلێنێکی گەورە دەکەوێتە نێوان ئیبن روشدو دەسەڵاتەوە.

2–دوا غایەتی ئاینو فەلسەفە بریتیە لە فەزیلەت، ئەو کاتەیشی فەزیلەت لە بار دەبرێ ئاینو فەلسەفە غایەتی خۆیان لەدەست دەدەن، لێرەوە بەبڕوای ئیبن روشد کەس بۆی نیە ببێتە قسەکەر بەناوی ئاینو فەلسەفەوە ئەگەر ئەخلاقی خۆی بارگاوی نەکردبێ بە پرەنسیپەکانی فەزیلەت. دەبێ فەیلەسوفو فەقیهو دەسەڵاتداری سیاسی پرەنسیپەکانی (دادوەری شەرعیو زانستیو موراڵی) پیێڕەو بکەن لەپێناو پایەدارکردنی شاری فەزیلەتدا.

3–ئیبن روشدی زانا لە ئسوڵی فیقهدا، نەك هەر بڕوای بەکردنەوەی دەرگای ئیجتهاد هەیە، بەڵکو بڕوای وایە دەبێ هەموو چەرخو سەردەمێك موجتەهیدی خۆی هەبێ.

4–ڕاستکردنەوەی باری عەقیدەی ئیسلام پەیوەستە بەراستکردنەوەی باری ئەقڵەوە، چونکە گەوهەری عەقیدە لەپەیوەندی نێوان یەزدانو مرۆڤدا بەرجەستە دەبێ، مرۆڤیش لەرێگای ئەقڵەوە دەبێتە جەمسەرێکی ئەو پەیوەندیە.

5–سیاسەت کایەکی دانەبڕاوە لە فەلسەفە بۆیە ئیبن روشد گرنگیەکی تایبەتی داوە بە(زانستی مەدەنی)و، هەوڵیداوە سیاسەت وەك زانستێك وێنا بکا کە پەیوەندیەکی ئەپساوەی لەگەڵ کایە زانستیەکانی تردا هەیە. هەروەها هەوڵی داوە خاوەنی گوتارێکی فیکری سیاسی ڕاشکاو بێت لە ئیدانەکردنی ستەمکاریو دەسەڵاتی سیاسی تاکرەودا.

6–جەبرو حەتمیەت ئەو مانایە ناگەیەنن کە هیچ ڕوبەرێك بۆ ئیرادە نەهێڵینەوە، بۆیە فەیلەسوفی قورتوبە لەچرکەیەکی بەرجەستەکردنی ئیرادەدا پرۆژەیەکی تیوری فیکری، سیاسی، عەقاندی گرنگ دەست پێدەکاو بەشێکی زۆری لایەنەکانی لە بواری ریفۆرمی تیوریو ڕاستکردنەوەی زانستیدا دەگەیەنێتە ئەنجام.

7–ئیبن روشد تەنها فەیلەسوفێکی خاوەن فیکری ئەبستراکت نیە، بەڵکو کوڕێکی ڕەسەنی سەردەمەکەی خۆیەتیو ڕەخنەش ستراتیجێکی جێگیری ئەندێشەکەیەتی. هەروەکو چۆن لەسەرەتای ژیانیدا بەشداری لە لیژنەکانی ڕاستکردنەوەو ریفۆرمدا دەکا ... لەدوا ساڵەکانی تەمەنیشیدا بەهەمان ئەفەس بەڵام بەدیدێکی قوڵترو ڕۆحیەتێکی ڕادیکاڵانەترەوە بەدوای ڕاستکردنەوەو گۆڕاندا دەگەڕێ.

# ڕەخنەو تۆژینەوە

- سەراپاگیریی گرفتی هیرمنیوتیکی — هانز جۆرج گادامێر
- نووسین بۆ...؟ — ژولیا کاستریتن

# سەراپاگیریی گرفتی هێرمنیۆتیکی

▪ هانز جۆرج گادامێر

▪ و. لە ئینگلیزییەوە: ئەنوەر حەمە ساڵح

بۆچی گرفتی زمان هەمان پێگەی گرنگی لە فەلسەفەی نوێدا، داگیرکردووە کە چەمکی "هزر" یاخود "بیرکردنەوەی هزر لە خۆی" لە سەدەو نیوێکی رابردوودا لە فەلسەفەدا داگیریکردبوو؟ بە وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە هەوڵ دەدەم وەلامێکی ناڕاستەوخۆی گرنگترین پرسیاری سەردەمی نوێ بدەمەوە، پرسیارێك کە بەهۆی بوونی زانستی نوێوە لە ئێمە کراوە. ئەویش پرسیارە لەسەر ئەوەی چۆن تێڕوانینی سروشتیمان بۆ جیهان (ئەو ئەزموونەی لەسەر جیهان هەمانە کاتێك بە سادەیی ژیانی خۆمان بەسەر دەبەین) پەیوەندی هەیە بەو دەسەلاتە نادیارە لە شکان نەهاتووەی لە بەیانکردنەکانی زانستدا رووبەڕوومان دەبێتەوە. ئەرکی راستەقینەی فەلسەفە هەر لە سەدەی حەقدەهەمەوە میانگیریکردنی نێوان ئەم ئەرك پێسپاردنە نوێیەی توانا مەعریفیو بنیاتنەرەکانمان بوە لەگەڵ سەراپای ئەو ئەزموونەی لەسەر ژیان هەمانە. ئەم ئەرکە بە چەندین رێگەی جۆراو جۆر توانای گوزارشتی خۆی دۆزیوەتەوە، لەناویاندا هەوڵی ئەم نەوەیەی خۆمان بۆ هێنانی بابەتی زمان بۆ نارەندی کاری فەلسەفی.

زمان شێوازی بنەڕەتی خستنەگەری بوونمانە لە- جیهان داو ئەو شێوە پێکهاتەیەی جیهانیشە کە هەموو شتێك دەگرێتەوە. لێرەوە هەمیشە بەیانکردنەکانی زانستەکان کە لە هێما نازارەکیەکاندا جێگیر بوون لە روانینماندا هەن. ئەرکی ئێمەش گرێدانەوەی جیهانی بابەتی تەکنەلۆژیایە، کە زانستەکان لە رەفتارو

وریایمـــاندا دایاننـــاوه، لەگـــەڵ ئـــەو فەرمانـــە بنەڕەتیانـــەی بوونمـــان کـــە نـــە هەرەمـــەکین و نـــەخۆشمان دەتوانـــین بـــەڕێوەیان بـــەرین بـــەڵکو زیاتر داوای گرنگی پێدانمان لێدەکەن.

من دەمەوێت چـەندین دیاردە روون بکەمـەوە کـە تیایـاندا سـەراپاگیری ئـەم کێشـەیە ئاشـکرا دەبێـت. ئـەو تێڕوانینـەم کـە پـەیوەندی بـەم بابەتـــەوە هەیـــە ناونـــا (هـــێرمێنیوتیکی *Hermeneutical*) زاراوەیـــەك کـــە لـــە لایـــەن هایدگەرەوە گەشەی پێـدرا. هایدگـەر *Hiedgger* بـەردەوامی بـە دیدێك دەدا کە بە رەچەڵەك لـە تیۆلۆجیـــای پرۆتســـتانتیەوە *Protestant Theology*) سەرچاوە دەگرێت و لەلایەن ویلهێلم دەڵتای *Wilihelm Dilthy* گواسـترایەوە بۆ نـاو ئەم سەدەیەی خۆمان.

*هێرمونتیکـا چیـیە؟ حەزدەکـەم لـــە دوو ئـــەزمونی نـــامۆ بوونـــەوە *alienation* دەســـت



هایدگەر

پێبکـــەم کـــە لـــە بوونـــی بەرجەســـتەبوومان دا رووبەڕوویان دەبینەوە:

ئـەزموونی نـامۆبوونی ئاگـایی ئیسـتاتیکی و ئـەزموونی نـامۆبوونی ئاگایی مێژوویی. کە لـە هـــەردوو بارەکـــەدا ئـــەوەی مـــن مەبەســـتمە دەتوانرێـت لـە چـەند وشـەیەکی کـەم دا دیـاری بکرێـت. ئاگـایی ئیسـتاتیکی درك بە شـیمانەیەك دەکـات بـەو چەشـنـەی کـە نـەدەتوانین نکوڵـی لێبکەین و نە دەتوانین لە بەهای کـەم بکەینـەوە، بەو واتایەی کە ئێمە چ بە شێوەی نێگەتیڤی بێـت یـاخود بـە پۆزەتیڤـی خۆمـان بـــە چۆنیـــەتی فۆرمێکـی هونەریـەوە دەبەستینەوە. ئـەم وتەیـە ئـەوە دەگەیـەنێت کـە ئێمـە بـەجۆرێکی وەهـا پـەیوەندی داریـــن کـــە ئـــەو هەڵســـەنگاندنەی دەیکـــەین لـــەکۆتایدا بڕیـــار لەســـەر هـــێزی گوزارشـــتکەرو راســـتی ئـــەوە دەدات کـــە هەڵیدەسـەنگێنین. ئـەوەی رەتـی دەکەینـەوە هیچی نیە پێمان بڵێت، یـاخود رەتـی دەکەینـەوە چونکە هیچی نیە پێمان بڵێت. ئەمە لە فراوانترین مانادا پەیوەندیمان بەهونەرەوە وەسـف دەکـات، مانایـەك وەك هیگـل *Hegel* پیشـانیدا سـەراپای جیهانی ئـاینی یۆنانیـە کۆنـەکان لـە خۆدەگرێت، کە ئاینی جوانیان لەکارە بەرجەستەکانی هونەردا ئـەزمونی ئیلاهیـەتی *divine* کرد کە مـرۆڤ لـە بەدەنگـەوەهاتنی خواوەنـدەکـاندا دەیخولقـــاند. کـاتێك ئـەم جیـهانی ئەزمونکردنـە دەسـەڵاتی پرسـیار لێنـەکراوی دەدۆڕێنێـت سـەراپا نـامۆ دەبێت و بۆ بابەتێکی هەڵسەنگاندنی ئیستاتیکی. هەرچۆنێك بێت دەبێت لەهـەمان کـاتدا دان بنێـین بەوەدا کە جیهانی باوی هونەر *[ئەو هاوچەرخێتیە* گەورەیـەی لـــە رێگـەی هونــەرەوە لـــە چـەندین جیهانی مرۆڤدا بەدەستی دەهێنین*]* زیاترە لەوەی کـــە تەنـــها بابـــەتێکی قبوڵکـــردن یـــاخود

ڕەتکردنەوەی ئازادانەمان بێت. ئایا ئەوە ڕاست نیە کە کاتێك کارێکی هونەری دەستی بەسەردا گرتین چیتر لێناگەڕێن جارێکی تر خۆمانی لێ ڕزگار بکەین بە گوێرەی مەرجەکانی خۆمان قبوڵ یاخود ڕەتی بکەینەوە؟ و ئایا هەروەهاش ڕاست نیە کە ئەم ئەفراندنە هونەریانەی لە ڕێگەی هەزارەکانەوە ***Millannia***، بە ئێمە گەیشتوون بۆ ئەو چەشنە قبوڵ کردن و ڕەتکردنەوە ئیستاتیکی‌یە نەخولقێنراون؟ هەرگیز هیچ هونەرمەندێکی کلتوورە ئاینیەکانی ڕابردوو کارە هونەرییەکەی بەرهەم نەهێناوە بەو مەبەستە نەبێت کە ئەفراندنەکەی بەو شێوازە وەربگیرێت کە بانگەشەی دەکات و پێشکەشی دەکات و جێگەی شایستە بەخۆی هەبێت لە جیهانێکدا کە مرۆڤەکان پێکەوە تیایدا دەژین. ئاگایی هونەری (ئاگایی ئیستاتیکی) بۆ بانگەشەی ڕاستەوخۆی ڕاستی هەمیشە ئاستێکی مام ناوەندی هەیە کە لە کاری هونەر خۆیەوە سەرچاوە دەگرێت. کاتێك کارێکی هونەری تا ئەم ڕادەیە لەسەر بناغەی چۆنێتی ئیستاتیکی هەڵدەسەنگێنین، شتێك کە لە ڕاستی‌دا بەشێوەیەکی زۆر تایبەتی ئاشنایە پێمان نامۆ دەبێت. ئەم نامۆبوونە هەمیشە کاتێك ڕوودەدات لە هەڵسەنگاندنی ئیستاتیکی‌دا کە خۆمان کشاندۆتەوەو چیتر والآنین لەبەردەم ئەو بانگەشە ڕاستەوخۆیەی کە تێگەیشتنی هەیە بۆمان.

بەم جۆرە خاڵێکی دابڕانم لە وتاری ڕاستی و میتۆدم ***Truth and Method*** ئەوە بوو کە سەروەرێتی ئیستاتیکی کە لە ئەزمونی هونەردا دارای مافەکانی دەکات نامۆ بوونێك دەنوێنێت کاتێك بەراورد بکرێت بەو ئەزموونە ڕاستەقینەی لە شێوەی هونەر خۆی‌دا ڕوویەڕوومان دەبێتەوە.

نزیکەی سی ساڵێك بەر لە ئێستا ئەم گرفتە لە فۆرمێکی تایبەتی شێواودا بەدەرکەوت کاتێك سیاسەتی سوشیالیستی نەتەوەیی (نازی) ***National Socialist*** لە سەر هونەر هەوڵی‌دا، وەکو ئامرازێك بۆ ئامانجەکانی، ڕەخنە لە فۆرمالیزم ***Formalism*** بگرێت بە سەلماندنی ئەوەی هونەر گرێدراوە بە گەلێکەوە سەرەڕای بەکارهێنانی خراپی لەلایەن سوشیالیستی نەتەوەیی‌یەوە ***National Socialist*** ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین کە بیرۆکەی پەیوەست بوونی هونەر بە گەلێکەوە ڕوانگەیەك لە ڕاستی لەخۆ دەگرێت. ئەفراندنێکی هونەری ڕاستەقینە لەناو جڤاتێکی تایبەتدا جێگەی خۆی دەگرێت، ئەو جڤاتەش ***Community*** هەمیشە جیادەکرێتەوە لە کۆمەڵگەی ڕۆشنبیر کە بەهۆی ڕەخنەی هونەریەوە ئاگادار کراوەتەوەو ترسێنراوە.

جۆری دووەمی ئەزمونی نامۆبوون ئاگایی مێژوویی‌یە– هونەری بەرزو هێواش کامڵ بووی خۆ ڕاگرتنمان لەمەودایەکی یەکالاکەرەوەدا کاتێك لە شاهیدەکانی ژیانی ڕابردوو دەکۆڵێنەوە. پێناسە بەناوبانگەکەی ڕانکە ***Ranke*** بۆ ئەم بیرۆکەیە وەکو دامرکاندنی تاك ***extinguishing of the individual*** فۆرمەلەیەکی گشتی بۆ ئایدیالی بیرکردنەوەی مێژوویی دەستەبەر کرد: ئاگایی مێژوویی ئەرکی تێگەیشتنە لە شاهیدەکانی زەمەنی ڕابردوو بەدەر لە ڕۆحیەتی ئەو سەردەمەو زانینی ڕابردوو وەکو دیاردەیەکی مرۆیی بەدەر لە قەناعەتی ئەخلاقی. نیچە ***Nietzche*** لە وتارە بەناوبانگەکەی‌دا "بەکارهێنان و چەوت بەکارهێنانی مێژووو ***The Use and Abuse of History***" هاودژی نێوان ئەم مەودا گرتنە مێژووییەو ویستی دەسبەجێی ئەخشاندنی شتەکان کە پەیوەستن بە ئێستاوە

گەلاڵە کرد. لە هەمان کات دا چەندین سەرەنجامی ئەو شتەی ئاشکرا کرد کە خۆی پێی دەوت "ئەسکەندەری ***Alexandrian***" شێوەی لاوازبووی ویست، کە لە زانستی مێژوویی نوێدا دەبینرێت. رەنگە ئەو تاوانبارکردنەی نیچە کە دەیدایە پاڵ لاواز هەڵسەنگاندن یاد بهێنینەوە کە بەسەر یادەوەری مۆدێرن دا هاتوە، چونکە هێندە راهاتووە لە روناکیە هەردەم جیاوازو گۆڕاوەکاندا بیر لە شتەکان بکاتەوە کە نابینا بووەو ناتوانێت بگاتە رایەکی تایبەت بەخۆی لەسەر ئەو بابەتانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکات. ناتوانێت بریار لەسەر دیاریکردنی پێگەی خۆی بدات رووبەڕووی ئەو شتەی بەرەو رووی دەبێتەوە. نیچە لە پشت ململانێی نێوان جیهانی نامۆبووی مێژوویی‌و هێزەکانی ژیانی ئێستاکێوە بەهای کوێرێتی بابەتگەری مێژوویی ***historical objectivism*** دیاریدەکات.

بە دڵنیایی، نیچە شاهیدێکی شاگەشکەیە. بەڵام لەم سەد ساڵەی دواییدا ئەزموونی واقیعیمان لەسەر ئاگایی مێژوویی ***Historical Conscioness*** فێرکردین، کە چەندین دژواری گران لە بانگەشەکەی نیچەوە بۆ بابەتێتی مێژوویی گلاون. تەنانەت لەو شاکارانەی لێکۆڵینەوەی کلتووری مێژووییدا کەوا دەردەکەون بە ئەنجام گەیشتنی خامۆش بوونی تاك بن وەك چۆن لەلایەن ***Ranke*** وە بانگەشەی بۆ کرا، هێشتا ئەوە بنەمایەکی پرسیار لێنەکراوی ئەزموونی زانستیمانە کە دەتوانین ئەم کارانە بە وردبینیەکی زۆرەوە بە گوێرەی ئاراستە سیاسیەکانی ئەو کاتەی تیایدا نووسراون پۆلێن بکەین. کاتێك "مێژووی رۆما ***History of Rome***"ی مۆمسێن ***Mommsen*** دەخوێنینەوە دەزانین کە ئەم کارە بەتەنها لە نووسینی ئەوەو دەتوانین ئەو بارودۆخە رامیاریە دەستنیشان بکەین کە ئەم مێژوو نووسە تیایدا بەشێوازێکی مانابەخش دەنگەکانی رابردووی رێکخستووە. هەمان شت لە حاڵەتی ***Treitchke*** یان ***Sybel*** دا دەزانین، بە هەڵبژاردنی چەند ناوێکی کەمی مێژووی نووسراوی پروسی ***Prussian***. پێش هەموو شتێك ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە سارایای واقیعی ئەزمونی مێژوویی گوزارشتی خۆی لە شارەزایی میتۆدی مێژووییدا نادۆزێتەوە. کەس مشتومڕ لەسەر ئەو راستیە ناکات کە کۆنترۆڵکردنی راپێشوەختەکان ***Prejudices*** ی ئێستای خۆمان تا ئەو رادەیەی کەبە هەڵە لە شاهیدەکانی رابردوو نەگەین ئامانجێکی گرنگە، بەڵام بێگومان ئەو چەشنە کۆنترۆڵە بەتەواوی ئەرکی تێگەیشتنی رابردوو و گواستنەوەکانی بە جێناگەیەنێت.

لە راستیدا، پێدەچێت ئەو قسە زۆر راست بێت کە لە لێکۆڵینەوەی کلتووری مێژووییدا تەنها شتە ناگرنگەکان رێگەی نزیك بوونەوەمان دەدەن لەم ئایدیالەی بە تەواوتی نەمانی بوونی تاکایەتی، لە کاتێکدا بەشێکی گەورەی دەستکەوتە بە بەرهەمەکانی لێکۆکڵینەوەی کلتووری شتێك لە ئەفسونی مەزنی شکانەوەی راستەوخۆی رابردو لە ئێستاکێدا و ئێستا لە رابردوودا دەپارێزن. زانستی مێژوویی دوەم ئەزمون کە لێوەی دەستپێدەکەم، تەنها گوزارشت لەیەك بەشی ئەزمونی واقعیمان دەکات. (رووبەڕووبوونەوەی واقیعیمان لەگەڵ ترادسیۆنی مێژووییدا) و تەنها شێوەیەکی نامۆبووی ئەم ترادسیۆنە مێژووییە دەناسێت.

دەتوانین ئاگایی هێرمونتیکی بەراوردی ئەم نمونانەی نامۆبوون بکەین وەکو ئەگەرێکی زۆر بەرفراوان کە پێویستە گەشەی پێدەین. بەڵام

هەر لە باری ئەم ئاگاییە هێرمونتیکیەدا ئەرکی سەرەکیمان زاڵ بوونە بەسەر کورتبڕی ئەپستمۆلۆجی *epistmological truncation* کە بەهۆیەوە زانستی هێرمێنیوتیکی باو لەناو بیرۆکەی زانستی مۆدێرن دا قاڵ بووە. ئەگەر لە هێرمۆنتیکاکەی شلێرماخەر ***Schleiermacher*** وردبینەوە دەبینین دیدی ئەو لەسەر ئەم دیسپلینە بە شێوەیەکی زۆر سەیر بە ئایدیای زانستی مۆدێرن گەمارۆ دراوە. هێرمۆنتیکاکەی شلێرماخەر ***Schleiermacher***، ئەو وا پیشان دەدات کە دەنگێکی سەرەکی رۆمانتیسیزمی مێژوویی بێت ***Historical romanticism***. بەڵام لە هەمان کاتدا بە شێوەیەکی روون لە یادەوەریدا گرنگی تیۆلۆجیای مەسیحی پاراستوە ***Christan theology*** بەو مەبەستەی هیرمونیتیکاکەی وەکو ڕێبازێکی گشتی هونەری تێگەیشتن، خاوەن گرنگیەکی تایبەتی بێت لەکاری تایبەتی راڤەکردنی کتێبی پیرۆزدا ***Scripture***. شلێرماخەر ***Schleiermacher*** هیرمونتیکا وەکو هونەری دوورکەوتنەوە لە تێنەگەیشتن پێناسە دەکات.

بۆ رێگری کردن بەهۆی کۆنترۆڵی بیرکردنەوەی میتۆدیەوە کە هەرچۆنێك بێت نامۆیەو بەرەو تێنەگەیشتن ئاراستە دەگرێت – تێنەگەیشتن بەهۆی مەودای زەمەن و گۆڕان لە بەکارهێنانە زمانەوانیەکان یاخود لەماناى وشەکان و شێوازەکانی بیرکردنەوەدا بە ئێمە دەگات– کە بێگومان زۆر دوورە لە وەسفێکی ناماقوڵی هەوڵی هێرمۆنتیکیەوە. بەڵام هەروەها پرسیارەکە بەم جۆرەش قوت دەبێتەوە کە گەر دیاردەی تێگەیشتن بە شێوەیەکی شیاو پێناس کرابێت کاتێك کە دەڵێین بۆ ئەوەی تێبگەیت دەبێت دورکەویتەوە لە تێنەگەیشتن. ئایا لە راستیدا کێشەکە ئەوە نیە کە هەموو تێنەگەیشتنێك "رێکەوتنێکی گشتی قووڵ" پێویستی دەکات؟

من لێرەدا هەوڵ دەدەم سەرنج بۆ ئەزموونێکی گشتی رابکێشم. بۆ نموونە ئێمە دەڵێین کە تێگەیشتن و تێنەگەیشتن لە نێوان (من و تۆ)دا روودەدەن. بەڵام کەلالەی (من و تۆ) دەستبەجێ ناپاکی لەنامۆییەکی مەزن دەکات. بەهیچ شێوەیەك شتێکی وەکو (من و تۆ) بوونی نیە –نە من و نە تۆ وەکو دابڕاو و واقیعە مادییەکان بوونمان نیە. رەنگە من بڵێم (تۆ) و رەنگە مەبەستم خۆم بێت بەرامبەر بە (تۆ)یەك، بەڵام تێشگەیشتنی گشتی *[Comman Understanding- Verstandigung]* هەمیشە پێش ئەم حاڵەتانە دەکەوێت. ئێمە هەموو دەزانین بۆ وتنی (تۆ) بە کەسێك پێویست بە رێکەوتنێکی گشتی قوڵ دەکات *[deep Common understanding- tiefes Einverstadnis]* کاتێك ئەم وشەیە دەوترێت شتێکی درێژخایەن لەو کاتەدا ئامادە دەبێت. کاتێك هەوڵدەدەین بگەینە رێکەوتنێك لەسەر گرفتێك کە ڕای جیاوازمان لەسەری هەیە، ئەم فاکتەرە بەهێزە هەمیشە رۆڵی خۆی دەبێت تەنانەت گەر بە دەگمەنیش ئاگاداریمان لێی هەبێت. ئێستا زانستی هێرمونتیکی دەیەوێت ئێمە بڕوا بهێنین کە ئەو ڕایەی بۆ تێگەیشتن هەمانە شتێکی نامۆیە کە هەوڵدەدات بەلاڕێدا بمانبات بەرەو تێنەگەیشتن، ئەرکی ئێمەش رێگیریکردنی هەموو یەکەیەکە کە لە رێگەیەوە تێنەگەیشتن دزە بکات بۆ ناومان. ئێمە ئەم ئەرکە بەهۆی رێو شوێنێکی کۆنترۆڵکراوی راهێنانی مێژووییەوە بە ئەنجام دەگەیەنین، بەهۆی رەخنەی مێژوویی و میتۆدێك کە بتوانرێت

سەبارەت بە دەسەڵاتەکانی هاوسۆزی سایکۆلۆژی Psychological empathy کۆنترۆڵ بکرێت. بەلای منەوە ئەم پێناسەیە لەیەك رووەوە گرنگە، بەڵام هێشتا هەر پێناسەیەکی لاوەکی (جزئی) دیاردەیەکی سەراپاگیری ژیانە کە ئەو (ئێمە)یە پێك دەهێنێت کە هەموو ئێمەین. بەلای منەوە تێپەڕاندنی ڕا پێش وەختەکانە Prejudices کە بناغەی ئاگایی ئیستاتیکی و ئاگایی مێژوویی و ئاگایی هێرمونتیکی پێکدەهێنێت کە کورتکراوەتەوە بۆ تەکنیکێك بۆ دوورکەوتنەوە لە بەهەڵە تێگەیشتنەکان و زاڵبوون بەسەر ئەو نامۆبوونانەی کە لە هەموویاندا هەن.

کەواتە ئەو شتە چیە کەوا دەردەکەوێت لەم سێ ئەزمونەدا پشت گوێ خرابێت و ئەوە چی کە هێندە هەستیارمان دەکات بەرامبەر خاڵی جیاکەرەوەی ئەم سێ ئەزموونە؟ ئاگایی ئیستاتیکی چیە کاتێك کە بەراورد بکرێت بە تەواوی ئەو شتەی کە پێشتر ئاراستەی کردووین ئەوەی کەلە هونەردا پێی دەڵێین کلاسیکی (Classical)؟

ئایا هەمیشە بەم جۆرە بۆ ئێمە دەستنیشان نەکراوە کەچی بۆ ئێمە بە گوزارشت دەبێت و چی بەگرنگ بزانین؟ هەر کاتێك گەر تەئانەت چەوتیش بێت بە رەهاییەکی وارسکیەوە (غریزی) [بەڵام رەهاییەك کە بە شێوەیەکی سەرەتایی گرنگ بێت بۆ ئاگایمان] بڵێین "ئەمە کلاسیکەو درێژە دەکێشێت" ئەوەی قسەی لێدەکەین لەم کاتەدا شیمانەکەمانی بۆ هەڵسەنگاندنی ئیستاتیکی بە ئەنجام گەیاندوە.

هیچ پێوانەی بنەڕەتی پەتی لە بەردەستدا نین کە بتوانن ئاستی پێکهاتوو بە سانایی لەسەر بناغەی چێژی هونەری بەرز هەڵبسەنگێنن و پشت راستیبکەنەوە. بوونی هەستیاری رۆحیمان زیاتر لە ژوورێکی ئیستاتیکی زرنگانەوە دەچێت کە بەو دەنگانە دەزرنگێتەوە کە بە بەردەوامی پێمان دەگەن و پێش هەموو هەڵسەنگاندنێکی روونی ئیستاتیکی دەکەون.

بارودۆخەکە هاوشێوەی ئاگایی مێژووییە. هەروەها لێرەشدا، پێویستە دان بەوەدا بنێین کە بێشومار ئەرکی لێکۆڵینەوەی مێژوویی هەن کە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندیان بە ئێستای خۆمانەوەو بە قوڵایی ئاگاییە مێژووییەکەیەوە نیە. بەڵام بەلای منەوە هیچ گومانی تێدا نیە کە ئاسۆی فراوانی رابردو کە لەوەوە کلتووری ژیانی ئێستامان بوونیان بە دەستهێناوە، لەهەر شتێکدا کە دەمانەوێت، هیوای بۆ دەخوازین یاخود لە ئایندەدا لێیدەترسێین کاریگەریمان لێدەکات. مێژوو تەنها لەبەر تیشکی ئایندەگەریدا ئامادەیە بۆ ئێمە. لێرەدا ئێمە هەموو لە هایدگەرەوە فێربوین؛ چونکە ئەو پڕاوپڕ لە پێشێتی ئایندەیی شیمانەی یادو بیرەوەریمان و سەراپای مێژووشمانی پیشان دا.

هایدگەر لە رێبازەکەیدا ئەم لە پێشێتیەی (الأولية) رێبازی بە بەرهەمی بازنەی هێرمێنیوتیکی دامێنا. من ئەم کەڵاڵەیەی خوارەوەم لەسەر ئەم دیدگایەوە پێشکەش کردوە: ئەوەندەی راپێشوەختەکانمان بوونمان پێك دەهێنن ئەوەندە هەڵسەنگاندانەکانمان نین. ئەمە کەڵاڵەیەکی پرسیار وروژێنەرە چونکە من بەکاری دەهێنم تا چەمکی پۆزەتیڤی راپێشوەخت جێگەی شایستەی خۆی بەدەست بهێنێتەوە کە بەهۆی رۆشنگەری فەرەنسی و ئینگلیزیەوە لە بەکارهێنانی زمانەوانیماندا وەدەرهێنرابوو. دەتوانرێت پیشان بدرێت کە چەمکی راپێشوەخت لە رەچەڵەکدا ئەو مانایەی

نەبووە کە ئێمە خستومانەتە پالّی. ڕاپێشوەختەکان بە زەرورەت نارەواو چەوت نین تا بەو پێیەش بە شێوەیەکی حەتمی ڕاستی بشێوێنن. لە ڕاستیدا مێژوویی‌بوونی بوونمان ئەو ڕاپێشوەختانە دەسەپێنێت، بە مانای ڕاستەقینەی وشە دەستپێکی ڕاستەوخۆیی سەراپای توانای ئەزمونکردنمان پێك دەهێنن. ڕاپێشوەختەکان بناغەکانی کرانەوەمانن بۆ جیهان. بە سانایی ئەو مەرجانەن کە بە هۆیانەوە ئەزموونی شتێك دەکەین -کە بە هۆیانەوەی ئەوەی رووبەڕووی دەبینەوە شتێکمان پێدەڵێت. بێگومان ئەم گەلاڵەیە ئەوە ناگەیەنێت کە ئێمە لە شورایەکی ڕاپێشوەختەکاندا خۆمان قەتیس دابنێت و تەنها لە ڕێگەی ڕارەوێکی تەنگەوە ڕێگە بە تێپەڕینی ئەو شتانە بدەین کە دەتوانن وشە تێپەڕینێ (پاس ۆردی– *Paass Saying*) "هیچ شتێکی نوێ ناتوانرێت لێرەدا بوترێت" بەرهەم بهێنن. لە جیاتی ئەوە ئێمە تەنها پێشوازی لەو میوانە دەکەین پەیماندەدات شتێکی نوێ بە (فزولّیەتمان) بلێت. بەلاّم چۆن دەزانین ئەو میوانە ئەو کەسەیە کە دانمان پیادا ناوە شتێکی نوێی هەیە پێمان بلێت؟ ئایا پێشبینی و ئامادەباشیمان بۆ بیستنی نوێ بەزەرورەت لەلایەن ئەو شتە کۆنەوە دەستنیشان نەکراوە کە باڵی بەسەرماندا کێشاوە؟

چەمکی ڕاپێشوەخت زۆر بەتوندی گرێدراوە بە چەمکی دەسەلاتەوە، و وێنەکەی سەرەوە روونی دەکاتەوە کە پێویستیەکی زۆری بە بوژانەوەی هێرمێنیوتیکی‌یە. هەرچۆنێك بێت ئەم وێنەیەش وەکو هەموو وێنەیەکی تر خەلّەتێنەرە. سروشتی ئەزمونی هێرمونتیکی ئەوە نیسە کە شتێك لە دەرەوەیەو ئارەزوی دان پیانان دەکات. زیاتر ئێمە لەلایەن شتێکەوە دەستمان بەسەردا گیراوە بەتایبەتیش بەهۆی ئەوەوە ئێمە والاکراوین بۆ نوێ، بۆجیاواز، بۆ ڕاست. ئەفلاتون لە بەراوردە جوانەکەیدا لەنێوان خواردنەکانی جەستە لەگەلّ خۆراکی رۆحی ئەمە روون دەکاتەوە، لەکاتێکدا دەتوانین ئەوەی پێشەوەیان رەتبکەینەوە (بۆ نموونە بەهۆی ڕێنمایی پزیشکێکەوە) ئەوەی دواییمان پێشتر بۆخۆمان وەرگرتوە. بەلاّم ئەو پرسیارەی کە ئێستا بەرزدەبێتەوە ئاوایە؛ چۆن ئەم مەرجداریە هێرمونتیکیەی بوونمان قانونی بکەین لە بەردەم زانستی مۆدێرندا، کە لەگەلّ بنەمای بێ لایەن بوون و دادپەروەربووندا خۆدەگرێت یاخود دەڕمێت.

بێگومان ئێمە ئەم قانونی بوونە بەهۆی ڕێنمایی کردنی زانست و پشت ڕاستکردنەوەی ئەوەی کە دەبێت پابەند بێت بە بنەماکانیەوە بە جێناگەیەنین بەدەر لەو ڕاستیەش کە ئەو جۆرە بایەنکردانە هەمیشە لە بارەیانەوە شتێکی پێکەنیناوی هەیە. زانست ئەم کارە بۆ ئێمە ناکات. ئەو لەسەر ڕێگەی خۆی بەردەوام دەبێت لەگەلّ زەرورەتی ناوەکی پشت کۆنترۆلّیەوەو زانیاری هەست بزوێن و دەسەلاتی کۆنترۆلکردنی زیاترو زیاتر بەرهەم دەهێنێت. رەنگە هیچ ڕێگەیەکی تر نەبێت. بۆ نموونە، شتێکی بێ‌مانایە لێکۆلّەرەوەیەکی جینات (زانستی بۆماوەیی) ڕێگیری بکرێت چونکە ئەو جۆرە لێکۆڵینەوەیە هەڕەشە لە لەدایك بوونی سۆپەرمانێك دەکات. لێرەوە گرفتەکە ناتوانێت وەکو گرفتێك دەرکەوێت کە تیایدا لە دەرەوەی ئاگایی مرۆڤ دژ بە جیهانی زانست پێگەی خۆی بکرێت و بەخۆی رەوا ببینێت گەشە بە جۆرێك دژە زانست بدات.

لەگەلّ ئەوەشدا ناتوانین خۆ لەو پرسیارە لابدەین کە گەر ئەوەی لەو چەشنە نموونە بێ

زیانانەدا لێی ئاگادارین کە وەکو ئاگایی ئیستاتیکی‌و ئاگایی مێژوویی دەردەکەون گرفتێك نەنوێنن کە هەروەها لە زانستی سروشتی مۆدێرنیشدا هەیەو لە رەفتاری تەکنەلۆژیاشماندا بەرامبەر بەجیهان. گەر زانستی نوێ تواناداڕمان بکات جیهانێکی نوێی ئامانجە تەکنەلۆژییەکان دابمەزرێنین کە هەموو شتێکی دەوروبەرمان دەگۆڕێت بەهۆی ئەوەوە ئێمە پێشنیار ناکەین کە ئەو لێکۆڵەرەوەیەی زانیاری تەواوی بەدەستهێنا یەکلابکەرەوەیە بۆ ئەم رادەیەی کارەکان تەنانەت بە لەبەرچاوگرتنی پیادەکاریە تەکنیکیەکانیش. دەبێت لێکۆڵەرەوەی راستەقینە بەهۆی ئارەزوویەکەوە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری هان درابێت نەك هیچ شتێکی تر. هێشتاش، دژ بە سەراپای شارستانیەتمان کە لە لایەن زانستی نوێوە دامەزراوە دەبێت بە بەردەوامی بپرسین گەر شتێك هەبێت پەڕێنرابێت. ئەگەر ئەگەرە پێشوەختەکانی ئەم شیمانانەی زانین نیوە لە تاریکیدا بهێڵرێنەوە، ئایا سەرەنجام ئەوە نابێت کە ئەو دەستەی ئەم (مەعریفە) پیادە دەکات وێرانکەر بێت.

گرفتەکە بە راستی سەراپاگیرە وەکو دەستنیشانم کرد پرسیاری هێرمونتیکی سنووردار نەکراوە بۆ ئەو بوارانەی کە من لە بەدواداچوونەکەی خۆمدا لێیانەوە دەستم پێکرد. لەوێدا تاکە شتی جێگەی بایەخم دەستەبەرکردنی بناغەیەکی تیۆری بوو کە بتوانێت تواناداڕمان بکات لە فاکتەری سەرەکی کلتووری هاوچەرخ بکۆڵینەوە، واتا، زانست و پیشەسازیەکانی‌و بە کەڵك کردنی تەکنەلۆژیا. ئامارەکان نمونەیەکی بەکەڵکمان پێدەدەن کە چۆن رەهەندی هێرمێنیوتیکی گەمارۆی سەراپای ڕێو شوێنی زانست دەدات. ئەوە نموونەیەکی ئەوپەڕە، بەڵام پیشانمان دەدات کە زانست هەمیشە لەژێر باری مەرجە دیاریکراوەکانی میتۆدۆلۆژیای ئەبستراکدایە و سەرکەوتنەکانی زانستی مۆدێرن پشت بەو راستیە دەبەستن کە ئەگەرەکانی تری پرسیارکردن بەهۆی ئەبستراکت بوونەوە راگیراون. ئەم راستیە لەباری ئامارەکاندا روون و ئاشکرا دەبێت چونکە خەسڵەتی پێشبینی کاری، ئەو پرسیارانەی ئامارەکان وەڵامیان دەدەنەوە بە تایبەتی شیاویان دەکات بۆ مەبەستە پروپاگەندەییەکان. لە راستیدا پروپاگەندەی کاریگەر دەبێت هەمیشە هەوڵ بدات بە شێوەیەکی بنەڕەتی کار لە هەڵسەنگاندنی ئەو کەسە بکات کە ئاراستەی کراوەو گەمارۆی ئەگەرەکانی هەڵسەنگاندنی ئەو کەسە بدات. بەم جۆرە ئەوەی لەلایەن ئامارەکانەوە دامەزراوە وا دەردەکەوێت زەمانێك بێت بۆ راستیەکان، بەڵام ئەم راستیانە وەڵامی کام پرسیارانە دەدەنەوە و کام راستیانە دەکەونە قسەکردن گەر پرسیاری تر کران و پرسیاری هێرمێنیوتیکی بوون. تەنها بەدواداچوونێکی هێرمێنیوتیکی وەڵامی ئەم راستیانە قانونی دەکات و بەم جۆرەش ئەو بەرەنجامانەی بە دوایاندا دێن. بەڵام من تەنها پێشبینی دەکەم و بەبێ مەبەستیش شێوەی "کام وەڵامانەی پرسیارەکان شیاون بۆ راستیەکان"م بەکارهێنا.

ئەم گوزارەیە لە راستیدا دیاردەی هێرمێنیوتیکایە *Urphanomen*. هیچ جەخت کردنێك مومکین نیە کە نەتوانرێت وەکو وەڵامێك بۆ پرسیارێك تێگەیشتنی بۆ بکرێت و تەنها بەم رێگەیەش دەتوانرێت تێگەیشتنی بۆ بکرێت و تەنها بەم رێگەیەش دەتوانرێت تێگەیشتن بۆ جەخت کردن هەبێت.

ئەوەش بەلایەنی کەمەوە میتۆدۆلۆژیای بە گوزارشتی زانستی مۆدێرن ناشێوێنێت. هەر کەسێك بیەوێت زانستێك فێربێت دەبێت فێربێت شارەزای میتۆدۆلۆژیاکەی بێت. بەڵام ئێمە دەشزانین کە میتۆدۆلۆژیا بەو چەشنە بەهیچ شێوەیەك بە بەرهەمی پیادەکردنەکەی مسۆگەر ناکات. هەر ئەزموونێکی ژیان دەتوانێت ئەو راستیە پتەو بکات کە شتێکیوەکو بێ بەرهەمی میتۆدۆلۆژیا بوونی هەیە، ئەمەش واتای پیادەکردنی میتۆدێك بەسەر شتێکدا کە لە راستیدا شایستەی زانین نیە، شتێك کە لەسەر بناغەی پرسیارێکی راستەقینە نەکراوەتە بابەتی لێکۆڵینەوە.

بێگومان خود ئاگایی میتۆدۆلۆژی زانستی مۆدێرن دژ دەوەستێتەوە بەم گفتوگۆیە. بۆ نموونە مێژوونووسێك لەوەڵامدا دەڵێت: تەواو شتێکی جوانە قسە لەبارەی ئەو ترادسیۆنە مێژووییە بکرێت کە تیایدا دەنگەکانی رابردوو مانای خۆیان بەدەست دەهێنن و لەو رێگەیەشەوە راپێشوەختەکان کە بڕیار لەسەر ئێستا دەدەن ئیلهامیان وەرگرتوە. بەڵام بارەکە تەواو جیاوازە لە پرسیارەکانی لێکۆڵینەوەی مێژوویی جدیدا. بۆ نموونە چۆن کەسێك بەجدی مەبەستی بێت کە روونکردنەوەی پیادەکردنەکانی باج لە شارەکانی سەدەی پانزدەهەمدا یاخود نەریتەکانی هاوسەرێتی ئەسکیمۆکان بە شێوەیەك لە شێوەکان مانای خۆیان لە ئاگایی ئێستاکیو پێشبینیەکانیەوە وەردەگرن؟ ئەمانە پرسیاری مەعریفەی مێژوویین کە ئێمە وەکو چەند ئەرکێکی تەواو سەربەخۆ لەهەر پەیوەندیەك بە ئێستاوەو لەخۆیان دەگرین.

لە وەڵامی ئەم رەتکردنەوەیەدا کەسێك دەتوانێت بڵێت کە ئەوپەڕی توندی ئەم بۆچوونە هاوشێوەی ئەوە دەبێت کە لە چەند ئاسانکاریەکی لێکۆڵینەوەی پیشەسازیدا دەیبینین لە سەرو هەموویانەوە لە ئەمریکاو روسیادا. من مەبەستم لەو بەناو ئەزمونگەریە هەرەمەکیەیە کە تیایدا کەسێك مادەیەك دادەپۆشێت بەبێ بەهەند وەرگرتنی بەفیڕۆچوون و تێچوون، بەدانە دەستی شانس کە رۆژێك بەهۆی پێوانەیەکەوە لە نێوان هەزاران پێوانەدا لەکۆتاییدا دەبێتە دۆزینەوەیەکی گرنگ، واتا، دەبێتە وەڵام بۆ پرسیارێك کە لێیەوە کەسێك دەتوانێت پێشبکەوێت. گومانی تێدانیە کە لێکۆڵینەوەی نوێ لە زانستە مرۆڤایەتیەکاندا تاڕادەیەك بەم شێوازە کاردەکات. بۆ نموونە کەسێك بیر لە بڵاوکراوە زۆرەکان و بەتایبەتیش وشە رەها هەمیشەییەکانی فەهرەستەکان دەکاتەوە. بێگومان پێویستە ئەوە بە پرسیارێکی واڵا بمێنێتەوە، گەر بەهۆی ئەو جۆرە رێوشوێنەوە لێکۆڵینەوەی مێژوویی نوێ هەلەکانی بە راستی سەرنجدانی راستیە گرنگەکان زیاتر بکات و بەم جۆرەش دەوڵەمەندیەکی هاوشێوەی مەعریفەی خۆمانی لێوە بەدەستبهێنین. بەڵام گەر تەنانەت واش بکات، رەنگە کەسێك بپرسێت: ئایا ئەمە ئایدیالێکە کە بێشومار پرۆژەی لێکۆڵینەوەکان (واتا دیاریکردنی ناراستەی پێکەوە گرێدانی راستیەکان) لە هەزار مێژوو نووسێکەوە وەرگیراون، تا مێژوونووسی هەزارو یەکەم بتوانێت شتێکی گرنگ بدۆزێتەوە؟ بێگومان من کاریکاتۆری کلتوورێکی لێکۆڵینەوەیی راستەقینە دەکێشم. بەڵام لە هەموو کاریکاتۆرێکدا کەمەکێك لە راستی هەیە، ئەم دانەیەش وەڵامێکی ناراستەوخۆی پرسیاری چی بەراستی لێکۆڵەرەوەی کلتووری بە بەرهەم دروست دەکات لە خۆدەگرێت، کە میتۆدەکان فێربوە؟

ئەو کەسەش کە هەرگیز شتێکی نوێ بەرهەم ناهێنێت هەروەها ئەم کارەی کردووە. ئەوە خەیاڵە (*Phantasie*) کە ئەرکی یەکلاکەرەوەی لێکۆڵەرەوەی کلتوورییە. خەیاڵ ئەرکێکی هێرمێنیوتیکی هەیەو خزمەت بەو مانایە دەکات کە جێگەی پرسیارکردنیەتی. خزمەتی توانای دەرخستنی راستی، پرسیارە بە بەرهەمەکان، دەکات و شتێك کە تیایدا بەگشتی تەنها ئەو کەسەی کە شارەزایی هەموو میتۆدەکانی زانستەکەیەتی سەرکەوتوو دەبێت.

وەکو قوتابیەکی ئەفلاتون **Plato**، من بەتایبەتی حەزم لەو دیمەنانەیە کە تیایاندا سوقرات **Socrates**، دەکەوێتە مشتومڕێکەوە لەگەڵ سوفیستە **Sophist Virtuosi** و بەهۆی پرسیارەکانیەوە بەرەو نائومێدی رایان دەکێشێت. لە کۆتاییدا ناتوانن چیتر بەرگەی پرسیارەکانی بگرن و بانگەشەی رۆڵی پەسەندکراوی پرسیارکەر بۆ خۆیان دەکەن. بەڵام چی روودەدات؟ ناتوانن بیر لە هیچ شتێك بکەنەوە بۆ پرسیارکردن. هیچ شتێکیان بە خەیاڵدا نایەت کە شایستەی پرسیار لێکردن و هەوڵی وەڵامدانەوە بێت.

من لەم سەرنجەوە ئەم ئەنجامگیرییەی خوارەوەم هەڵهێنجا. دەسەڵاتی راستەقینەی ئاگایی هێرمونتیکی توانای بینینمانە بۆ ئەو شتەی جێگەی پرسیارکردنە. گەر ئەوەی ئێستە لەبەر چاوەکانماندایە هەر بە تەنها نەریتی هونەری گەلێك نەبێت، یاخود ترادیسیۆنێکی مێژوویی، یان بنەمای زانستی مۆدێرن لە مەرجە بنەڕەتیە هێرمۆنیکیەکەیدا بەڵکو راستر بڵێین سەراپای ئەزمونمان، ئەو کاتە بەڕای من ئێمە سەرکەوتووین لە گرێدانی ئەزمونی زانست بە ئەزمونی گەردوونی و ژیانی تایبەتی مرۆڤانەی خۆمانەوە. ئەوا تاڕادەیەك گەیشتوینەتە ئاستی بنەڕەتی ئەوەی کە دەتوانین لەگەڵ جۆهانز لۆهمان (*Johannes Lohmann*) دا پێی بڵێین "پێکهاتەی زمانەوانیانەی جیهان". کە خۆی وەکو ئەو ئاگاییە پێشکەش دەکات لە لایەن مێژووەوە کاریگەری لێکراوە (*Wirkungsgeschichtliches Bewasstsein*) و هێڵکاریەکی بنەڕەتیش بۆ هەموو ئەگەرەکانی زانینمان دەخاتە بەردەست.

من ئەو راستیە وەلاوە دەنێم کە لێکۆڵەرەوە (تەنانەت زانای سروشتیش) هەرچۆنێك بێت بە تەواوەتی ئازاد نیە لەخوو و نەریت و کۆمەڵگاو لەهەموو هۆکارو ئەگەرەکانی دەروبەرەکەی. ئەوەی من مەبەستمە بە کورتی ئەوەیە کە لە چوارچێوەی ئەزمونە زانستیەکەیدا ئەوە هێندە "یاسای ئەنجامگیریە قەڵغان پۆشکراوەکان" نین (*Helmholz*) کە بیرۆکە بە بەرهەمەکانی پێشکەش دەکەن بەڵکو زیاتر کۆمەڵە ئەستێرە پێشبینی نەکراوەکانن کە پریشکی ئیلهامی بۆ دادەگیرسێنن (بۆ نموونە، سێوە بەریووەوەکەی نیوتن یاخود چەندین سەرنجی راگوزەری تر).

ئەو ئاگاییەی کە لە لایەن مێژووەوە کاریگەری لێکراوە بە جێگەباندنی خۆی هەیە لەوەدا کە زمانەوانیە. دەتوانین لە قوتابیەکی هەستیاری زمانەوە فێربیبن کە زمان لەخۆیداو لە رووداندا نابێت تەنها وەکو گۆڕان بیری لێبکرێتەوە، بەڵکو زیاتر وەکو شتێك کە چالاکیەکی تەلیلۆلۆجی لەناویدا هەیە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو وشانەی کە پێك هاتوون، ئەو ئامرازانەی کە گوزارشت کردن کەلە زمانێك دا دەردەکەون بۆ ئەوەی چەند شتێکی دیاریکراو بڵێین، هەر لەخۆوە جێگیر نەبوون، چونکە جارێکی تر هەموو بەیەکەوە ناکەونەوە ناو

بەکارنەهێنانەوە. لە جیاتی ئەوە بەیەکەوە گرێدانێکی دیاریکراوی جیهان بنیاتنراوە – پرۆسەیەك کە وا کاردەکات وەکو ئەوەی رێنومایی کرابێت و پرۆسەیەك کە هەمیشە دەتوانین لەو منالانەدا سەرنجی بدەین کە فێری قسەکردن دەبن.

دەتوانین ئەمە لە برگەیەکی *Posterior Analytics* (شیکردنەوەی رەهەندی) ی ئەرستۆ *Aristotle* دا روون بکەینەوە کە بە شێوەیەکی دامێنەرانە یەك لایەنی دیاریکراوی پێکهاتنی زمان وەسف دەکات. برگەکە چارەسەری ئەو شتە دەکات کە ئەرستۆ پێی دەڵێت *epagoge* کە واتا پێکهاتنی گەردوونی.

چون کەسێك دەگاتە گەردونیەت؟ لە فەلسەفەدا ئێمە دەڵێین: چۆن دەگەینە چەمکێکی گشتی، بەڵام تەنانەت وشەکانیش بەم مانەیە بە شێوەیەکی ئاشکرا گشتین. چون ئەوە رودەدات کە ئەوانە "وشەبن"، واتا، مانایەکی گشتیان هەیە؟

لەیەکەم درك بەخۆکردنیدا بوونەوەی بە شێوەیەکی حسیی تەیاربوو خۆی لە دەریایەکی بە شەپۆلی بێداریدا دەبینێتەوە، وەکو دەڵێین، رۆژێك دەست دەکات بە زانینی شتێك. ئەوەی ئاشکرایە ئێمە مەبەستمان نیە بڵێین کە لەوەو پێش نابینابوە. زیاتر کاتێك دەڵێین (زانین– *to know*) *[erkennen]* مەبەستمان "درك کردنە *(to recognize [Wiedererkennen]* کە واتا ناسینەوەی شتێك *[heranserkennen]* لە جۆگەلەی وێنەکاندا کە وەکو خودی خۆی لە رابردووەوە هەڵدەقوڵێت.

ئەوەی بەم رێگەیە دەناسرێتەوە بە ئاشکرایی دەهێڵدرێتەوە. بەڵام چۆن؟ کەی منالێك بۆ جاری یەکەم دایکی دەناسێت؟ ئایا کاتێك کە بۆ یەکەم جار دەیبینێت؟ نەخێر. ئەی باشە کەی؟ چۆن ئەوە روودەدات؟ ئایا دەتوانین بڵێین بە شێوەیەکی رەها کە تاکە رووداوێك هەیە تیایدا زانینی یەکەم (بۆ یەکەمجار) منالەکە لە تاریکی نەزانین قوتاردەکات؟ ئەوەی بەلای منەوە رون و ئاشکرایە ئەوەیە کە ناتوانین ئەوە بسەلمێنین. ئەرستۆ بەشێوەیەکی سەرسورهێنەر ئەمەی وەسف کردوە. ئەو دەڵێت ئەو حاڵەتە هاوشێوەی حاڵەتی سوپایەکە کاتی هەڵاتن بەهۆی ترسەوە، تا ئەو کاتەی کەسێك دەوەستێت تابزانێت گەر دوژمن هێشتا بە شێوەیەکی ترسناك نزیك بێت لە دوایانەوە. ناتوانین بڵێین سوپاکە دەوەستێت کاتێك یەك سەرباز وەستاوە. بەڵام پاشان یەکێکی تر دەوەستێت.. سوپاکە ناوەستێت بەهۆی کاریگەری ئەو راستیەی کە دوو سەرباز دەوەستن. باشە کەی سوپاکە بە راستی دەوەستێت؟ لە پرتاو دەگاتەوە خاکی خۆی. لە پرتاو ملکەچی فەرمان دەبێتەوە جارێکی تر. لە وەسفەکەی ئەرستۆدا تیل نیشانێکی ئالۆز بەکارهاتووە، چونکە لە زمانی گریکیدا "فەرمان" واتا *arche* کەواتا *[بنەما principium]*کەی ئەم بنەمایە *principle* خۆی وەکو بنەما پێشکەش دەکات؟ لە رێگەی توانایەکەوە؟ ئەم پرسیارە لە راستیدا پرسیاری روودانی گەردوونیە.

گەر بە هەڵە لە لێکدانەوەکەی جۆهانز لۆهمان *Johanner Lohamns* تێنەگەیشتبم ئەم تیۆلۆجیایە بەتایبەتی لە ژیانی زماندا کاردەکات. کاتێك لۆهمان وەکو ئامرازەکانی مێژوو قسە لە بارەی مەیلەکانی (ئاراستەکانی) زمانەوانی دەکات کە تیایدا چەند فۆرمێکی تایبەتی فراوان دەبن، بێگومان دەزانێت کە لەم فۆرمانەی درك

کردندا روودەدات هی "پێگەیشتنە هەڵوێست" *[zUM- Stehen- Kommen]* وەکو وشە جوانە ئەڵمانیەکە وا دەڵێت. من بە سوربونەوە دەڵێم، ئەوەی ئاشکراکراوە شێوەی راستەقینەی چالاکی سەراپای ئەزموونی مرۆیمانە لەسەر جیهان. فێربوونی قسەکردن بە دڵنیایی قۆناغێکی بە بەرهەمی تایبەتیە، لە میانەی تێپەڕینی کات دا ئێمە هەموو زیرەکی تەمەنی *3*ساڵیمان گۆڕیوە بۆ بەهرەیەکی بێ کەڵك و لاواز. بەڵام لە کەلکخوازی لێکدانەوەی زمانەوانی جیهان دا کە لە کۆتاییدا روودەدات شتێك لە بەرهەمی سەرەتاکانمان بەزیندوویی دەمێنێتەوە. ئێمە هەموو ئاشنایەتیمان لەگەڵ ئەمەدا هەیە، بۆ نمونە لە هەوڵی وەرگێراندا لە ژیانی کردەوەییدا، لە ئەدەبدا یاخود لە هەر بوارێکی تر، ئەمەش مانای ئەوەیە لەو ماوە درێژەدا کە وشەی شیاومان نیە بۆی. کاتێك گوزارشتی دروستمان دۆزیەوە (مەرج نیە هەمیشە یەك وشە بێت) کاتێك دڵنیابووین کە ئەو گوزارشتەمان هەیە ئەوکاتە (پێگە) دەگرێت، ئەوکاتە شتێك دەبێت پێگەیەك بگرێت.

جارێکی تر هەڵوێستەیەکمان دەبێت لە ناوەڕاستی هرووژمی زمانێکی بێگانەدا، ئەم هەمە چەشنە بەکارهێنانە بێکۆتاییانەی ئەو زمانە وامان لێدەکات ناراستەمان لە دەستبدەین. ئەوەی من وەسفی دەکەم مۆدی سەراپای ئەزموونی مرۆڤە لە سەر جیهان. من بەم ئەزمونە دەڵێم هێرمێنیوتیکی، چونکە ئەو پرۆسەیەی وەسفی دەکەین بە بەردەوامی دووبارە بۆتەوە لە میانەی ئەزمونە ناسراوەکەمان دا. هەمیشە جیهانێك هەیە کە راڤەکراوە، لە پەیوەندییە سەرەکیەکانیدا رێك خرواە، کە ئەزموون بۆ ئەو هەنگاو دەنێت وەکو شتێکی نوێ، ئەو شتە ئاوەژوو دەکات کە بۆچوونەکانمانی ناراستەکردوە و خۆی بە درك پێکردن دا تێپەڕاند لەو گۆڕانە کوت و پڕەدا. بە هەڵە تێگەیشتن نامۆبوون یەکەم فاکتەرەکان نین، کەواتە ئەو خۆلادانە لە بەهەڵە تێگەیشتن دەتوانرێت وەکو ئەرکی تایبەت بە هێرمۆنتیکا تەماشا بکرێت.

کێشەکە تەواو پێچەوانەی ئەمەیە. تەنها پشتگیری تێگەیشتنی ناسراو و گشتی سەرکێشی بۆ ناو نەزانراو (ممکن) دەکات و ئاشکراکردنی شتێك لە نەزانراوەوە، بەمجۆرش ئەزموونی خۆمان لەسەر جیهان فراوان و دەوڵەمەند دەکات.

ئەم مناقەشەیە دەری دەخات کە دەبێت بە چ شێوەیەك بانگەشەی سەراپاگیری کە بۆ رەهەندی هێرمێنیوتیکی گونجاوە تێگەیشتنی بۆ بکرێت. تێگەیشتن بەندە بە زمانەوە. بەڵام ئەم جەختکردنە ئێمە بەرەو هیچ جۆرە رێژەگەریەکی زمانەوانی نابات. ئەوە راستە کە ئێمە لەناو زمانێك دا دەژین، بەڵام زمان سیستەمێکی ئەو ئاماژانە نیە کە بە یارمەتی تەلەگرافێکەوە رەوانەیان دەکەین کاتێك دەچینە فەرمانگەیەکەوە یاخود ویستگەیەکی گەیاندن. ئەمە قسەکردن نیە، چونکە رەهایی ئەو کردەوەیە نیەکە بە شێوەیەکی زمانەوانیانە ئەفرێنەرو ئەزمونکەری جیهانە.

کاتێك سەراپا لە زمانێك دا دەژین، ئەو راستیەی کە ئێمە وا دەکەین رێژەگەری زمانەوانی پێك ناهێنێت چونکە بەهیچ شێوەیەك کۆیلەیی لەناو زمانێك دا نیە -تەنانەت لەناو زمانی زگماکی خۆشماندا. ئێمە هەموو ئەمە ئەزموون دەکەین کاتێك فێری زمانێکی بێگانە دەبین بەتایبەتی لە کاتی گەشتەکاندا تا ئەو ئاستەی لە زمانە بێگانەکەدا تارادەیەك شارەزایی

پەیدادەکەین. شارەزابوونی زمانە بێگانەکە بە کورتی ئەوە دەگەیەنێت کە لە وڵاتە بێگانەکەدا رووبەڕووی قسەکردن دەبینەوە، بە بەردەوامی بەشێوەیەکی رۆحی راوێژ لەگەڵ جیهانی خودی خۆمان و وشەو زاراوەکانیدا ناکەین. تا زیاتر زمانە بێگانەکە بزانین کەمتر ئەو روانینە لابەلایە بۆ زمانی زگماکی خۆمان جێگەی درك پێکردن دەبێت، ئەمەش تەنها لەبەرئەوەی هەرگیز وەکو پێویست بە باشی زمانە بێگانەکان نازانین و هەمیشە شتێك لەم هەستەمان هەیە. بەڵام هەرچۆنێك بێت قسەی پێدەکەین گەر تەنانەت قسەکردنێکی زمانگیریش بێت، چونکە زمانگرتن بەربەستە بۆ ئارەزوویەك بۆ قسەکردن و بەم جۆرەش والآیە بۆ مەملەکەتی رەهای گوزارشت کردن. بەم مانایە هەر زمانێك کە تیایدا دەژین رەهایە، ئەوە شتێکی تەواو هەڵەیە بگەینە ئەو بەرەنجامەی ئاوەز وردکراوە چونکە چەندین جۆر زمان هەن. تەواو پێچەوانەی ئەم حاڵەتە راستە. بە کورتی لە رێگەی دیاریکراوێتیمان و تایبەتێتی بوونمانەوە، کە ئاشکرایە تەنانەت لە چەندەها زمانیشدا، دیالۆگی بێ کۆتا (لاتنـاهي) والآکراوە بە ئاراستەی ئەو راستیەی کە ئێمەین.

ئەگەر ئەمە راست بێت، ئەوکاتە پەیوەندی جیهانە پیشەسازیە مۆدێرنەکەمان کە لەلایەن زانستەوە بنیاتنراوە، کە ئێمە لە دەستپێکەوە پێناسمان کرد، لە سەرو هەموویەوە لە ئاستی زماندا رەنگی داوەتەوە. ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین کە بە شێوەیەکی روولە زیادبوو هاوتاکردنی هەموو شێوەکانی ژیان بەخۆوە دەبینێت کە ئەمەش مەرجێکی بنەڕەتی مانەوەی ژیانە لەسەر ئەستێرەکەمان بۆنموونە گرفتی خۆراکی مرۆڤایەتی تەنها دەتوانرێت تەنها بەهۆی وازهێنان لەو دەست بڵاویو بەفیڕۆدانە چارەسەر بکرێت کە زەوی گرتۆتەوە. بەشێوەیەکی حەتمی، جیهانی میکانیکی و پیشەسازی وەکو جۆرێك لە فەزای تەکامول بوونی تەکنیکی لەناو ژیانی تاکدا فراواندەبێت. کاتێك گوێمان لێدەبێت عاشقە مۆدێرنەکان قسەدەکەن، زۆرجار لە خۆمان دەپرسین گەر ئەوان گفتوگۆ بە وشەکان بکەن یاخود بە دەربڕینە بانگەشەییەکان و زاراوە تەکنیکیەکان دەدوێن کە لە زمانی ئاماژەی جیهانی پیشەسازی مۆدێرنەوە وەرگیراون. شتێکی حەتمیەو کە شێوە هاوتابوەکانی ژیانی سەردەمی پیشەسازی کاریگەری لە زمانیش دەکەن و لە راستیشدا لاوازبوونی زاراوەو وشەی زمان لە پێشکەوتنێکی گەورەدایە بەم جۆرە زمان لە سیستەمێکی ئاماژەی تەکنیکی نزیك دەکاتەوە ئاراستە هاوتاکەرەکانی لەم چەشنە بەربەست ناکرێن.

هێشتا، وێڕای ئەوانەش، هاوکات بنیاتنانی جیهانی خۆمان بەردەوام دەبێت هەرکاتێك بمانەوێت شتێك بەیەکتر بڵێین. ئەنجامیش پەیوەندی راستەقینەی مرۆڤەکانە بەیەکترەوە. هەموو یەکێك لە پێشدا بازنەیەکی زمانەوانیە، ئەم بازنە زمانەوانیانەش دەکەونە پەیوەندیەوە لەگەڵ یەکتردا، لە وشەو زاراوەو رێزماندا وەك هەمیشە، هەرگیزیش بەبێ دیالۆگی رەهای ناوەکی نابێت کە لە بەرەو پێش چووندایە لەنێوان هەموو قسەکەرێك و هاوبەشەکەیدا. ئەوەش رەهەندی بنەڕەتی هێرمۆنتیکایە. قسەکردنی راستەقینە، کە شتێکی بۆ وتن هەیە لێرەشەوە ئاماژە پێش وەخت ئامادەکراوەکان نادات، بەڵکو زیاتر بەدوای ئەو وشانەدا دەگەڕێت کە لە رێگەیانەوە کەسێك دەگات بە ئەوی تر، ئەوە ئەرکی گەردوونی مرۆڤە -بەڵام ئەرکێکی تایبەتی کەسی تیۆلۆجیە، کە ئەرکی زیاتر وتنی

*[Weitersagen]* پەیامێك كە بە نووسراوی دەمێنێتەوە بە ئەو سپێردراوە.

**تێبینی:**

- لە ناونیشانی وتارەكەدا وشەی سەراپاگیری بەرامبەر Universality بەكارهاتووە كە هەردوو مانای گەردوونیو سەراپاگیری لەخۆ دەگرێت.
- وشەی تێنەگەیشتن بەرامبەر Misunderstanding بەكارهێنراوە كە مانا حەرفیەكەی بەهەڵە تێگەیشتنە.
- وشەی تیۆلۆجیا Theology وەكو خۆی بەكارهێنراوەتەوە كە واتا [اللاهوت].
- لە هەندێك جێگەدا وشەكانی واقعي، حتمي، ضروري، فظولي بە رێنوسی كوردی نووسران و بەكارهێنراون لەبەر نەبوونی بەرامبەرێكی كوردی شیاو بۆ ئەو وشانە.
- وشەی تەلیلۆجی Teleology (الغائیة): ئەو باوەڕەی كە دەڵێت هەموو شتێك مەبەستێك لە پشت ڕوودانیەوە هەیە.

**سەرچاوە:**

**كتێبی**

-Hermeneutic Trandition From Ast to Ricoeur

-published by: State University of New York Press Albany 1990

-Edited, With an Introduction by: Gayle L. Ormiston and Alan D. Schrift.

**ناوی وتارەكە:**

The Universality of Hermeneutical Problem.

By: Hans- Georg Gadomer.

## فایلی ژمارەی ئایندە (ژمارە *11*)ی سەردەم

## تایبەتە بە فەیلەسوفی ئەڵمانی

# (فریدریك نیچە)

- لەیادی سەد ساڵ بەسەر مەرگیدا -

# نووسین.. بۆ..؟

• ژولیا کاسترتن

• و. لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

من هەمیشە بە سەرسامییەوە لەخۆم دەپرسم: بۆ دەنووسم؟ بۆ چەندەها سەعات لەمەڕ ئەم مەسەلەیە گفتوگۆم لەگەڵ هاورێکانمدا کردووە، ئەوانەی کە نووسەرن و ئەوانەشی کە نووسەر نین. لە میانەی بیست و پێنج ساڵی قۆناغی یەکەمی تەمەنمدا وا چوویبووە دڵمەوە کە هەریەکێك لە ئێمە سەرگەرمی نووسینی ڕۆمانێکە یان ئەوەتا ڕۆژێك لە ڕۆژان ویستوویەتی بینووسێ. دواجار ژنێك کە من کارم لەگەڵدا دەکرد زۆر بێ پێچ و پەنا پێی وتم کە ئەم هیچ ئارەزوویەکی لەو بابەتانەی نییە. ئەم قسەیە تەواوێ لەدڵی دام. من هەر وام مەزەندە کرد کە دەکرێ ئەو ژنە بە دزییەوەو لەژێرەوە بنووسێ. من وای بۆ دەچووم کە لە سەرتاسەری دونیادا نووسەران ئەو خووە سەیرەیان هەیە کە حەز لە تەنیایی و شوێنی هێمن دەکەن، وام دەزانی ئەو ژنەش وایە، کەچی دوایی زانیم کە ئەو بەردەوام سەیری تەلەفزیۆن دەکا یان ئەوەتا لەگەڵ هاورێکانیدا دەچووە باڕو مەیخانەکان: بەو نیازەی کە دەیەوێ ژیانێکی کۆمەڵایەتی هەبێ. نووسین هەموو کات چالاکیەکی کۆمەڵایەتی نییە، تەنها ئەو کاتانە نەبێ کە لەگەڵ کۆمەڵێ نووسەری دیکەدا لەنێو یەك گرووپدا کار دەکەن و خۆ لەسەر نووسین و داهێنان ڕادێنن وەك جۆرێك لە جۆرەکانی ڕاهێنان لەسەر نووسین -بەڵام هەتا لەو کاتانەشدا هەست دەکەی زۆربەی وەخت پێویستت بە تەنیایی هەیەو هەر بە تەنیاش زۆربەی نووسینەکانت تەواو دەکەی، بۆ ئەوە لە هەر شوێنێکدا بیت هەوڵی ئەوە دەدەی کە کات بۆ خۆت بیچرێنی.

شتێك هەیە کە زۆر ئاشکرایە: نووسین وەك هەناسەدان سروشتی نییە. ئەفسانەی نووسەری "سروشتی" کە دەتوانێ وردو جوان شیعرو پەخشانی مەزن بچنێ، کارامەو نەخشەساز بێو هەر بە سەلیقە بنووسێ جگە لە درۆیەکی فێڵبازانە هیچی دیکە نییە، زۆربەی نووسەرانیش

هەوڵ دەدەن کە ئەم ئەفسانەیە لەسەر خۆیان لابیەن، گەر سەیر بکەی ئەم جۆرە روانینە زۆرە کە بڕوای بەوەیە هەندێ نووسەر هەن هەر بە سەلیقە بەهرەدارن، رەنگە ستوونە ئەدەبیەکان و هەندێ فیلم لەسەر نووسەران ئەو روانینە قووڵتر بکاتەوە، یان یاداشتنامەی هەندێ لەو نووسەرانە ئەو هێمایە ببەخشێ کە ئەوان مەزنن، هەر بۆیە خاوەنی یاداشتن. گرنگ نیە چەند لەو نووسەرانە دژی بیرۆکەی بەهرەو بە سەلیقە نووسینن، ئەوانەی کە خۆیان (نانووسەرن) حەز دەکەن کە کردەی نووسین بە ئاسان تێ بگەن، لەوە دەچێ بە مەسەلەیەکی زۆر سووکی بزانن.

نووسەران چاك دەزانن کە نووسین چ کارێکی پڕ لە زەحمەت و سۆزو عەقڵە.. چ ئەرکێکی قورسە. "سیمۆن دی بوڤوار" زۆر تووڕە بوو ئەو وەختەی کەسێك ئاماژەی بەوە کرد کە هەرکەس دەتوانێ کتێبێکی لە بابەتی "یادگارەکانی کچێکی گوێ رایەڵ" بنووسێ. وەڵامەکە ئەوەیە: گەر هەموو کەس دەیتوانی شتێکی لەو بابەتە بنووسێ، بۆچی ئەو کەسە بەتەنها "سیمۆن دی بوڤوار" بوو؟ نووسەران هەمیشە دووچاری جۆرێك لەو زوڵم و ناهەقیە دەبن، وا باشە نووسەران ئەوەیان لەبیر بێ کە دەکرێ بە پێی پلەو پایەی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا نەکرێ، هەر بۆیە گفتوگۆکردن لەسەر نووسین لەگەڵ کەسانی ناشارەزاو بێ باك بێ سوودە.

من وا بزانم خەڵکی بۆیە دەنووسن، چونکە پێویستیان بەوە هەیە بنووسن. "لۆرانس دارێل" رۆماننوس و شاعیر لەو بڕوایەدایە کە نووسین وا دەکات کە کەسێك ببێ بە مرۆڤ.. واتا نووسین رێگەیەکە بۆ بە مرۆڤ بوون. پرۆسێسەکە شێوەی جۆرێك لە بەشداری بوونە لەگەڵ خەڵکی دیکەدا، بەیەکەوە فڕینە، ئەزموونێکە لە پاڵ خەڵکیدا نەبێ ناکرێ، هەروەك شەڕە بۆکسێنی یابانیەکان، یان رازاندنەوەو نەخشەکاری بەکۆمەڵ. دیارە لەگەڵ نووسەراندا لە کردەی نووسیندا خۆی بەرجەستە دەکات. کاتێکی زۆری دەوێ تا لە پێویستی نووسین تێ دەگەین، بەڵام من بڕوام وایە کە چەندە پتر بنووسین، زیاتر لەو حەقیقتە نزیك دەبینەوە کە ئەویش ئەوەیە: ئەو شتە کە گەرەکمانە دەبێ هەر بیکەین. لە کتێبی "ژوورێك بۆ خۆی"دا کە نووسینی "ڤیرجینیا ولف"ی رۆماننووسە، قسە لەسەر ئەوە دەکات کە بەهرەی نووسین هەرچەندە کەم بێ، لەگەڵ ئەوەشدا.. مەگەر مردن بتوانێ بیشارێتەوە. نووسەر، لەبەر هەر هۆیەك بێ، لەژێر فشاری ئەوەدایە کە بنووسێ. ئەو نووسەرە، نێر بێ یان مێ، دەتوانێ بۆ ماوەیەك ئەو ئارەزووەی نووسین لە خۆیدا سەرکوت بکا، بەو بیانووەی کە لەوانەیە کارێکی دیکە بکات کە پتر جێی بایەخ بێ و کەمتریش خۆپەرستانە بێ؛ بە واتا کات بۆ شتێکی بەفەڕتر لە نووسین بەکار بێنێ. بەڵام کێ دەتوانێ بڵێ ئێمە بەم خۆسەرکوتکردنە چ وێرانەیەك لە خۆماندا دروست دەکەین و چۆن



سیمۆن دی بوڤوار

توانای نووسین له خۆماندا دەكوژین ئەو وەختەی بۆ ماوەیەكی درێژ ئەم سەركوت كردنە بەردەوام دەبێ؟

ئەفسوونێك له وشەكاندا هەیە. ئێمە هەمیشە زۆر بەزەحمەت ڕێ دەكەین، لەنێو بازنسە بەتاڵەكاندا دەخولێینەوەو بێ ئاراستەین، هەروەك خوێندنەوەی بێ حیكمەتی هەزاران لاپەڕەی ڕۆژنامەكان كه زۆریان دەستخەتە ڕۆمان دەكەن. زۆر ئاسانە ئەو حەقیقەتە سادەیە له یاد بكەین: بلێین ئەوانە چەند وشەیەكن و بەس.. هەر ئەم قسەیەو ئەم جۆرە خوێندنەوەیە وامان لێ دەكات كه توانای نووسین و قسەكردن لە دەست بدەین، كه دولجار ئەم دوو توانایەیە وامان لێ دەكات ببینە مرۆڤ. ئەوە وشەكانە وامان لێ دەكەن لە هەموو بوونەوەرێك و شتێك بەهێزتر بین لەسەر ئەم زەویەدا. ئەوانەی كە ناتوانن بنووسن هێزی كەمتریان هەیە لەو كەسانەی كه دەتوانن بنووسن: كردەی ناونان له شتەكان لەلای ئەوان سنووردارە، بەتەنها قسە بۆ كەسانێك دەكەن كه بێجگە له گوێگر هیچی دیكە نین، ئەو كەسانەی كە لە دەوروبەری خۆیاندا دەژین. ئەوانە ناتوانن لەگەڵ كۆمەڵگاكانی دیكەدا بیروڕا بگۆڕنەوە، ئەوانە لەوە بی بەشن كه بتوانن پرد لەگەڵ ئەو كەسانەدا دروست بكەن كه هێشتا لەدایك نەبوون، بەڵام ئەو كەسانەی كە دەتوانن بنووسن هەموو ئەو شتانەیان پێ دەكرێ. "بێرتۆلت برێشت" ئامۆژگاری خەڵكی دەكات، ئەوانەی كه برسین، ڕێنماییان دەكات كە فێری "ئەلف و بێ" بن. زانینی هونەرەكانی خوێندنەوەو نووسین هەنگاوێكی پڕ بایەخە بەرەو زاڵ بوون بەسەر خۆتدا.

زۆربەی كۆمەڵگاكان، لەوانەش كۆمەڵگاكەی خۆمان، سزای زۆر قورسیان خستۆتە سەر ئەوانەی كه تەماعی نووسینیان زۆرەو دەشزانن كە هێزی نووسین چەندە بێ سنوورە.

حوكمڕانەكان دەركیان بەوە كردووە كە دەتوانن بەرژەوەندییەكانی خۆیان بپارێزن گەر بتوانن پشت بەو "هێزی كارە" ببەستن كە بەتەنیا بۆ خۆی بیر ناكاتەوە.. هەر هێزێك وەك "نووسەران" بەتەنیاو سەربەستانە بیری كردەوە، بە شێوەیەكی وا یەككگرتووانەو توندوتۆڵ، دەبێتە مایەی هەڕەشەو مەترسی بۆ سەر دەستەی دەستەڵاتداران. پۆلیسەكانی ئاسایشی ئیسپانی و دادگای پشكنین كتێبەكانیان دەسووتاند، دیارە "نازیەكان"یش هەمان شتیان كرد. دەكرێ كتێبەكان جێی مەترسی بن، چونكە هەمان شتیان كرد. دەكرێ كتێبەكان جێی مەترسی بن، چونكە پرۆسەی نووسین-ی كتێبیان لەسەر جۆرێك له سەربەستی عەقڵی و مەعریفی رامان دەهێنێ.

نووسینە خەیاڵ ئامێزەكان، گەر شیعر بێ، چیرۆك و ڕۆمان، یان شانۆگەری دەتوانن شوێنێكی دیكە بۆ خوێنەر دروست بكەن كە تیایدا نیشتەجێ بێ، جیهانێكی ئەلتەرناتیڤ-ی بۆ پێشكەش دەكا، جیهانێك دەوڵەمەندتر لەو جیهانە واقیعیەی كە هەیە. بە هەموو مانا گەوهەرییەكان جیهانی كتێب پڕە لە ئەفسوون: خولقێنەری هەموو هێزو دەستەڵات و پەرجوویەكن "موعجیزە"، كتێبەكان دەتوانن لە هیچەوە شتێك بەرهەم بهێنن. شكسپیر وتوویەتی:

*چاوانی شاعیر كە شتانەی جوان دەڕوانێ*

*له ئاسمانەوە تا زەوی دەبینێ، لە زەویەوە تا ئاسمان؛*

*لەوێدا كە خەیاڵ بەرجەستە دەبێ*

*هەموو ئەو شتانەی كە نادیارو بێ شێوەن*

*پێنووسی شاعیرە كە ڕۆحیان پێ دەبەخشێ*

*بۆ خەیاڵێك كە نیە*

*ماڵ و ناوو نیشانی دەداتێ.*

هەروەها "مارگرێت ئاتود" لە هۆنراوەیەکدا بەناوی "سپێلّ کردن" دەنووسیّ:

*کچەکەم لەسەر زەوی گەمان دەکا*
*گەمە بە پیتە پلاستیکیەکان دەکا*
*سوور، شین و.. زەردێکی تۆخ*
*فێر دەبیّ چۆن سپێلّی وشەکان بکا*
*سپێلّ کردن..*
*تاوەکو فێربیّ موعجیزەیەک بخولّقێنیّ*
*

*من سەیرم لیّ دیّ چ زۆرن ئەو ژنانەی*
*نایانەویّ ببنەوە بە کچ*
*خۆیان لەژوورەکاندا بەند کردووە*
*پەردەکانیان داداوەتەوە*
*تەنها بۆ ئەوەی وشەکان ریزکەن*
*

*وشەیەک لەدوای وشەیەک*
*لە دوای وشەیەک.. چ مێژێکە..!*

لەوە دەچیّ "شکسپر" و "ئاتوود" لەبەردەم ئەو سیحرو ئەفسوونەدا دوو هەلّوێستی جیایان هەبیّ. شاعیرەکەی شکسپیر لە حالّەتێکی هەلّچووندایە، بەتەواوەتی کەوتۆتە ژێر رۆح و ئەفسوونی خولّقاندن و داهێنان. شاعیر یەکاندەر دوو توانیویەتی بە هێزی داهێنان هەرچی خەیالّە بیکات بە پیت و وشەو کارەکتەرو.. بیانخاتە سەر لاپەرەکان. هەر هەمووی زۆر ئاسایی و ئاسان و بە سەلیقە هاتۆتە پێشیّ.. بەشێوەیەکی ناخودئاگاهی. کچەکەی "ئاتوود" و لەو لاوەش ئەو ژنانەی کە شاعیر خەیالّیان لیّ دەکاتەوە بە جۆرێکی تری گەمە لەگەلّ وشەکان دەکەن. کچەکە گەمە بە پیتەکان دەکاو دەیەویّ لێکیان بدات. ژنەکان خۆیان لە ژوورەکاندا خزاندووە، چی بەرزو بلّندەو لە نووسین بەتەمان وەری بگرن،لە بری ئەوەی کە ئەو مەقامی بەدایک بوون و پەروەردەکەرو دایەن–ە قبولّ بکەن.. بەتەمان ئەو خەیالّە قەرز بکەن کە لە نووسیندا هەیە. ئەو



شەکسپیر

ژنانە لە ململانیّ دان.. ململانیّ لەگەلّ ئەو شتانەی کە لێیان چاوەری دەکریّ. ئەوان خەیالّ لەوە ناکەنەوە کە بەشسی خۆیان بپچرن.. ئەوان بۆی ناچن کە دەکریّ ئەو بەشە وەک ئەو پارچە کێکە وایە کەلە ئاهەنگێکدا بەرت دەکەویّ و دەیخۆی.

### ژنان، پیاوان و نووسین:

ژنان و پیاوان لەگەلّ زماندا دوو پەیوەندی جیاوازیان هەیە، هەر توخمەو بەشێوەیەکی جیا لە زمان نزیک دەبێتەوە، ئەو ژنانەی کە سەرگەرمی نووسینن هەقە بۆ هەمیشە ئەو حەقیقەتەیان لەیاد بیّ، لەو کاتەی کە دەنووسن و ئەو کاتەش کە لەلایەن دەزگاکانی بلاّوکردنەوەو چاپەمەنی بەرهەمەکانیان رەت دەکرێنەوە. ئەگەر وەک سەرەتایەک بمانەویّ قسە لەسەر ئەم مەسەلەیە بکەین دەلّێین بۆ هەمیشە بە ژنان و کچانی گەنج دەوتریّ کە ئەوان زۆر قسە دەکەن، بەشێوەیەکی زۆر سادەو ساکار

وشەکان بەکار دەهێنن.. پێیان دەوترێ: بێ هوودە دەڕێسن. پێیان دەوترێ: کە ئەوان دەتوانن بە ئاسانی بکەونە ناو گەمەی قسەکردن، بەڵام باشی لێ نازانن. دەشوترێ کە کچان لە قسەکردندا گەلێ لە کوڕان شارەزاو لێهاتووترن، دەتوانن گەلێ بیروبۆچوونی ئاڵۆز دەربڕن.. ئاسانتر لە کوڕان. من وا بزانم کچان پتر سەرگەرمی رەخنەن ئەو کاتەی قسەدەکەن، کەمتر ستایش دەکەن.. کاتێ گوێت لە کۆمەڵە کچێك دەبێ دەدوێن؛ هەست دەکەی کە پتر سەرزەنشت دەکەن تا پیاهەڵدان. لەهەر رۆژگارێکدا کچ دەست بداتە قەڵەم، بەو مانایە دێ کە کارێکی مەزن دەکاو دەیەوێ لەنێو ئەم دونیایەدا خۆی بسەلمێنێ.. جێ بۆ خۆی بکاتەوە. بەم شێوەیە ئافرەت لە نووسیندا جەخت لەسەر بوونی توخمی خۆی دەکات و ئەو روانینە هەڵدەوەشێنێتەوە کە لەسەر ئاستی میللی. دەیەوێ گومان لە بەهرەو تواناکانی ژن بکات.

بە بەراورد لەگەڵ پیاواندا کەمترین ژمارە لە نووسینی ژنان لە گۆڤارەکاندا بەرچاو دەکەوێ. بۆ وایە؟ ئایا ئەو کچانەی کە لە قسەکردندا بە دەم و پل و لە بلەبان بوون دووچاری چ دەردو گرفتێك بوون کە گەورەتر بوون؟ ئایا ئەو زەوق و خولیایەیان بزر کرد.. خولیای وتنی ئەو شتانەی حەزیان دەکرد بیانلێن؟ تۆ بلێی کەس ئامادە نەبێ بیانخوێنێتەوە؟ ئایا ئەو بابەتانەی ئەوان لەسەری دەنووسن زۆر بە ئاسانی سەرنجی سەرنووسەرانی ئەو گۆڤارانە راناکێشێ؟ باشە چەند لەو سەرنووسەرانە خۆیان ئافرەتن؟ ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە ژنە نووسەرەکان دەبێ لە خۆیانی بکەن، ئەو پرسیارانەی ناتوانین لێیان رابکەین.

لەمڕۆکەدا شتەکان گۆڕاون. لە "بریتانیا"دا هەنووکە سێ دەزگای چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە هەیە کە سەرقاڵی نووسینی ژنانن، بەلایەنی کەم دوو دەزگای گەورەی بڵاوکردنەوە بایەخ بەو کتێبانە دەدا کە بۆ ژنان جێی بایەخن، بۆ ئەم مەبەستەش لیستی تایبەتیان ئامادە کردووە. ئەمەیان هەواڵێکی دڵخۆشکەرەیە بۆ نەوەی تازە لە نووسەران، بەڵام بۆ هەندێکیان زۆر درەنگە. ئەوان چیتر ئەو دڵ و دەروونەی جارانیان نەماوە، دەست لە دەستنووسەکانیان هەڵدەگرن و لە گۆشەیەکدا فڕێیان دەدەن، بەخۆیان دەڵێن: ئەوان لە راستیدا قەت نووسەر نەبوون.

بەهەرحاڵ.. ئەوە بەو مانایە نایەت کە بۆ نووسەرانی پیاو کارەکە ئاسانترە. دۆزینەوەی دەزگاکانی چاپەمەنی بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبان بۆ هەموو نووسەران، بەژن و پیاوەوە، زۆر زەحمەتە، گەر بگەڕێینەوە سەر نامەو یاداشتەکانی نووسەرانی مەزنی وەك "گێرارد مانلی هۆبکنز"، جۆزێف کۆنراد"، "هێرمان مێلڤیل" تێ دەگەین کە پرۆسەی نووسین و بڵاوکردنەوە چەندە پڕ ئازار بووە. بەڵام من بڕوام وایە کە ژنە نووسەرەکان جۆرە ئەزموونێکی جیایان هەیە، چونکە بەردەوام و دڵرەقانە نکوڵی لە بەهرەو تواناکانیان، هەر لەو رۆژوە دەست پێ دەکات کە فێری قسە دەبن، ئەگەر نەڵێین بەر لەوە، ئەمەش وا دەکات کە کردەی نووسین لە پلەی یەکەمدا جۆرێك بێ لە هەڵگەڕانەوەو مل نەدان.

**نووسین و ململانێ:**

دەکرێ ململانێو هەڵگەڕانەوە بەشێك بێ لە کردەی داهێنان و لە خوڵقاندنی نووسەر ئەو کاتەی فێر دەبین کە چۆن بەکاری بێنین. هەر لە رێگەی وشە نووسراوەکانەوەیە کە نووسەر جەخت لەسەر "جیاوازی" نێوان خۆی و خەڵکی دا دەکا؛ لە نێوان خۆی و نووسەرەکانی دیکەدا، پێ داگرتن لەسەر ئەو جیاوازیەیە کە خەمی

نووسەرە. "فلیپ لارکن"ی شاعیر لە "نووسینی داواکراو"دا وتوویەتی: هۆیەك لە هۆیەکانی نووسین لە دەرئەنجامی ئەوەوە هاتووە کە کەس ئەو شتەی نەنووسی کە ئەم حەزی دەکرد، بیخوێنێتەوە. هەروەها "دەبلیو. بی. ییتس"ی شاعیر رایگەیاند کە رەوانبێژی و هونەری پەخشان نووسین لەوەوە سەرهەڵدەدا کە تۆ لە ململانێیدای لەگەڵ خەڵکیدا.. بە واتا لە جەنگدای، بەڵام نووسینی شیعر جەنگە لەگەڵ زاتی خۆتدا. ئەو جەنگ و ململانێیەی کە ئێمە لەناو خودی خۆماندا دەیانهێڵینەوە دەبن بەهێزو گوڕو تینێکی لەبن نەهاتوو بۆ نووسەر کەوا دەکات خولقێنەر بێ.

بیر لە باشترین نووسەر بکەرەوە کە تۆ زۆرت خۆش دەوێ، بیر لە هەموو ئەو کتێبانە بکەرەوە کە ئەو نووسیویەتی. ئایا هیچ کام لەو گرێیانە دەدۆزیتەوە کە لە ململانێوە هاتبێ، ئەو گرێ و گواڵانەی نووسەر حەز دەکا بیانکاتەوەو پاشان سەرلەنوێ بەیەکەوەیان ببەستێتەوە؟ ئایا هەست دەکەی کە وتەکەی "ئادرین ریچ" راستە کە سەبارەت بە "ماری کوری" دەنووسێ و دەڵێ "برینەکانی ئەو ژنە لە هەمان ئەو سەرچاوەوە هاتووە کە بۆتە کانگای هێزو تواناشی"؟

هەڵڕشتنی هەرچی گرێ و گواڵ هەیە، هەرچی لە هەناوتایە بۆ سەر کاغەز؛ مەرج نیە چیرۆك و هۆنراوەی لێ دروست بێ.. بابەتێك کە خەڵکی حەزی لێ بکەن بیخوێننەوە، بەڵام هەموو نووسەرەکان پێویستیان بەوە هەیە بەم قۆناغەدا تێبپەڕن؛ قۆناغی هەڵڕشتنی هەرچی هەیەو نیە تا فێری ئەوە دەبن کە چۆن چۆنی هەست و نەستی خۆیان دەنێو شێوازێکی هونەریدا جێ دەکەنەوە. وشەکان لەسەر کاغەز جیاواز دەردەکەون لەوەی کە لە خەیاڵ و مێشکماندا هەیە. ئێمە لەنێو رستەکاندا یان با بڵێین دەنێو فۆرمی رستەکاندا خۆمان دەدۆزینەوە. کردەی گۆڕینی گرێ و گواڵەکانمان بە ئاماژەو هێما لەسەر لاپەڕەکان وامان لێ دەکات لەسەر نووسین رابێین و فێری دیسپلین بین. شتێك لە ناوەوە پێمان دەڵێ "ناکرێ بەم شێوەیە بیڵێی، ئاواهی بەکەڵك نایە".. جا بۆیە دەبێ بیگۆڕین. کە دەست دەکەین بە نووسین؛ دەبینین بەردەوام دەگەڕێینەوە لای هەست و نەستی خۆمان بۆ دۆزینەوەی ریتم و ئیقاع و شێواز. پاشان دڵگەرمانە بە نووسینەکەدا دەچینەوە، دەستکاری، کلك و گوێی دەکەین، چ شتێك دەقەکەمان بێزەوەر بکات لای دەبەین، سەرلەنوێ دایدەڕێژینەوە تاوەکو هەر بەشێکی دەتوانێ بەشێکی دیکە رابگرێ و بەیەکەوە هەر هەموو پارچەکان هەمئاهەنگیان دەبێ و دواجار وەك دەقێکی یەککگرتوو بەپێوە تۆکمەو دامەزراو دەوەستێ: ئەو ماناو مەغزایە دەبەخشێ کە ئێمە گەرەکمان بوو.

### خۆئامادەکردن بۆ نووسین:

"کارلۆس کاستێنیدا" لە کتێبەکەیدا بەناوی "واقیعێکی تازە"دا بە دوای بایەخی ئەو شتەدا دەگەڕێ کە خۆی ناوی ناوە "دۆزینەوەی شوێنەکەت" بەرلەوەی دەست بەفێربوونی هەر شتێك بکەی. دۆزینەوەی شوێنێك بۆ نووسین، بەهەردوو دیودا کە دەکا شوێنێکی راستەقینە — ژوورێك لە خانوویەکدا، مێزێك، کورسیەکی نەرم و نیان، ئەوی دیکەیان شوێنێکە لەنێو خەیاڵی نووسەردا: ئەم دوو شوێنە دوو داواو مەرجی زۆر پێویستن بۆ پەرەپێدانی بەهرەو نووسین و گەشەکردنی. زاتی نووسەر پێویستی بە خۆراکی تایبەت هەیە، خۆراکێکی رۆحی، بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە کورسیەکەی ژێریشت گرنگە. هەروەك چۆن زەحمەتە لە ژوورێکدا بژی کە بە زستان سەربانەکەی دڵۆپە دەکات، هەروەها ناتوانیت بە ئاسانی بنووسیت ئەو

وەختەی لەسەر کورسیەکی خەراپ دانیشتووی. بیر لەو ڕووناکیە بکەرەوە کە لاپەڕەکانی بەردەمت ڕۆشن دەکاتەوە. ئایا بایی ئەوەندە ڕۆشنە کە وشەکان ببینی؟ ئەوەندە روونە کە بزانی چی دەکەی؟ بیر لەو کاغەزەش بکەرەوە کە لە سەری دەنووسیت. "کۆلیت"ی نووسەر کاغەزی پاك و تەمیزی دەکڕی کە بۆ لەسەر نووسین زۆر خۆش بێ. ئەم شتانە بێ بایەخ نین، بەڵکو بەشێکن لە کەرەستەی زۆر پێویستی نووسەر، دیارە کار دەکەنە سەر پرۆسەی نووسینیش.

کە بۆ یەکەمجار ئارەزووی نووسینمان دەبێ و خۆمان تاقی دەکەینەوە، بەشێوازی نووسینەکەمانەوە دیارە کە دەترسین، سەرەتایەکە لاوازو بێ نموودە، بێ رەنگ و بۆیە، هەر بۆیە پێویست دەکا کە پتر تیژ خۆراکی بکەین، دەبێ خودی نووسەر لەوە تێ بگا کە ئەم خوێن بەخشینە زۆر پێویستە. دەبێ کاتێکی زۆرتر خزمەت بەو بەهرەیە بکەین، گوێ لە خودی خۆمان بگرین. ئەو نووسەرەی کە لەناو ئێمەدا دەژی دەبێ لەوە تێ بگا کە خەمی نووسین یەکە خەمی ئێمەیە، دەبێ بزانین کە ئێمە ئامادەین واز لە زۆر شتی دیکە بێنین و هەرچی هەیە لە خزمەتی ئەو بەهرەیەدا تەرخانی بکەین، تێری بکەین، ئامادەشین کە شوێنێکی سێنترالی لە ژینی خۆماندا پێ ببەخشین، لە نووسینەکەمدا کە باس لە خودو زاتی نووسەر دەکەم وەك ئەوە وایە کە وەسفی کۆرپەلەیەك بکەم کە دیارە من دەقاودەق ئەوەم مەبەستە.

کە خۆت ئامادە دەکەی بۆ نووسین، بە وردی بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەرەوە کە پێویستت پێیانە، بیر لەوە بکەرەوە کە چۆن ئەو کۆپەرلە برسیەی ناو زاتت تێر دەکەی. کاتی نووسین کاتی خۆتە: دەبێ بۆ خۆتی ببچڕێنی، زۆربەی کات ناچاری گوێ بە خەڵك و داواکانیان نەدەیت و ئەو وەختەی بۆ نووسین گەرەکتە بیدزی. هەندێ جار ئەو شتە پتر لە جۆرە ستراتیژێکی سەربازی دەچێ؛ بەم شێوەیەش ڕوویەڕووی ئەم حاڵەتە دەبیتەوە: وەك ئەوە وایە کە پیلان و پلانی بۆ سازبکەی کە چۆن خۆت لەناو قەڵایەکدا بشاریتەوەو بەرگری لە خۆت بکەی.. دیارە ئەو قەڵایەی تۆ خۆتی تیا حەشار دەدەی قەڵایەکی خەیاڵیە، پەناگەیەکی بێ دەنگی، بەڵام بۆ تۆی نووسەر ئەو قەڵایە پڕ خێرو بێرە، لە پاڵ هەموو ئەو کارو ئەرك و کێشانەی کە لە ڕۆژێکدا تووشیان دەبیو دەبنە بار بەسەر شانتەوە، تۆ هەمیشە پێویستت بەو قەڵاو پەناگەیە هەیە. هەر کاتێك هەستت بەوە کرد کە گوناهباریت، ئەوەت لەیاد بێ کە تۆ ئەو کۆرپەلەیە تێر دەکەی کە زاتی خۆتە.. ڕۆحی خۆتە.. ڕۆح و زاتی نووسەر.

لەوانەیە پێویستت بەوە بێ ئەم چەشنە پرسیارانە لەخۆت بکەی "کەی شوێنێك و خەڵوەتێکی تایبەت بە خۆمم دەبێ؟ کەی جیهانێکی هێمنم دەست دەکەوێ؟ ئاخۆ پێویستم بەوە هەیە ماڵ بەجێ بێڵم یان کاتی ئەوەم دەبێ لە ماڵەکەی خۆمدا بنووسم؟ ئاخۆ دەتوانم بنووسم ئەو کاتەی دەورم قەڵەباڵغە؟"

لە راستیدا وا چاکە کە لێ بگەرێم خەڵکی بزانن کە من سەرگەرمی نووسینم؛ هەر بۆیە پێویستم بە خەڵوەت و تەنیاییە. ئەگەر تۆ سوور بیت لەسەر وەدەستهێنانی کات و شوێنی گونجاو.. خەڵوەت، بیگومان بە لەوەی کە خەڵکی ڕێزی ئەو داوایەت دەکرن، ئەگەر تۆ بە راستی مەبەستت بێ، ئەوە خەڵکی دیکەش ناچار دەکەی پێی رازی بن.

**سەرچاوە:**

Creative Writing
A PRACTICAL GUIDE
Julia Casterton
Macmillan

چاپی هۆنگ کۆنگ لاپەڕە (1–6)

# له ئەدەبی گەلانەوە

* فروغ فەڕوخزاد و دیوانی (باوەڕبهێنین بە هەرەتای وەرزی سارد)
* کورتە چیرۆکی (کڕاکۆسلی ڕاوچی)ی فرانز کافکا و ڕەخنەیەک





**فروغ فەڕوخزاد**

و

دیوانی:

**باوەڕبهێنین بە سەرەتای وەرزی سارد**

وەرگێڕانی:

**ئازاد بەرزنجی**

# فروغ فەرۆخزادو

## دیوانی (باوەڕ بهێنین بە سەرەتای وەرزی سارد)

• و. لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

[شیعری فروغ فەرۆخزاد بۆ من شتێکی دیکەیە. شیعری فروغ هەندێ جار لای من لە موعجیزە دەچێت و من بە پێودانێکی جیهانی لە ریزی شاعیرە دیارەکانی ئەم سەردەمەدا دایدەنێم. بە بڕوای من گەلێ لە شاعیرانی بەناوبانگی جیهان کە نازناوی (گەورەترین)یان بۆ خۆیان قۆرغ کردووە، هێشتا زۆریان ماوە بگەنە ئاستی فروغ.

زۆرجار ڕوویداوە کە بەرامبەر هەندێ کۆپلەی شیعریی فروغ سەرسام ماوم و یان قەناعەت زۆری خایاندووە بڕوای پێ بکەم.

فروغ لە شیعری ئەمرۆدا شوێنی خۆی هەیە!]

*(شاعیرێک بە پێودانێکی جیهانی)*

*ئەحمەد شاملو-گۆڤاری فیردەوسی، 1967*

[بۆ من کە ئافرەتێکم، زۆر سەختە بتوانم لەم دەوروبەرە بۆگەنەدا، لە هەمانکاتدا ڕوحیەتی خۆم بپارێزم. من ژیانی خۆم لە پێناوی هونەرەکەمدا تەرخانکردووەو، تەنانەت دەتوانم بڵێم کردوومە بە قوربانی هونەرەکەم. من لە پێناوی هونەرەکەمدا ژیانم دەوێت. دەشزانم ئەم ڕێیەی من گرتوومەتەبەر لە ژینگەو کۆمەڵگاکەمدا بووەتە مایەی هەراوزەناو گەلێ نەباریشم بۆ خۆم دروستکردووە، بەڵام من بڕوام وایە کە هەر دەبوو یەکێک ئەم ڕێیەی بگرتایەتەبەرو چونکە ئەو پڕکێشی و لەخۆبوردنەش لە خۆمدا شک دەبەم، بۆیە من ئەو ڕچەیەم شکاند..

من گۆڕەپانەکە چۆڵ ناکەم. تێکناشکێم و بەوپەڕی خوێنساردییەوە بەرگەی هەموو شتەکان دەگرم، هەروەکو چۆن تا ئێستا بەرگەم گرتووە.]

*-لە نامەیەکی فروغ خۆیەوە کە لە ساڵی 1963دا نووسیویەتی-*

فروغ فەڕوخزاد (1966–1934) سەرەتای ژیانی شیعریی لەژێر کاریگەریی (نیمایوشیج)ی ڕابەری شیعری نوێی فارسیدا دەستپێکردو بەیەکێك لەو شاعیرە کەمانە دەژمێردرێ کە توانیان گوتارێکی شیعریی نوێ لە ئەدەبی فارسیدا دابمەزرێنن. هەڵبەت بە ڕەچاوکردنی جیاوازیی جیهانبینی و دیدو ڕوانینی شیعری لای هەر یەکێك لەو شاعیرانە.

فروغ سەرباری تەمەنی کورتی، چ تەمەنی خۆی (کە 32 ساڵ ژیا) و چ تەمەنی شیعریی (کە 12 ساڵە) بە چەند قەسیدەیەك، بەتایبەتیش قەسیدەکانی هەردوو دیوانی (لە دایکبوونێکی دیکە) و (باوەڕ بهێنین بە سەرەتای وەرزی سارد) [گەرچی ئەم دیوانەی دواییان پاش مەرگی لە چاپدرا] توانیی بگاتە ئاستێکی بەرزی داهێنان لە شیعردا، تا ئەو ڕادەیەی شاعیرێکی وەکو ئەحمەد شاملو بە شاعیرێکی جیهانی لە قەڵەمدەدات و لە ئاست هەندێ لە شیعرەکانی فروغ دا سەرسامیی خۆی دەردەبڕێ.

کۆی دیوانەکانی فروغ پێنج دیوانن کە بریتین لە: 1–ئەسیر 2–دیوار 3–یاخیبوون 4–لە دایکبوونێکی دیکە 5–باوەڕ بهێنین بە سەرەتای وەرزی سارد. لە ڕاستیدا گەرچی سێ دیوانی یەکەمی سەرشارن لە هەستێکی شاعیرانەی لێوانلێو لە وێنەی شیعری و هەروەها جەسارەت و ڕاستگۆییەك کە بۆ یەکەمجار بووە ژنە شاعیرێکی فارس پێیانەوە بێتە نێو مەیدانە ئەدەبیەکەوە؛ بەڵام لە سەرجەمی ئەو شیعرانەدا کاڵیەك لە ئەزموونی شیعریی و کامڵ نەبوونێك لە دیدو جیهانبینی‌دا دەبینین، جگە لە خۆ بەستنەوەی فروغ بە سەرواوە. هەروەها فروغ لەم سێ دیوانەیدا هێشتا لەژێر سیحرو کاریگەریی "نیما یوشیج"دایەو نەیتوانیوە ببێتە خاوەن دەنگ و سیمای تایبەتیی خۆی.

هەر بۆیە لە دایکبوونی شیعریی ڕاستەقینەی فروغ لە "لە دایکبوونێکی دیکە"وە دەستپێدەکات و ئەم کۆمەڵە شیعرەی دەبێتە قەڵەمبازێك و دابڕانێك لەگەڵ ڕابردووی شیعریی خۆی و بگرە تەنانەت لەگەڵ نەریتەکانی شیعری فارسیشدا.

دەتوانین بڵێین کۆمەڵە شیعری "باوەڕ بهێنین بە سەرەتای وەرزی سارد"یش درێژەی هەمان ئەزموونی "لە دایکبوونێکی دیکە"یە، بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە لەم دوا کۆمەڵە شیعرەیدا چەند قەسیدەیەکی درێژی هەن کە تیایاندا ڕوانین و شیعریەت بە ئاستێکی زۆر باڵا ئاوێتەی یەکدی بوون، لەوانە: باوەڕ بهێنین بە سەرەتای وەرزی سارد، هەر دەنگە ئەمێنێتەوە، دوای تۆ، دڵم بە باخچەکە ئەسووتێ، کەسێ کە لە هیچ کەس ناچێ.

ئەم کۆمەڵە شیعرەی کە خوێنەر لێرەدا دەیانبینێ وەرگێڕانی دەقی ئەو شیعرانەی فروغن کە لەم دیوانەیدا دوای مەرگی چاپکراون:

ایمان بیاوریم بە آغاز فصل سرد–فروغ فرخزاد– چاپ هشتم 1990

انتشارات مروارید– تهران.

(کارنامەی ژیان و شیعری فروغ)یش لەم کتێبەوە کراوە بە کوردی (پریشادخت شعر– زندگی و شعر فروغ فرخزاد– م. آزاد– چاپ دوم 2000– تهران)

ئەمانە هەمووشیان بەشێکن لە کتێبێکی ئامادەکراو بۆ چاپ سەبارەت فروغ فەڕوخزاد.

وەرگێڕ

## کارنامەی ژیان و شیعری فروغ

**1934 لە دایکبوون:** "من لە بەفرانباری ساڵی 1934دا لە تاران لە دایکبووم.. ئەوەندەی پەیوەندیی بە باوکم و دایکم و ئاستی خوێندنەوە هەیە، وا چاکترە لێی نەدوێین." (لە نامەیەکی فروغدا کە ساڵی 1953 نووسیویەتی و لە کتێبی "جوانترین شیعرەکانی فروغ فەرخزاددا بڵاوبۆتەوە).

من هەرگیز لە ژیانمدا رێپیشاندەرێکم نەبووە، کەس لە رووی فیکری و رووحیەوە منی پەروەردە نەکردووە. هەرچیەکم هەیە هی خۆمەو، هەرچیەکیشم نیە هەموو ئەو شتانەن کە دەمتوانی هەمبوونایە، بەڵام چەوت و چێڵی و خۆنەناسین و بنبەستەکانی ژیان نەیانهێشتووە پێیان بگەم.

دەمەوێ دەستپێبکەم.

**(لە نامەیەکی فروغدا کە لە گۆڤاری "ئێرش"ی ژمارە 13دا لە ساڵی 1966دا بڵاوبۆتەوە).**

ڕاستە، فروغ لە سەرەتای لاویدا رێپیشاندەرێکی نەبووە کە ڕۆڵی لە فۆرمەلەکردنی بیروباوەڕەکانی ئەودا هەبێت و ئاراستەیەکی بۆ دیاری بکات. لەگەڵ ئەمەشدا باوکی ڕۆڵێکی کاریگەری لە ئاشنایی فروغ بە ئەدەبدا هەبووە.

باوکی -کە سەرهەنگ محەمەد فەرخزادە- و پیاوێکی ئەدیب و شیعردۆستە، گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی لە ئەدەبیاتی کۆنی فارسی پێکهێنابوو، فروغیش سوودی لەو گەنجینەیە بینی.

باوکی فروغ دەڵێت: "کاتێ فروغ بچکۆلە بوو، من فێری ئەوەم کرد کتێب بخوێنێتەوەو کتێبم دەخستە بەردەستی".

"فروغ بەشێوەیەکی زۆر سەیر دەیخوێندەوە، تەواوی شیعرەکانی سەعدیی لەبەر بوو، هەروەها غەزەلەکانی حافزیشی لەبەربوو، یەک ساتیشی بۆ خوێندنەوە بە فیڕۆ نەدەدا -لە خوێندنەوەدا زۆر بە تەماع بوو".

(لە وتاری "فروغ لە شیعرو عیشق و هەژان و تەنیاییدا ژیا"وە، مینا ئەسەدی و بهنام بهروز، کیهان 24 بهمن 1353 "1974") ئەم خۆفێرکردنە بەردەوامە سەلیقەو بەهرەی فروغی کچۆڵەی فۆرمەلە کرد.

ئەزموونە شیعریە سەرەتاییەکانی، بەهەموو سادەیی و کاڵییانەوە، نیشانەی بەهرەو توانای ئەون لە زانینی کێشەکاندا.

باوکی دەڵێت: "کاتێ دەستی بە نووسینی شیعر کرد، هانم دا.. هەرگیز ئەوەم لە بیرناچێت کە فروغ بۆ یەکەمین جار شیعرێکی بچووکی نووسی و پیشانی دام. من تا ئێستاش ئەو شیعرەم بەخەتی فروغ خۆی لایە کە بە شێوازێکی نوێ نووسیبووی و بە دێڕی "دوور لێرە، دوور لێرە" دەست پێ دەکات. ئەوکاتانە فروغ دەچوو بۆ قوتابخانەی ئامادەیی".

(ه. س. پ)

**1947: دەستپێکردنێکی جیددییانەتری فروغ لە شیعردا، ئەم ماوەیە گرنگیی بە غەزەل دەدا:**

خۆی لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: "سیانزدە چواردە ساڵانە بووم کە دەستم بە شیعرنووسین کرد. گەلێ غەزەلم نووسی و هیچیانم چاپ نەکرد. کاتێ لەو غەزەلانە دەڕوانم، سەرەڕای ئەوەی لە حاڵەتی گشتییان قایلم، بەخۆم دەڵێم: چاکە خانم، ئاخرییەکەی گرێی غەزەل گوتن تۆشی گرتەوە!" (لە گفتوگۆی سیروس تاهبازو دکتۆر ساعدیەوە لەگەڵ فروغ دا، گۆڤاری آرش ژمارە 13 ساڵی 1966)

**1949: خانەی هونەر (هنرستان)، نیگارەکانی فروغ:**

دوای ئەوەی پۆلی سێیەمی ئامادەیی (ئامادەیی خوسرەو خاوەر) تەواو دەکات، دەچێتە خانەی هونەری کچانەوە. خانم بەهجەت سەدر (نیگارکێشی هاوچەرخ) کە لە خانەی هونەر مامۆستای نیگارکێش بوو، دەڵێت: "فروغ ماوەیەک لای نیگارکێشی ناسراو پتگەر، فێری هونەرەکانی نیگارکێشان بوو، بەڵام زۆر زوو لە

نیگارکێشانی ئەکادیمی دوورکەوتەوەو خۆی گەیاندە گەوهەری نیگارکێشانی ئەم سەردەمەمان. زۆریاش ڕەنگەکانی دەناسی، بە ئاسانی لێیان دەگەیشت و هەستی پێ دەکردن. بە تایبەتی لە هێڵکاریدا دەست ڕەنگین بوو. (سکێچێکی دەموچاوی خۆی کردووە کە چەند جارێك چاپ کراوەتەوە) دوو تابلۆی ڕەنگ و زەیتمان لەوەوە بە یادگاری بۆ ماوەتەوە؛ یەکێکیان پۆرترێتی حوسەینە، کە منداڵی دایکێکی گولەو فروغ لە تەوریزەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی. **[( لە وتاری فروغ لە وتەی کەسانی تردا، هەفتەنامەی بامشاد، ژمارە *89* تا *90*، *12*ی شەهریوەرو ئابانی *1968* ).]**

"فروغ کچێکی بەهرەمەند بوو. نیگاری دەکێشاو بە شەوقێکی فرەوە تەواوی پۆلەکانی نیگارکێشی پێگەری تەواوکرد. ئەو دەمانە کەسانێکی وەکو سوهراب سپهری و شەیبانی و بەهجەت سەدر خانم میهری ڕوخشا لە دەورمان بوون، ئەم هاوڕێیانە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر کامڵبوونی ڕووحی و هونەریی فروغ هەبوو.

فروغ لەگەڵ سوهراب سپهری و میهری ڕوخشادا دادەنیشت و نیگاری دەکێشا".

***1950* شووکردنی زوو و جیابوونەوە:**

فروغ تەمەنی پانزە ساڵان بوو کە شووی بە پەرویز شاپور (تەنزنووسی ناسراو) کردو کوڕێکی لێ بوو بەناوی "کامیار"ەوە. بەڵام ئەم هاوسەرێتییەیان زۆری نەخایاند. با هۆی ئەو جیابوونەوەیەشیان لە زمانی کەس و دۆستانییەوە ببیستین:

باوکی دەڵێت: "کاتێ فروغ دەستی بە نووسینی شیعر کرد؛ هانم دا. بەڵام کاتێ شیعرەکانی بوونە مایەی هەراوزەنای دەوروبەری و خەریك بوو ژیانی هاوسەرێتیی لێ تێك دەدا، زۆرم پێ ناخۆش بوو.. بەڵام ئەو هێندە لەسەر ئەو باوەڕەی خۆی سوور بوو کە ئاخریەکەی [لە مێردەکەی] جیابۆوە. گەرچی من بە ڕواڵەت ئەوەم پێ ناخۆش بوو؛ بەڵام لە ناوەوە ئافەرینم دەکرد". **[( لە وتاری فروغ لە شیعرو عیشق و تەنیاییدا ژیا، من ئەسەری دو بهنام بهروز، کیهان *24* بهمن *1353* ).]**

ڕاستیەکەی ئەوەبوو کە ئەنگێزەی فروغ بۆ شیعرنووسین بە ڕادەیەك بەهێز بوو کە لە توانایدا نەبوو ئەم پێداویستیە ناوەوەییەی خۆی سەرکوت بکات، دەڵێت: "هەستدەکەم پێداویستیەکی زۆرو حەزێکی فرە من بۆ ئەو ڕێگایە پەلکێش دەکات، سەرباری ئەو هەموو دەردو ئازارەی هەر لە سەرەتاوە چەشتم، ئینجاش توانای ئەوەم نیە کە بە یەکجاری پەیوەندیی خۆم لەگەڵ ئەوەدا بپسێنم کە پێی دەڵێن شیعرو هونەر، تا ژیانێکی ئارامم هەبێ." **[( گۆڤاری روشنفکر، ژمارە *6* مهر *1334* )]**

"فروغ ڕۆحێکی سەرکەش و نائارامی هەبوو. ئاگرێك لە ناخیدا کڵپەی دەسەندو بۆ ئەوەی کوڕە بچوکەکەی و هاوسەرەکەشی لەو ئاگرە دوور ڕابگرێت، لێیان جیابۆوەو وای بە باش زانی بە تەنیا بژی" **[( فروغ لە وتەی کەسانی تردا.. هـ. س. پ )]**

***1952* : ئەسیر**

لەم ساڵەدا یەکەمین کۆمەڵە شیعری فروغ بڵاوبۆوە کە شوجاعودین شیفا (لە چاپی سێیەمیدا ***1963***) پێشەکیی بۆ نووسی. شیفا داوای لە خوێنەران کردبوو کە بە بێ هیچ جۆرە داوەرییەکی ئاکاری لەم کارە شیعرییەی فروغ بتۆژنەوە، هەروەها وتبووی کە "شیعری ئەو قابیلی بەراوردکردنە بە شیعری ئەمریکای لاتین، بە تایبەتیش شیعری ئەلفۆنسینا ستۆرنی‌و، پتر سەروکاری لەگەڵ هەستدا هەیە نەك ئەقڵ و هزر، ئەو پتر هەڵوەدای گەرمی و هەژانە نەك بەختەوەری" ئەم کۆمەڵە شیعرە ***44*** شیعری لەخۆگرتووە.

لە ڕاستیدا ئەسیر سیمبولی حاڵەتێکی دەروونیە کە ئەو کەسە دەبینێ دوچاری کۆمەڵێك نەریت و دەمارگیری بووە؛ کە ئومێدێك نیە بۆ ژیانێکی ئاقیکارانەی تەواو

تیایدا. **["گەڕانێك بە شیعرەكانی فروغ دا، گردهاری تیكو، كتێبی "ئەدەبی نوێی ئێران" وەرگێڕان و لەسەرنووسینی یەعقوب ئاژەند ل ل 215-195]**

### ***1956* : دیوار**

دووەم كۆمەڵە شیعری فروغ لەگەڵ پێشەكیەكدا كە لە شیعری حافزو عومەر خەییام و گۆتەو میلتۆن پێكهاتووە

غەزەلەكەی حافز ئەمەیە:

گل در برو می دركف و معشوق به كامست

سلطان جهانم به چنین روز غلامست

واتاكەشی ئەمەیە: گوڵ لە ئامێزدا‌و مەی لە دەستداو مەعشوقیش بە كامی دڵ، لە ڕۆژێكی وادا سوڵتانی جیهانم لا وەك غولام وایە

ئەمەش چوارینەكەی خەییامە:

من ظاهر نیستی‌و هستی دانم

من باطن هر فرازو پستی دانم

با اینهمه لزدانش خود شرمم باد

گر مرتبەی ورای مستی دانم

ئەم كۆپلەیەش لە "دیوانی خۆرهەڵاتی"ی گۆتە وەرگیراوە:

"وێڕای ئەوەی زانین و ئەقڵ هۆی دەركەوتنی بالاترین هێزن بۆ ئادەمیزاد، ئێستا تۆ دەبێ لە ڕێی جیلوەكانی ئەفسون و سیحرەوە، هێز لە ئەهریمەن بخوازیت"

هەروەها ئەم كۆپلەیەش لە "بەهەشتی ونبوو"ی میلتۆن (گفتوگۆی شەیتان)ەوە وەرگیراوە، بەتایبەتیش ئەم دێڕانە:

"لە نێو منداكە سەرچاوەی باشی وشكی كردووە

تۆ ئەی بەدی و چەپەڵی جێی باشەو چاكە بگرەرەوە.."

بەڵام ئەم پێشەكییانە لەگەڵ كۆمەڵە شیعری دیوانی "یاخیبوون"دا زیاتر دەگونجێن تا شیعرەكانی دیوانی "دیوار". تەنها لە شیعری وەڵام دا كە تێهەڵكێشێكە لەو دێڕە بەناوبانگەی دەڵێت:

هرگز نمیرد آنكه دلش زنده شد به عشق

ثبت است برجریدەء عالم دوام ما

واتە: ئەوكەسەی دڵی بە عیشق زیندووە هەرگیز نامرێ، مانەوەی ئێمە لە دەفتەری دونیادا نووسراوەتەوە.

بە هەمان زمان و نەغمەی شیعری كۆنی فارسی لە زوهدی ڕیایی و لوتفی خودایی دەدوێ. لەم شیعرەدا ئاماژە بۆ شەیتان نەكراوە، بەڵام بە نەغمەیەكی ڕۆمانتیكانە باس لە خوارەندی خوێنمژی شیعر دەكات كە ئیلهامبەخش و قوربانیكەری شاعیرە.

"دیوار" حاڵەتێك دەگەیەنێت كە ئەو كەسە دەیەوێ تەواوی كۆتەكانی داب و نەریت تێكبشكێنێت، لەبەر ئەوەی خۆی لە دونیایەكی پڕ لە نامۆبووندا دەبینێتەوە كە دیوارێك چواردەوری گەمارۆداوەو توانای ڕووبەڕووبوونەوەی هەر جۆرە نەریت شكێنییەكی لە بەین بردووە. ئەو بەڵگەیەی كە لێرەدا بەرچاومان دەكەوێ ئەوەیە كە شاعیر بەم گریمانەیە، هەستی شاعیرانەی خۆی و، هەروەها هەستكردنێكی بەرز بەوەی كە گەڕان بەدوا دەركردنی ڕەهای شتەكاندا بێهودەیە، دەخاتەڕوو.

### ***1956* : سەفەر بۆ ئەورووپا:**

تەنیایی و سەراسیمەیی و قەیرانە دەروونیەكان تەنگیان بە فروغ هەڵچنیبوو. ناچار بەرەو ئەورووپا سەفەرێكی كرد بەو ئومێدەی كەمێ هێور بێتەوە.

ئەم سەفەرەی فروغ بۆ ئەورووپا سوودی خۆی هەبوو: "چەند ساڵێك لەمەوبەر سەفەرێكی بۆ ئەورووپا كردو ماوەیەك لەوێ سەرگەرمی خوێندن و خوێندنەوە بوو، وەختێ گەڕایەوە، فروغ تەواو كەسێكی تر بوو: هەستە قووڵەكەی لەگەڵ زانینێكی زۆردا ئاوێتە ببوو. ئەو كەسەی كە پێشتر زیاتر بیری لە خۆی دەكردەوە، وای لێ هاتبوو وەكو مرۆڤێكی واقیعی لە ژیانی مرۆڤەكانی دیكە

تێدەفکری. بەرەنجامی ئەم گۆڕانە فیکری و ڕوحیە، کتێبێك بوو بەناوی لە دایکبوونێکی دیکەوە کە بە ڕاستی "لە دایکبوونێکی دیکە" بوو.

فروغ لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا کەلە ئیتالیاو ئەڵمانیادا مایەوە، توانیی فێری زمانی ئیتالی و ئەڵمانی بێت و پێیان بناخڤێت. هەر لە هەمان ئەو ڕۆژگارەدا، چەند شیعرێکی هەندێ شاعیری ئەوروپایی تەرجەمە کرد.

***1957* یاخیبوون:**

ئەمە سێیەمین کۆمەڵە شیعری فروغ بوو کە لەم ساڵەدا بڵاوبۆوە، لەم کۆمەڵە شیعرەدا لەبری پێشەکی سێ کۆپلەی بچووك دانراون، دوو کۆپلە لە "سەردەمی کۆن" و کۆپلەیەك لە "قورئانی پیرۆز" (سورەتی "ئەلقەمەر").

کۆمەڵە شیعری "یاخیبوون" لە دوو بەش پێکهاتووە: بەشێکیان قەسیدەی درێژی "یاخیبوون"و بەشەکەی تریش کۆمەڵێك شیعری کورتە.

"فروغ فەرخزاد لە یاخیبوون دا سادەترین و قووڵترین ناوەرۆکی کەشفی شوناسی مرۆیی و، شوناسی شەیتانیو، مەسەلەی بنەڕەتیی فەلسەفیی (جەبرو ئیختیار)ی خستۆتە ڕوو.

شاعیر ناڕەزایی دەردەبڕێ کە شەیتان– کە مەخلوقی خودایەو تەواوی هۆیەکانی لە خشتەبردنی عاشقانی چێژو جوانی لە دەست ئەودایە– بە تەنها ئەو ئەرکانە بەجێ دێنێت کە خوا پێی سپاردووە. هەروەکو لە شیعرەکەی فروغەوە دەردەکەوێ شەیتان لەوە ناشادە کە دیمەنی ناشیرینەو ئادەمیزادەکان فریو دەدات و لە خشتەیان دەبات. بەم جۆرە ئەو لەم بەرامبەر بەکتردانانەی ئەم دووانە، واتە مرۆڤ کە هیچ جۆرە توانایەکی هەڵبژاردنی نیەو بە بکەرێکی ئازاد ناژمێردرێ، لەو لاشەوە شەیتان کە بە بکەرێکی ئازاد دەژمێردرێ، دەیەوێ سەر لە گوناه دەربکات. ئەو بەخستنەڕووی کۆت و بەندی ئەم بوونەوەرانە؛ واتە شەیتان و مرۆڤ، مەسەلەیەکی دی دەوروژێنێ و خودایەك دەهێنێتە گۆڕێ و گلەیی لێدەکات کە جیهانێکی پڕ خەتاو گوناهی خولقاندووە. لە کۆتاییشدا دەخوازێ کە بریا تەنها بۆ ساتێك لە جێی خودا دەبوو تا تەواوی مرۆڤەکانی ئازاد دەکردو جیهانێکی پڕ لە جوانیی دەخولقاندو، تامی ویساڵی بە تەواوی هەستە جوانەکانی دونیا دەبەخشی و ئارامی و یەکێتیی لە هەموو شوێنێك دادەمەزراند کە تیایدا پایەی مرۆڤایەتی لەیەك قاڵبدا بێت.

**(گەڕانێك بەنێو شیعرەکانی فروغ دا.. هـ. س. پ)**

وا پێدەچێت ئەم بیرۆکەیەش لەژێر کاریگەریی ئەم چوارینەیەی خەیامدا بێت کە دەڵێت:

گر بر فلکم دست بدی چون یزدان

برداشتمی من این فلك را ازمیان

باردگر این فلك چنان ساختمی

کازاده به کام دل رسیدی آسان

یان ئەم بیرۆکەیەی "حافز" کە دەڵێت:

عالمی دیگر بباید ساخت، و زنو آدمی

واتاکەی: دەبێ جیهانێکی دیکە دروست بکرێ و هەروەها سەرلەنوێ ئادەمێکی دی.

بابەتی سەرەکیی ئەم شاعیرە ئازادانە، بێداریی کۆمەڵایەتی و جەبریەتە. ململانێی ئەم مرۆڤە بیرمەندانەش مانایەکی فراوانتری لە دیدی "ڕۆمانتیك"ی جەبرگەرا هەیە.

کاتی ڕەخنەگرتن لە "یاخیبوون" پێویستە سەرنجی ئەم خاڵە هۆشمەندانە بدەین کە:

"نائومێدی و نسکۆو شکست، فروغ بەرەو یاخیبوونێکی تازە پەلکێش دەکات. یاخیبوون بەرامبەر تەواوی پرنسیپەکانی باوەڕ و دین. ئەو تەواوی کەموکورتی و ناکامیەکانی خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ ناڕێکیەکانی خەلق و یاخیدەبێت. بەڵام ئەم یاخیبوونەی ئەو، یاخیبوونێکی ڕواڵەتی و کەمبەهایەو لە قووڵبوونەوەی فەلسەفی و فیکری خاڵیە، تەنانەت لە

ڕووی خەیاڵیشەوە ئەوەندە بەهێز نیە و تەنها هەندێ گرێ دەخاتەڕوو کە شاعیر لە بوونیدا بەدەستیانەوە ناڵاندوویەتی. بۆیە یاخیبوونەکەی نەدەبێ بە یاخیبوونەکەی خەیام و حافزو، نە هی ئەبولعەلاء و ڤۆڵتێریش.

لە قەسیدەی (خودایەک)دا شاعیر دەخوازێ لە توانایدا بێت دونیایەك بخولقێنێت بە گوێرەی مەیل و خواستەکانی خۆی بێ، دونیایەك کە تەنها عاتیفەو هەست و سۆز تیایدا باڵادەست بێت. دونیایەکی ئازاد، بەڵام بۆ ستەمدیدەکان نا، بەڵکو دونیایەکی ئازاد بۆ هەوەس و خواستەکانی، لێرەدایە کە یاخیبوونەکەی فروغ شتێکی کەمبەهاو بێ ئاست دێتە بەرچاو.

لەم کۆمەڵە شیعرەدا دەڵێی شاعیر لە دونیای ڕۆمانتیك و خەیاڵیدا دەژی و پەست و عاجزە لە بێدادییەکانی جیهانی زەمینی و، ڕێیەك بەرەو ئاسمان و کاکێشانەکان دەبینێتەوە. لەم ڕووەوە فەزای شیعری فروغ لەم کۆمەڵە شیعرەدا لە زەوی و زەوی نشینان دوورەو، لە ڕاستیدا جۆرە دەربڕینێکی خەیاڵاتی خۆیەتی.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، فروغ لەم قۆناغەی ژیانیدا، شاعیرێکی ڕاستگۆو بێباك و خاوەن ڕۆحێکی شاعیرانەیە. ژنێکە کە ژیانی ڕەنگی شیعرەکەی گرتووەو شیعرەکەشی ڕەنگی ژیانی گرتووە."

(گەڕانێك بەنێو شیعرەکانی فروغ دا.. ه. س. پ)

**1968 دەسپێکردن بەکاری سینەمایی:**

فروغ کاتێ تەمەنی بیست و سێ ساڵ بوو دەستی بەکاری سینەمایی کردو لە ماوەیەکی کەمدا توانیی شارەزایی لە تەکنیکی سینەماییدا پەیدا بکات. نەك تەنها لەبەرئەوەی ژنێکی هۆشیارو وریابوو، بەڵکو زیاتر لەبەرئەوەی ئافرەتێکی خولیاداربوو و هەوڵدەداو، هەموو شتێکی سەیرو نەناسراویش ئەوی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. کاری هونەری بەلای ئەوەوە پیشاندانی تواناو خۆخەریك کردن نەبوو. لە کاریدا نەك هەر ڕاستگۆ بوو؛ بەڵکو دیسپلینێکی بێ وێنەشی هەبوو. بەردەوام کتێبی دەخوێندەوە. شەووڕۆژ دەینووسی و کاری دەکرد.

**1959 سەفەر بۆ بەریتانیا:**

لە ڕێی "گوڵستان فیلم"ەوە بەرەو بەریتانیا سەفەری کرد تا سەبارەت کاری گروپەکانی ئامادەکردنی فیلم شت فێربێت. پاش گەڕانەوەی لەسەفەر تەقەللا سەرەتاییەکانی خۆی لەبواری وێنەگرتنی سینەماییدا دەستپێکرد. بۆ ئامادەکردنی شتە سەرەتاییەکانی چەند فیلمێکی بەلگەئامێز کەوتە کارکردن و بۆ خوزستان سەفەری کرد.

**1960** دەزگای فیلمی میللی کەنەدا داوای لە گوڵستان فیلم کرد تا فیلمێکی کورتیان سەبارەت بە ڕێ و ڕەسمی خوازبێنی لە ئێران بۆ ئەنجام بدەن. فروغ لەم فیلمەدا دەوری بینی و هەر خۆیشی لە ئامادەکردنیدا ڕۆڵی کارای هەبوو.

**1961** بەشی دووەمی فیلمی جوانی "ئاوو گەرما"ی لە گوڵستان فیلم ئامادەکردو لەم بەشەی فیلمەکەدا بە شێوەیەکی جوان گەرمای وڕوکاسکەری ژینگەی مرۆیی – پیشەسازیی ئابادانی خستۆتە ڕوو، نەك ژینگەی جوگرافیایی ئەوێ.

لە هەمان ساڵدا لە ئامادەکردنی دەنگی فیلمی "مەوج و مەرجان و خارا"دا هاوکاریی کرد. پاشان بۆ جاری دووەم بەنیازی خوێندنی چۆنێتیی ئامادەکردنی فیلم بەرەو بەریتانیا سەفەری کردووەو، کاتێ گەڕایەوە فیلمێکی یەك دەقیقەیی بۆ ڕۆژنامەی کەیهان بەرهەمهێنا، کە لە بواری خۆیدا شایانی ئافەرین بوو.

**1962** بەرەو تەورێز سەفەری کرد تا سەبارەت ئامادەکردنی فیلمێك دەربارەی گوڵ و گولەکان تۆژینەوە ئەنجام بدات. هاوینی هەمان ساڵ هاوکاریی گوڵستانی کرد بۆ بەرهەمهێنانی فیلمی "دەریا" و خۆیشی لەم فیلمەدا دەوری بینی. گوڵستان ئەم فیلمەی لەسەر بناغەی "بۆچی دەریا بوو بە تۆفان" بەرهەم دەهێنا، کە بە داخەوە تەواو نەکرا. لە هەمان ساڵدا فروغ فیلمێکی بۆ

دەزگای کەیهان بەرهەمهێنا کە بابەتە سەرەکیەکەی چۆنیتی ئامادەکردنی رۆژنامەیەك بوو.

**1962 ماڵەکە رەشە:**

لە پاییزی ساڵی **1962**دا فروغ فەرخزاد هاوڕێ لەگەڵ گروپێکی سێ کەسیدا چوو بۆ "خانەی گوڵ"ی تەوریزو دوانزدە ڕۆژ لەوێ مایەوەو فیلمی سەرکەوتووی "ماڵەکە ڕەشە"ی بەرهەمهێنا کە لە ساڵی **1964** داو لە فێستیڤاڵی جیهانیی فیلمی "ئۆبەر هاوزن"دا لە ئاڵمانیا خەلاتی باشترین فیلمی دۆکیومنتالی بەدەسهێنا. ڕەخنە نووسان و سینەماکارانی گەورەو بەناوبانگی جیهان ئەم فیلمەیان پەسەند کرد. چواردەهەمین فێستیڤاڵی فیلمی "ئۆبەر هاوزن"، ناوی "لە یادی فروغ فەرخزادا"ی لە گەورەترین خەلاتی خۆی نا بۆ فیلمە بەلگەئامێزەکان. ئەم ناولێنانەش نیشاندانی ڕێز بوو بۆ ئەم هونەرمەندە ئێرانیە گەورەیە (واتە فروغ) و سەرکەوتوویی ئەو چ لە هونەرداو چ لە مرۆڤدۆستیدا.

لیژنەی بەڕێوەبردنی فێستیڤاڵەکە دروشمی خەلاتە گەورەکەی خۆی لە ڕستە سەرەتاییەکانی فیلمی "ماڵەکە ڕەشە"وە هەڵبژاردبوو کە هەرگیز لە یادناچنەوە:

دونیا کەم ناشرین نییە

ناشرینیەکانیش زۆرتر دەبوون، گەر ئادەمیزاد چاری خۆی لێیان بنووقاندایە

بەلام مرۆڤ چارەسازە.

بەم جۆرە ئەم کۆپلەیە لە کۆتاری فیلمی "ماڵەکە ڕەشە" نرخی هەوڵی مرۆڤ بۆ قەلاچۆکردنی ناشرینی و ستەم و ئازار -کە پەیامی سەرەکی فیلمەکەی فروغە- بووە پێوانەی هەڵسەنگاندنی باشترین فیلمی ئەو فێستیڤاڵە.

لیژنەی بەڕێوەبردنی فێستیڤاڵی ئۆبەرهاوزن لە بلاوکراوەکانی خۆیدا بەشێکی زۆری بۆ باسکردنی ژیان و کارو ئاسەوارەکانی فروغ فەرخزاد تەرخان کرد. باس لە پایەی بەرزی ئەو لە دونیای شیعرداو هەڵکەوتوویی بوێرانەی لە کاری سینەماییدا کرابوو. لیژنەی نێونەتەوەیی بەسەرۆکایەتیی "ڤیلارد ڤان دایك" (سەرۆکی بەشی سینەما لە مۆزەخانەی هونەرە مۆدێرنەکان لە نیویۆرك) خەلاتی "فروغ فەرخزاد"ی بۆ باشترین فیلمی بەلگەئامێز بە دوو فیلم بەخشی.

پاش ئەم ڕێزلێنانە، تەلەفزیۆنی ئەڵمانیش لە شەوی **28**ی ئەپریلدا، بەرنامەیەکی بۆ یادی فروغ سازکرد، ئامادەکاری ئەم بەرنامەیە "ئاوا هۆفمان" بوو کە ئامادەکاری زنجیرەی فیلمە مێژووییە گەورەکانە لە تەلەفزیۆنی ئەڵمانیدا. لەم بەرنامەیەدا سەرەتا "ئاوا هۆفمان" بەسوود وەرگرتن لەوێنەو فیلم و هەروەها چاوپێکەوتنێك لەگەڵ دکتۆر ئەمیر فەرخزاد (پزیشکی برینپێچی ئێرانی کە لە ئەو دەمە لە ئەڵمانیا دادەنیشت و براگەورەی فروغە) و چاوپێکەوتن لەگەڵ دوو ڕەخنەنووسی سینەمایی ئەڵمانیا سەبارەت ژیان و کارەکانی فروغ دواو بەو ئەنجامە گەیشت کە لە ڕاستیدا فیلمی "ماڵەکە ڕەشە" گوزارشتێکە لە کۆمەڵگایەکی داخراوو نەخۆش، دەربڕینی ناڕەزاییەکی مرۆڤدۆستانەیە لەگەڵ پیشاندانی ڕێگەچارەدا کە ڕێگای زانستەو، بنبڕکردن و قەلاچۆکردنی خراپەو هەژاریە. پاشان تەلەفزیۆنەکە ئەسڵی فیلمەکەی پیشان دا (کە دەنگی فروغی لەگەڵدا بوو، لە ژێریشەوە بۆ ئەڵمانی تەرجەمە کرابوو)، لە زنجیرەی فیلمە گەورەکانیشدا نمایشکرا.

**1963** لە شانۆنامەی "شەش کاراکتەر بەدوا نووسەرێکدا دەگەڕێن"ی پیراندێللۆی گەورە شانۆنامەنووسی ئیتالیدا دەوری بینی، کە "پەری سابری" دەری هێناوە، لە هەمان ساڵدا کتێبی "ئەسیر" بۆ جاری سێیەم چاپ کرایەوە.

لە زستانی هەمان ساڵدا، فروغ لە وەلامی پەیامنێرێکدا کە لە بارەی تێڕوانینی ئەو لەمەڕ خەلاتی فێستیڤاڵی ئۆبەرهاوزن بۆ فیلمی "ماڵەکە ڕەشە" پرسیاری لێکردبوو؛ وتی: "من ئەو چێژەی کە دەبوو ببینم لە کارەکەی خۆم بینیومە. دەشێ

بووکەشووشەیەکم بدەنێ. بووکەشووشە چ مانایەکی هەیە؟ خەڵاتیش بووکەشووشەیە.."

**(گفتوگۆ لەگەڵ فروغ دا دەربارەی "ماڵەکە ڕەشە" بڵاوکراوەیەکی تایبەت بە هونەرو ئەدەب، ڕەشت، 28ی بهمن 1346)**

ڕاستە، فروغ لەو ڕێزلێنانە ڕەسمیانە بێزاربوو.

**1963** لە بەهاری 63 دا فیلمنامەیەکی بۆ فیلمێك نووسی کە بە داخەوە نەهاتە بەرهەم. فروغ دەربارەی ئەم فیلمە دەڵێت: "لەم سیناریۆیەدا من هەوڵم داوە ژیانی ڕاستەقینەی ژنی ئێرانی پیشان بدەم. حەزدەکەم وێنەی دیمەنەکانی ئەم فیلمە لە خانوویەکی کۆنی ئێرانی دا بگیرێ. ئەو خانووانەی کە ژوورەکانیان لەناو یەکدایە، من ئەم خانووانەم لە کاشان دیوە.."

**(ژیننامەی فروغ فەڕوخزاد، هەفتەنامەی ژنی ئەمڕۆ، 16ی اسفند 1345)**

گوایە ئەمە هەمان ئەو فیلمنامە هەزار لاپەڕەییەیە کە فروغ بۆ نووسینی سوودی لە ئەزموونەکانی ژیانی خۆی دیوە.

**1964: "جوانترین شیعرەکانی فروغ فەڕوخزاد"**

کۆمەڵە شیعرێکی فروغە، لەگەڵ نامەیەکی فروغدا بۆ یەکێك لە گۆڤارەکانی ئێران. ئەم کۆمەڵە شیعرە ئەو شیعرانەی تیایە کە فروغ بەر لە "لە دایکبوونێکی دیکە "نووسیونی، نامەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی سەرەتای شیعرنووسین لای فروغ (1953).

**1964 لە دایکبوونێکی دیکە:**

چوارەمین کۆمەڵە شیعری فروغ فەڕوخزاد چاپ کرا. "لە دایکبوونێکی دیکە" ڕووداوێکی گرنگە لە شیعری ئەمڕۆی ئێران و، هەروەها جیهانیشدا. دوو ساڵ ئەزموونی کاری سینەمایی، سەفەر، کارو تۆژینەوەی بەردەوام، کرانەوەو ئاوەڵایی بە دیدو دونیای فروغ فەڕوخزاد بەخشیبوو.

فروغ لە "لە دایکبوونێکی دیکە"دا دەکاتە جۆرە هۆشیاری و ناسینێك بۆ بوونی مرۆڤ و لایەن و ڕەهەندە فرەکانی ژیان و حاڵەتەکانی لە زەمەندا هەست پێدەکات.. ئەگەر هەر خەیاڵێکی پەتی نیشانەیەکی لە کامڵبوون لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبێ، ئەوا فروغ بەوە گەیشتبوو. هەروەها فروغ هەستی بە سات بە ساتی کەلتوری ڕابوردووی خۆی کردووەو هەوڵیداوە دەورووبەری خۆی بگۆڕێت.

ڕۆحی ئێرانێتی لە ناخیدا مەوجی ئەداو ئەگەر مەرگ مۆڵەتی بدایەو بەرەو کامڵبوونی زیاتر بڕۆیشتبایە، هەر بە ڕاستی یەکێك لە گەورەترین شاعیرانی سەدەی بیستەمی ئێرانی لێ دەردەچوو.

**1964** بڵاوبوونەوەی هەڵبژاردەی شیعرەکانی.

**1964** یاریدەدان لە فیلمی "خشت و ئاوێنە"دا لە دەرهێنانی ئیبراهیم گوڵستان. هاوینی هەمان ساڵ بۆ ئەڵمانیاو ئیتالیاو فەرەنسا سەفەری کرد.

**1965** ڕێکخراوی یۆنسکۆ فیلمێکی نیو سەعاتیی دەربارەی ژیانی بەرهەمهێنا، کە لە بارەی شیعرو هونەرەکەیەوە بوون کە گەیشتبوونە ئاستێکی جیهانی. لە هەمان ساڵدا برناردۆ برتۆلۆچی کە یەکێکە لە دەرهێنەرە جیهانییە گەورەکانی شەپۆل نوێی سینەما، لە تاران فیلمێکی چارەکە سەعاتیی سەبارەت ژیانی فروغ بەرهەمهێنا.

**1964**: فروغ دیسانەوە سەفەری بۆ ئیتالیا کردو لە دووەمین فێستیڤاڵی سینەمای دانەر (لە شاری پێزارۆ)دا بەشداریی کرد. لە هەمان ساڵدا لە وڵاتی سویدەوە پێشنیازیان بۆ کرد بچێت بۆ ئەوێ و لەوێ فیلمێك بەرهەم بێنێت، فروغیش ئەم پێشنیازەی قبووڵ کرد. ئەمەش خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوەیە کە ڕەخنەنووسانی سینەمای پێشڕەوی سویدی تاچ ئەندازەیەك نرخی فروغ فەڕوخزادیان دەزانی.

هەر لە هەمان ساڵدا لە وڵاتانی ئەڵمانیاو سوێدو بەریتانیاو فەرەنساوە داوایان لە فروغ کرد شیعرەکانی تەرجەمە بکەن و چاپی بکەن.

**1966**: لە زستانی ئەمساڵەدا فروغ لە ڕووداوێکی ئۆتۆمۆبێلدا گیانی لە دەست دا. لە ڕاستیدا ئەو لە ڕێی خۆشەویستیی منالاندا گیانی لە دەست دا. بەجێبی ستۆدیۆی "گوڵستان فیلم"ەوە لە ماڵەوە بەرەو ستۆدیۆ دەچوو کە پاسێکی قوتابخانەی شەهریار لە پڕێکا لە بەردەمیدا پێچی کردەوە، فروغیش بۆ ئەوەی خۆی لێ نەدات بەلای ڕاستدا شکاندییەوەو لەسەر ڕێگا سەرەکیەکە لایداو..

به دایکم وت: "تازە تەواو"
وتم: "هەمیشە بەر لەوەی بیربکەیتەوە ئەقەومێ
ئەبێ پرسەنامەیەك بۆ ڕۆژنامە بنێرین"

..................................

سلاو ئەی غوربەتی تەنیایی
ژوورەکەم بەتۆ ئەسپێرم
چونکە هەورە تارەکان
پێغەمبەرانی ئایەتە تازەکانی پاکژ بوونەوەن و
لە شەهیدبوونی مۆمێکیشا
نهێنییەکی نوورانی هەیە
کە دواگڕو درێژترینیان چاکی ئەزانێ
**(باوەڕبهێنین بەسەرەتای وەرزی سارد)**

مەرگی فروغ کۆمەڵگاکەمانی هەژاند. نەك بەتەنها ڕۆشنبیران، بەلکو تەنانەت خەلکە سادەکانیش. دەتوت تازە دەرکیان بەوە کردووە کە چ گەوهەرێکی بەرزیان لە دەست دلوە. فروغ نووسیبووی: دەترسم زووتر لەوەی فریای بیرکردنەوە بکەوم بمرم و، کارەکانم بەنیوەناچڵی بمێننەوە..

ئەمەش دلخێکی گەورەیە.

**کارە وەرگێڕراوەکانی فروغ:**

فروغ تا ئەو ڕادەیەی پێویستی پێ بوو بە زمانی ئیتالی و ئەڵمانی و فەرەنسایی ئاشنابوو. بەلام بە خوێندن و بە شێوەیەکی میتۆدیکانەو لە ماوەی چوار ساڵدا زمانی ئینگلیزیی خوێندبوو و، هەم بە ئاخاوتن و هەم بۆ نووسین و وەرگێڕان باشی دەزانی.

شانۆنامەی ژانی پیرۆز (ی برناردشۆ) و سیاحەتنامەی هنری میللەر (ستونی بەردینی مارۆسی)ی تەرجەمە کردووە کە تا ئێستا چاپ نەکراون. وەرگێڕانی ژانی پیرۆز کە باسی ژیانی ژاندارك دەکات، بەو نیازە بوو کە لە ساڵی ئایندەدا بۆ شانۆ کاری تیا بکەن و خۆیشی دەیویست دەوری ژان دارك ببینێت.

**باوەڕبهێنین بەسەرەتای وەرزی سارد**

ناونیشانی قەسیدەیەکە کە لەگەڵ چەند شیعرێکی تردا، پاش مەرگی شاعیر لە دیوانێکدا بلاوبوونەوە. درەوشاوەترین شیعری ئەم دیوانە "هەر دەنگە ئەمێنێتەوە"یە کە ئاسۆیەکی نوێ لە شیعری فروغدا دەکاتەوە.

"کەسێ کە لە هیچ کەس ناچێ" و "دلم بە باخچەکە ئەسووتێ" ڕووی کۆمەلایەتیی شیعری فروغن کە هەلگری ڕەخنەیەکی قووڵ و کاریگەرن.

قەسیدەی "باوەڕ بهێنین بەسەرەتای وەرزی سارد" دەڵێی پەیامی خامۆشیی فروغە -پەیامی مەرگ- ئەو دەمەی کە "چراکانی پەیوەندی" خامۆش دەبن و شاعیر بە تەنزێکی تاڵەوە سەبارەت مەرگێکی زوو دەدوێت.

# باوەڕ بهێنین بە سەرەتای وەرزی سارد

ئەمەش منم
ژنێ تەنیا
لەبەردەم وەرزێکی ساردا
لە سەرەتای پەیبردن بەبوونی لەوتاوی زەویو
نائومێدیی سادەو خەمناکی ئاسمان و
بێتوانایی ئەم دەستە چیمەنتۆییانە

زەمەن ڕۆیی
زەمەن ڕۆیی و سەعاتەکەش چوارجار لێیدا
چوارجار لێیدا
ئەمڕۆ یەکی بەفرانبارە
من نهێنیی وەرزەکان ئەزانم و
لە قسەی ساتەکانیش ئەگەم
فریادڕەس خەوتووە لە گۆڕاو
خاکیش، خاکی ئامێز والآ
ئامازەیەکە بۆ ئارامی

زەمەن ڕۆیی و سەعاتەکەش چوارجار لێیدا
لە کۆلانەکە با دێ
لە کۆلانەکە با دێ

منیش بیر لە جووتبوونی گوڵەکان ئەکەمەوە
لەو خونچانەی لاسکیان باریك و کەمخوێن بوو
لەم زەمەنە شەکەتە سیلاوییەو
لەو پیاوەش کە بەلای درەختە تەڕەکانا ئەگوزەرێ
پیاوێ کە ڕشتەی شینی دەمارەکانی
وەك ماری مردوو لەملاولای گەروویەوە
هەڵکشاون و
لە لاجانگە پەرێشانەکانیا ئەم برگە خوێنینە
ئەڵێنەوە
–سڵاو
–سڵاو
منیش بیر لە جووتبوونی گوڵەکان ئەکەمەوە

لەبەردەم وەرزێکی ساردا
لە کۆڕی پرسەی ئاوێنەکاناو
لە ماتەمی ئەزموونە ڕەنگ پەڕیوەکاناو
لەم خۆرنشینەدا کە ئاوسە بە زانستی خامۆشی
چۆن ئەکرێ.. بەو کەسەی کە بەم تەرزە ئەڕوا
هێور
سەنگین
سەرگەردان
فەرمانی وەستان بدرێ.
چۆن ئەکرێ.. بەپیاو بوترێ کە ئەو زیندوو نییە،
ئەو هەرگیز زیندوو نەبووە

لە کۆلانەکە با دێ
قەلە ڕەشە تەنیاکانی گۆشەگیری
لە باخە پیرەکانی وەڕسیدا ئەسووڕێنەوە
پەیژەیش
چ بەژنێکی کورتی هەیە
ئەوان لەگەڵ خۆیانا
تەواوی ساکاریی دڵێکیان
برد بۆ کۆشکی چیرۆکەکان
ئێستاش تازە
چۆن کەسێ بۆ سەما هەڵئەسێ و
پرچەکانی مناڵی‌ی خۆی
ئەڕژێنێتە ئاوە ڕەوانەکانەوەو
پێ بەو سێوەشدا ئەنێ
کە ڕنیویەتی و بۆنی کردووە؟!

ئەی یار، ئەی تاقانەترین یار
چ گەواڵە هەورێکی ڕەش چاوەڕوانی ڕۆژی میوانداریی خۆرن
ئەڵێی لە ڕێی بەرجەستەبوونی فڕیندا بوو کە ڕۆژێ ئەو مەلە پەیدابوو
ئەڵێی لە هێڵەکانی سەوزی خەیاڵا بوون
ئەو گەڵا تازانەی کە لە شەهوەتی نەسیمدا هەناسەیان ئەدا
ئەڵێی ئەو گڕە وەنەوشەییە کە لە زەینی پاکی پەنجەرەکانا ئەسووتا
شتێ نەبوو، جگە لە وێناکردنێکی پاکیزەی چرا
لە کۆلانەکە با دێ
ئەمە سەرەتای وێرانی‌یە

ئەو ڕۆژەش کە دەستەکانی تۆ وێران بوون هەر با ئەمات

ئەستێرە ئازیزەکان
ئەستێرە کارتۆنییە ئازیزەکان
کاتێ لە ئاسمانا درۆ هەڵئەکا
ئیدی چۆن ئەکرێ
پەنا بۆ سوورەتی پێغەمبەرە شەرمەزارەکان ببرێ؟
ئێمە وەك مردووە هەزاران هەزار ساڵەکان بەیەك ئەگەین و ئەوساش
خۆر بەسەر پەڕپووتیی جەستەکانمانا حوکم ئەدا

من سەرمامە
من سەرمامەو ئەڵێی قەت گەرم دانایەم
ئەی یار، ئەی تاقانەترین یار "ئەرێ ئەو شەرابە چەند ساڵە بوو؟"
بڕوانە لێرەدا
زەمەن چ قورساییەکی هەیەو
ماسیەکان چۆن گۆشتی لەشی من ئەجوون
بۆچ هەمیشە لەبنی دەریادا ڕامئەگری؟

من سەرمامەو لە گوارەی سەدەف بێزارم
من سەرمامەو ئەشزانم
لە تەواوی خەیاڵاتی سووری گوڵاڵەیەکی وەحشی
جگە لە چەند دڵۆپە خوێنێ
هیچی دی بەجێ نامێنێ

واز لە هێڵەکان ئەهێنم
واز لە ژماردنی ژمارەکانیش ئەهێنم
لەنێو شێوە ئەندازەییە دیاریکراوەکانا
پەنا بۆ پانتاییە هەستیەکانی فراوانی ئەبەم
من ڕووتم، ڕووتم، ڕووت
وەك بێدەنگیەکانی بەینی پەیڤەکانی ئەوین ڕووتم
زامەکانیشم هەمووی هی عیشقە
هی عیشق، عیشق، عیشق.
من ئەم دورگە سەرگەردانەم
بە شۆڕشی ئۆقیانووس و
تەقینەوەی کێودا تێپەڕاندووە
پارچە پارچە بوونیش، تەنێنیی ئەو بوونە یەکگرتووە بوو
کە خۆرەتاو لە بچووکترین گەردەکانیەوە پەیدابوو

سڵاو ئەی شەوی پاکیزە
سڵاو ئەی ئەو شەوەی کە چاوی گورگەکانی بیابان
ئەکەی بە چاڵە ئێسقانی باوەڕو متمانەو
لە قەراغ جۆگەکانی تۆوە ڕۆحی داربیەکان
بۆنی ڕۆحی میهرەبانی تەورەکان ئەکەن
من لە دونیای بێ دەربەستی بیرو قسەو دەنگەکانەوە نێم
ئەم دونیایەش هەر لە لانەی ماران ئەچێ
ئەم دونیایەش پڕە لە دەنگی جووڵەی پێی خەڵکانێ
کە هەر لەو ساتەدا تۆی تیا ماچ ئەکەن
لە زەینی خۆیاندا.. پەتی سێدارەت ئەچنن

سڵاو ئەی شەوی پاکیزە !

لە نێوان پەنجەرەو بینینا

هەمیشە مەودایەك هەیە

من بۆ نەمڕوانی؟

وەك ئەوکاتەی کە پیاوێك بەلای درەختە تەڕەکاندا تێئەپەڕی..

بۆ نەمڕوانی؟

ئەتوت ئەو شەوە دایکم گریابوو

ئەو شەوەی ئازارم هاتێ و نوتفەکە شێوەی گرت

ئەو شەوەی بووم بەبووکی مێشووەکانی ئەکاکیا

ئەو شەوەی کە ئیسفەهان پڕ بوو لە زرنگەی کاشیی شین

ئەو کەسەش کە نیوەی من بوو، گەڕابۆوە ناو نوتفەکەی من

منیش لە ئاوێنەکەدا ئەمبینی

هەروەك ئاوێنە پاکژو ڕوون بوو

لە پڕێکیشا بانگی کردم

منیش بووم بە بووکی مێشووەکانی ئەکاکیا..

ئەتوت ئەو شەوە دایکم گریابوو

چ ڕووناکیەکی بێهوودە لەم دەلاقە داخراوەوە بەدەرکەوت

بۆ نەمڕوانی؟

تەواوی ساتەکانی بەختەوەری ئەیانزانی

کە دەستەکانی تۆ وێران ئەبن

منیش نەمڕوانی

تا ئەو دەمەی کە پەنجەرەی سەعاتەکە کرایەوەو

ئەو کەنارییە غەمگینە چوار جار خوێندی

چوار جار خوێندی

منیش تووشی ئەو ژنە بچکۆلەیە بووم

کە چاوانی لە هێلانەی چۆڵی سیمرغەکان ئەچوون

هەروەکو بە جووڵەی ڕانەکانیشیا دەرئەکەوت

ئەتوت کچێنیی خەونی پڕشکۆی منی

لەگەڵ خۆیدا ئەبرد بۆ پێخەفی شەو

تۆ بڵێی دیسان پرچەکانم

لەبەر بادا شانە بکەم؟

تۆ بڵێی دیسان لە باخچەکانا وەنەوشە بڕوێنم و

گوڵە شەمدانیەکان

لە ئاسمانی پشتی پەنجەرەکەدا دابنێم؟

تۆ بڵێی دیسان لەسەر پەرداخەکان سەما بکەم؟

ئایا دیسان زەنگی دەرگا بەرەو چاوەڕوانیی دەنگم ئەبا؟

بەدایکم وت: "تازە تەواو"

وتم: "هەمیشە بەرلەوەی بیربکەیتەوە ئەقەومێ

ئەبێ پرسەنامەیەک بۆ ڕۆژنامە بنێرین"

مرۆڤی بۆش

مرۆڤی بۆشی پڕ متمانە

بڕوانە لەکاتی خواردنا

ددانەکانی چۆن سروود ئەڵێن و

چاوەکانی لەکاتی سەیرکردنا

چەند بزن

ئەویش چۆن بەلای درەختە تەڕەکانا ئەگوزەرێ:
هێمن،
سەنگین،
سەرگەردان.
لە سەعات چوارا
لە ساتێکا کە ڕشتەی شینی دەمارەکانی
وەك ماری مردوو لەملاولای گەروویەوە
هەڵکشاون و
لە لاجانگە پەرێشانەکانیا ئەو برگە خوێنینە
ئەلێنەوە
–سڵاو
–سڵاو
ئایا تۆ قەت بۆنی
ئەو چوار گوڵاڵە شینەت
کردووە؟

زەمەن ڕۆیی
زەمەن ڕۆیی و شەو کەوتە سەر لقە ڕووتەکانی ئەکاکیا
شەو لەودیو شووشەی پەنجەرەکانەوە ئەخزێ و
بە زمانە ساردەکەشی
پاشماوەکانی ڕۆژی ڕۆییو هەڵئەلووشێ
من لەکوێوە دێم؟
من لەکوێوە دێم؟
وا بەمجۆرە بۆنی شەوم گرتووە؟

هێشتا گڵکۆی گۆڕەکەی تازەیە
گۆڕی ئەو دوو دەستە سەوزە لاوە ئەڵێم..

چەند میهرەبان بووی ئەی یار، ئەی تاقانەترین یار
چەند میهرەبان بووی کاتێ درۆت ئەکرد
چەند میهرەبان بووی کاتێ کە پێڵووی ئاوێنەکانت دائەخست و
چلچراکانت
لە لاسکە سیمیەکان ئەچنیەوەو
لە ئەنگوستەچاوی زاڵما منت بەرەو لەوەڕگای عیشق ڕاپێچ ئەکرد
تا ئەو هەڵمە گێژەی کە درێژەی گڕی تینوویێتی بوو
لەسەر چیمەنی خەو ئەنیشت
ئەو ئەستێرە کارتۆنیانەش
بە گەردوونی بێکۆتاییا ئەسووڕانەوە
بۆچی قسەیان کرد بە دەنگ؟
بۆچی نیگایان بە میوانی برد بۆ ماڵی دیدار؟
بۆچی سۆزیان بردە لای
شەرمی پرچەکانی کچێنی؟

بڕوانە لێرەدا
گیانی ئەو کەسەی کە بە قسە دواو
بە نیگا ژەنی و
بەنەوازش لە سڵەمینەوە ئارام بوو
چۆن بە دارەکانی وەهما
لە خاچ دراوە.

جێ پێنج چڵی پەنجەکانی تۆ
کە لە پێنج پیتەکەی "ڕاستی" ئەچوون
چۆن بەسەر گۆنای ئەوەوە بەجێماوە

بێدەنگی چییە، چییە، چی، ئەی تاقانەترین یار؟
بێدەنگی چییە، جگە لە کۆمەڵێ قسەی نەوتراو
من لە قسان ئەکەوم وەلێ زمانی چۆلەکەکان
زمانی ژیانی دێرە ڕەوانەکانی جەژنی سروشتە
زمانی چۆلەکەکان واتە: بەهار، گەڵا، بەهار
زمانی چۆلەکەکان واتە: شنەبا، عەتر، شنەبا
زمانی چۆلەکەکان لە کارگەدا گیان ئەدا.

ئەمە کێیە؟ ئەو کەسەی وا بەسەر شەقامی ئەبەدیەتا
بەرەو ساتی یەکبوون ئەڕوا
سەعاتە هەمیشەییەکەشی
بە لۆژیکی ماتماتیکیانەی لێدەرکردن و لێکجیاکردن قورمیش ئەکا
ئەمە کێیە؟ ئەو کەسەی وا خوێندنی کەڵەشێرەکان
بە سەرەتای دڵی ڕۆژ نازانێ
بەسەرەتای بۆنی بەرچایی ئەزانێ
ئەمە کێیە؟ ئەو کەسەی وا تاجی عیشقی لەسەر ناوەو
لەنێو جلی بووکێنیا داڕزاوە
کەواتە سەرەنجام هەتاو
لە یەک کاتا
لە هەردوو جەمسەرە نائومێدەکەی نەدا

تۆ لە زرنگەی کاشیە شینەکان خاڵی بوویتەوەو
منیش هێند پڕم کە نوێژ لەسەر دەنگم ئەکەن..

تەرمە بەختەوەرەکان
تەرمە خەمبارەکان
ئەو تەرمە بێدەنگانەی بیرئەکەنەوە
تەرمە رووخۆشەکان، جوانپۆشەکان، خۆشخۆرەکان
لە وێستگەکانی کاتە دیاریکراوەکاناو
لە زەمینەی گوماناویی رووناکیە کاتیەکاناو
شەهوەتی کڕینی میوە ڕزیوەکانی بێهوودەیی...
ئاخ
چ خەڵکانێ لە چوارپیپانەکانا نیگەرانی کارەساتن و
دەنگی شووتەکانی وەستاندنیش
لە ساتێکا کە ئەبێ، ئەبێ، ئەبێ
پیاوێك ببێ بەژێر تایەکانی زەمەنەوە
پیاوێك کە بەلای درەختە تەڕەکانا ئەگوزەرێ..

من لە کوێوە دێم
بە دایکم وت: "تازە تەواو"
وتم: "هەمیشە بەرلەوەی بیربکەیتەوە ئەقەومێ
ئەبێ پرسەنامەیەك بۆ ڕۆژنامە بنێرین"

سڵاو ئەی غوربەتی تەنیایی
ژوورەکەم بەتۆ ئەسپێرم

چونکە هەمیشە هەورە تارەکان

پێغەمبەرانی ئایەتە تازەکانی پاکژبوونەوەن و

لە شەهیدبوونی مۆمێکیشا

نهێنییەکی نوورانی هەیە

کە دواگرو درێژترینیان چاکی ئەزانێ.

باوەڕپهێنین

باوەڕ بهێنین بەسەرەتای وەرزی سارد

باوەڕ بهێنین بە وێرانیی باخەکانی خەیاڵ

بە داسە هەڵگەڕاوە بێکارەکان و

تۆوە زیندانیەکان.

بڕوانە چ بەفرێ ئەبارێ..

ئەشێ حەقیقەت ئەو دوو دەستە لاوە بووبێت، ئەو دوو دەستەلاوەی

کە لەژێر بارینی یەکبینەی بەفرێکا نێژران

ساڵێکی تریش، کاتێ بەهار

لەگەڵ ئاسمانی ئەودیو پەنجەرەکەدا ئەخەوێو

فوارە سەوزەکانی لاسکە سووکەکان

لە جەستەیدا هەڵئەقوڵێن

شکۆفە ئەکەن ئەی یار، ئەی تاقانەترین یار

باوەڕبهێنین بە سەرەتای وەرزی سارد..

**دوای تۆ**

ئەی حەوت ساڵی

ئەی ساتی سەیری سەفەر

دوای تۆ هەرچییەك ڕۆی، لە تۆپەڵێ شێتی و نەزانینا ڕۆی

دوای تۆ پەنجەرە کە پەیوەندییەکی تەواو زیندوو و ڕۆشن بوو

لە نێوان ئێمەو باڵندەدا

لە نێوان ئێمەو نەسیما

شکا

شکا

شکا

دوای تۆ ئەو بووکە شووشە خاکی‌یەی

هیچی نەئەوت، هیچ.. جگە لە ئاو، ئاو، ئاو

لە ئاودا خنکا

دوای تۆ ئێمە دەنگی زیکزیکەکانمان کوشت و

حەزمان لە دەنگی زەنگ کرد، کە لە پیتەکانی ئەلفوبێوە بەرزئەبۆوەو

لە دەنگی شووتی کارگەکانی چەکسازی

دوای تۆ کە شوێنی یاریمان ژێر مێز بوو

لەژێر مێزەکانەوە

بۆ پشت مێزەکان و

لە پشت مێزەکانیشەوە

گەیشتینە سەر مێزەکان و

لە سەر مێزەکانیش یاریمان کردو

دۆڕاین، ڕەنگی تۆمان دۆڕان، ئەی حەوت ساڵی.

دوای تۆ ئێمە خیانەتمان لەیەك كرد

دوای تۆ ئێمە بە پارچە قورقوشم و

بە دڵۆپە تەقیوەكانی خوێن

تەواوی یادگارییەكانمان لەسەر لاجانگە گەچاویەكانی

دیوارەكانی كۆڵان سرییەوە.

دوای تۆ ئێمە چووینە مەیدانەكان و

هاوارمان كرد:

"بژی

بمرێ"

لە ژاوەژاوی مەیدانیشا، چەپڵەمان بۆ دراوە بچووكەكانی ئەو گۆرانیبێژانە لێدا

كە زیرەكانە بۆ سەردانی شار هاتبوون.

دوای تۆ ئێمە كە بكوژی یەكتربووین

داوەریمان بۆ عیشق كردو

هەرچۆن لەكاتێكا دڵمان

لە گیرفانماندا نیگەران بوو

بۆ نسیبی عیشق داوەریمان كرد

دوای تۆ ئێمە ڕوومانكردە گۆڕستانەكان و

مەرگیش لەژێر عەبای دایە گەورەوە هەناسەی ئەدا

مەرگیش، ئەو درەختە زەبەلاحە بوو

كە زیندووەكانی ئەمسەری سەرەتا

دەخیلی لقە خەمبارەكانی ئەبوون و

مردووەكانی ئەوسەری كۆتاییش

چنگیان لە ڕەگە فۆسفۆرییەكانی گیر ئەكردو

مەرگیش لەسەر ئەو مەزارە پیرۆزە دانیشتبوو
کە لە پڕدا چوار گوڵاڵەی شین لەهەر چوار گۆشەکەیدا
ڕۆشن بوونەوە.
دەنگی بادێ
دەنگی با دێ، ئەی حەوت ساڵی

هەڵسام ئاوم خواردەوە
ناکاو ئەوەشم بەبیری خۆم هێنایەوە
چۆن کێڵگە لاوەکانی تۆ لە هێرشی کوللەکان ترسان.
ئەبێ چەند بدەین
بۆ گەورەبوونی ئەم شەش پاڵووە چیمەنتۆییە
ئەبێ چەند بدەین؟

ئێمە هەموو ئەو شتانەی
کە ئەبێ لە دەستمان دابێ، لە دەستمان داوە
ئێمە بێ چرا کەوتینە ڕێو
مانگیش، مانگ، ئەو مێینە میهرەبانە، هەمیشە لەوێ بوو
لە بیرەوەرییە منداڵانەکانی سەربانێکی گڵداو
بەسەر ئەو کێڵگە لاوانەوە کە لە هێرشی کوللەکان ئەترسان
ئەبێ چەند بدەین؟...

**پەنجەرە**

پەنجەرەیەك بۆ بینین
پەنجەرەیەك کە وەکو ئەڵقەی چاڵێك
لە کۆتایی خۆیدا ئەگاتە دڵی زەوی

بە ڕووی فراوانیی ئەم میهرەبانی‌یە بەردەوامە ڕەنگ شینەدا
ئەکرێتەوە
پەنجەرەیەك کە دەستە بچووکەکانی تەنیایی
لە بەخششی شەوانەی عەتری ئەستێرە بەخشندەکان
پڕ ئەکا و
ئەبێ لەوێوە
خۆر بکرێتە میوانی غوربەتی گوڵە شەمدانی‌یەکان"[٢]"
پەنجەرەیەك بۆ من بەسە
* * *
من لە دیاری بووکە شووشەکانەوە دێم
لەژێر سایەی درەختە کاغەزینەکانەوە
لە باخی کتێبێکی وێنەدارا
لە وەرزە وشکەکانی ئەزموونە نەزۆکەکانی هاوڕێیەتی و ئەڤینەوە
لە کۆڵانە خاکی‌یەکانی پاکیزەییا
لە ساڵانی گەورەبوونی پیتە ڕەنگ پەڕیوەکانی ئەلف و بێوە
لە پشت مێزەکانی قوتابخانە سیلدارەکەوە
لەو ساتەوەی کە مناڵەکان توانیان
لەسەر تەختەڕەشەکە بنووسن (بەرد) و
ریشۆڵە سەراسیمەکان لە درەختە پیرەکەوە دایان لە شەقەی باڵ
من لەنێو ڕەگی گیا گۆشتخۆرەکانەوە دێم و
هێشتا مێشکیشم
پڕە لە هاواری ترس و بیمی پەپوولەیەك
کە بەدەرزی‌یەك لەسەر دەفتەرێ
لە خاچیان دابوو
* * *
وەختێ کە متمانەم بە پەتی شلوشاوی عەدالەتەوە بەسترابۆوەو

لە تەواوی شارا

دڵی چراکانی منیان لەتوکوت ئەکرد

وەختێ کە چاوی منداڵانەی عیشقی منیان

بە دەسرێی تاریکی یاسا ئەبەست و

لە لاجانگە شپرزەکانی ئارەزوومەوە

فوارەی خوێن بۆ دەرەوە فیچقەی ئەکرد

وەختێ کە ژیانی من ئیدی

هیچ نەبوو، هیچ جگە لە چرکە چرکی سەعاتێکی دیوار

تێگەیشتم کە ئەبێ

ئەبێ

ئەبێ

دێوانە ئاسا عاشق بم

* * *

پەنجەرەیەك بۆ من بەسە

پەنجەرەیەك بۆ ساتی ئاگایی و ڕوانین و بێدەنگی

ئێستا نەمامی گوێزەکە

هێند باڵای کردووە کە دیوارەکە بۆ گەڵا لاوەکانی مانای هەبێ

ناوی فریادڕەست

لە ئاوێنە بپرسە

ئایا زەوی کە لەژێر پێی تۆدا ئەلەرزێ

لەتۆ تەنیاتر نییە؟

* * *

پێغەمبەران لەگەڵ خۆیانا پەیامی وێرانییان

بۆ ئەم سەدەیەمان هێنا

ئەم تەقینەوە پەی‌دەرپەیانەو

ئەم هەورە ژاراویانە

زرنگانەوەی ئایەتە پیرۆزەکانن؟

ئەی هاورێ، ئەی برا، ئەی هاوخوێن

وەختێ گەیشتیتە مانگ

مێژووی قەتلۆعامی گوڵەکان بنووسەوە

* * *

هەمیشە خەونەکان

لە بەرزایی ساویلکەیی خۆیانەوە پەرش ئەبن و ئەمرن

من وێنجەی چوار پەریان "2" بۆن ئەکەم

کە لەسەر گۆڕی بیروباوەڕە کۆنەکان رواوە

ئایا ئەو ئافرەتەی کە لە کفنی چاوەڕوانی و پاکیزەیی خۆیدا نێژرا،

لاوێتی‌ی من بوو؟

ئایا دووبارە من بە پلیکانەکانی وردبینی‌ی خۆما سەر ئەکەومەوە

تا سڵاو لەو خوایە باشە بکەمەوە کەلە سەربانیماڵەوە

هەنگاو ئەنێ؟

* * *

هەست ئەکەم زەمەن رۆییوە

هەست ئەکەم "سات" بەشی منە لە گەڵاکانی مێژوو

هەست ئەکەم مێز مەودایەکی درێیە لە نێوان پرچی من و

دەستەکانی

ئەم ئافرەتە غەریبە غەمگینەدا

قسەیەکم لەگەڵ بکە

کەسێك کە میهرەبانی‌ی جەستەیەکی زیندووت پێ ئەبەخشێ

جگە لە پەیبردن بە هەستی زیندوویتی چی‌ی لەتۆ ئەویٚ؟
قسەیەکم لەگەڵ بکە
من وام لای پەنجەرەکەوە
بە هەتاوەوە پەیوەستم

پەراوێزەکان:

1-گوڵی شەمدانی: جۆرە گوڵێکە.

2-وێنجەی چوار پەریان: جۆرە گیایەکە کە ئاژەڵان ئەیخۆن.

### دڵم بە باخچەکە ئەسووتێ

کەسێ نی‌یە بیر لە گوڵەکان بکاتەوە
کەسێ نی‌یە بیر لە ماسی‌یەکان بکاتەوە
کەس نایەوێ
بڕوا بکا کە باخچە خەریکە ئەمرێ
دڵی باخچەکە لەژێر هەتاوا ئاوساوە
زەمینیشی وا خەریکە هێدی هێدی
لە بیرەوەری‌یە سەوزەکان خاڵی ئەبێ
هەستی باخچەکەش هەر ئەڵێی
شتێکە تەنیاو لە گۆشەیەکی باخچەکا داڕزاوە.

حەوشەکەی ماڵی ئێمە تەنیایە
حەوشەکەی ماڵی ئێمە
لە چاوەڕوانیی بارینی هەورێکی نەناسا
باوێشك ئەدا
حەوزی ماڵەکەشمان خاڵی‌یە

ئەستێرە بچووکە بێئەزموونەکان
لە بەرزایی درەختەکانەوە ئەکەونە سەر زەوی و
لە پەنجەرەی ڕەنگ پەڕیوی ماڵی ماسییەکانەوە
شەوانە دەنگی کۆکە دێ
حەوشەکەی ماڵی ئێمە تەنیایە
باوکم ئەڵێ:
"لە من ڕۆیی
لە من ڕۆیی
من باری خۆمم برد
من کاری خۆمم کرد"
لە سپێدەشەوە تا ئێوارێ
یا شانامە ئەخوێنێتەوە
یا "ناسیخولتەواریخ"
باوکم بە دایکم ئەڵێ:
"نەفرەت لەچی ماسی و مەلە
وەختێ کە من مردم ئیدی
باخچە هەبێ یاخود نەبێ
بە من چی
من بەتەنها مووچەی تەقاوتیم بەسە."

دایکم تەواوی ژیانی
بەرماڵێکە ڕاخراو
لە بەردەم ترسی دۆزەخا
دایکم هەمیشە لەبنی هەر شتێکا

بەدوا جێ پێی گوناهێکا ئەگەڕێ و
بە بڕوای ئەو کوفری گیایەکە
باخچەکەی وا پیس کردووە.
دایکم تەواوی ڕۆژ دووعا ئەکا
دایکم گوناهبارێکی سروشتییەو
فوو بە گوڵەکانا ئەکاو
فوو بە ماسیەکانا ئەکاو
فوو بە خۆیا ئەکا
دایکم چاوەڕوانی دەرکەوتن و
بەخشنشێکە لە ئاسمانەوە دائەبەزێ.

براکەم بە باخچەکە ئەڵێ گۆڕستان
براکەم بە پەشێویی گیاکان پێئەکەنێ و
تەرمی ئەو ماسیانە ئەژمێرێ
کە لە ژێر پێستی نەخۆشی ئاودا
ئەبن بە گەردیلەی ڕزیو
براکەم بە فەلسەفە موعتادە
براکەم چاری باخچەکە
لە وێرانبوونیدا ئەبینێتەوە.
ئەو مەست ئەبێ و
مشتەکۆڵە بەدارو دیوارا ئەکێشێ و
ئەیەوێ بڵێ کە زۆر دەردەدارو شەکەت و بێ هیوایە
ئەو نائومێدییەکەشی
وەکو ناسنامەو ساڵنامەو دەسڕو چەرخ و قەڵەمەکەی

لەگەڵ خۆیدا
بۆ کۆڵان و بازاڕ ئەبا
نائومێدییەکەشی هێند بچووکە
کە گشت شەوێ
لە ئاپۆرەی مەیخانەیەکا ون ئەبێ.

خوشکیشم کە هاوڕێی گوڵەکان بوو
کاتێ دایکم لێی ئەدا
ڕازە سادەکانی دڵی خۆی
ئەبردە لای کۆڕە میهرەبان و بێدەنگەکەی ئەوان و
ناوبەناویش خێزانی ماسیەکانی
ئەکردە میوانی شیرینی و هەتاو..
ئەو ئێستا ماڵی وا لەوبەری شار
لە ناو خانووە ساختەکەیدا
لەگەڵ سوورە ماسیە ساختەکانیاو
لە پەنا عیشقی هاوسەرە ساختەکەیاو
لەژێر لقی دارسێوە ساختەکانا
مناڵی سروشتی ئەخاتەوە
ئەو
هەر کاتێ بۆ سەردانی ئێمە دێ و
چمکی کراسەکەی بە هەژاریی باخچەکە پیس ئەبێ
بە کۆڵۆنیا خۆی ئەشوا
ئەو
هەرکاتێ بۆ سەردانی ئێمە دێ

دووگیانە.

حەوشەکەی ماڵی ئێمە تەنیایە
حەوشەکەی ماڵی ئێمە تەنیایە
تەواوی ڕۆژ
لەودیو دەرگاکەوە دەنگی پارچە پارچە بوون و
تەقینەوە دێ
گشت هاوسێکانمان لەزەویی باخچەکانیانا لەبری گوڵ
خومپارەو ڕەشاش ئەڕوێنن
گشت هاوسێکانمان سەرپۆش ئەدەن بەسەر
حەوزە کاشیەکانیانا
حەوزە کاشیەکانیش
بێ ئەوەی خۆیان بیانەوێ
عەمباری شاراوەی بارووتن
منداڵانی گەڕەکەکەشمان، جانتاکانی قوتابخانەیان
پڕکردووە لە بۆمبی بچووک.
حەوشەکەی ماڵی ئێمە گێژە.

من لە زەمەنێك ئەترسم
کە دڵی خۆی ون کردووە
من لە تەسەوری بێهودەیی ئەم هەموو دەستەو
لە بەرجەستەبوونی نامۆیی ئەم هەموو دەموچاوە ئەترسم
من وەکو ئەو قوتابی‌یەی
کە شێتانە حەزی لەوانەی ئەندازەیە، تەنیام و

بیر ئەکەمەوە کە ئەبێ باخچەکە ببرێ بۆ نەخۆشخانە
من بیر ئەکەمەوە..
من بیر ئەکەمەوە..
من بیر ئەکەمەوە..
دڵی باخچەکەش لەژێر هەتاوا ئاوساوە
زەینیشی وا خەریکە هێدی هێدی
لە بیرەوەرییە سەوزەکان خاڵی ئەبێ..

**کەسێ کە لە هیچ کەس ناچێ**

من خەونم دیوە کەسێ دێ
من خەونی ئەستێرەیەکی سوورم دیوەو
پێڵووی چاوم ئەفرێ
پێڵاوەکانم جووت ئەبن و
کوێربم
ئەگەر درۆ بکەم
من کاتێ نەخەوتبووم
خەونی ئەو ئەستێرە سوورەم دی
کەسێ دێ
کەسێ دێ
کەسێکی تر
کەسێ باشتر
کەسێ کە لە هیچکەس ناچێ، لە بابە ناچێ، لە مرۆ ناچێ،
لە یەحیا ناچێ، لە دایە ناچێ و
لەو کەسە ئەچێ کە ئەبێ بچێ و

باڵاشی لە درەختەکانی ماڵی ئەندازیاری بیناش بەرزترەو

دەموچاویشی

لە دەموچاوی ئیمامی زەمان نوورانی ترەو.

لە براکەی سەید جەوادیش ناترسێ

کە ڕۆیشتووەو

جلی پاسەوانیشی پۆشیوە

لە سەید جەواد خۆیشی ناترسێ کە تەواوی ژوورەکانی ماڵی ئێمە

هینی ئەوە

ناویشی هەروەکو دایکم

لە سەرەتاو کۆتایی نوێژدا بانگی ئەکا

یا (قاضي القضاة)ە

یا (حاجةُ الحاجات) و

ئەشتوانێ بەچاوی نووقاوەوە

تەواوی شتە قورسەکانی کتێبی پۆلی سێ بخوێنێتەوەو

تەنانەت ئەتوانێ بێ نوقسان

هەزار لە بیست ملیۆن جیابکاتەوەو

ئەتوانێ هەرچیەکی پێویست بێ، لە کۆگاکەی سەید جەواد

بە قیست بیهێنێ و

ئەشتوانێ کارێ بکا کە گلۆپی "ئەڵڵا"

کە سەوزبوو: وەکو سبەی سەحەر سەوز بوو.

دوبارە بەسەر ئاسمانی مزگەوتی میفتاحیاندا

ڕووناك بێتەوە

ئاخ..

ڕووناکی چەند خۆشە

ڕووناکی چەند خۆشەو

من چەند حەزئەکەم

یەحیا

عەرەبانەیەکی هەبێ

لەگەڵ چرایەکی لۆکسا

چەند حەزئەکەم

لەسەر عەرەبانەکەی یەحیا لەناو شووتی و کاڵەکەکانا دانیشم و

بە دەوری مەیدانی محەمەدیەدا بسووڕێمەوە

ئاخ..

سووڕانەوە بە دەوری مەیدانی محەمەدیەدا چەند خۆشە

خەوتن لە سەربان چەند خۆشە

چوون بۆ باخی میللی چەند خۆشە

تامی پیپسی چەند خۆشە

سینەمای فەردین چەند خۆشە

منیش چەند حەزم لە هەموو شتە خۆشەکانەو

چەند حەز ئەکەم

پرچی کچەکەی سەید جەواد ڕاکێشم

بۆ من ئەوەندە بچکۆلەم

کە لە شەقامەکانا ون ئەبم

باوکم کە ئەوەندەش بچکۆلە نییەو

لە شەقامەکانیشا ون نابێ

بۆ کارێ ناکا ڕۆژێ زووتر ئەو کەسە بێت

کە هاتۆتە خەونی من

ئەی خەڵکی گەڕەکی قەسابخانە*
کە خاکی باخچەکانیشیان خوێناوییە
ئاوی حەوزەکانیشیان خوێناوییە
بنی پێڵاوەکانیشیان خوێناوییە
بۆ کارێ ناکەن؟
بۆ کارێ ناکەن؟

هەتاوی زستان چەند تەمەڵە

من پێپلیکانەکانی سەربانم گسک داوە
شووشەی پەنجەرەکانیشم شتووە
باوکم بۆ تەنها کە ئەخەوێ
خەون ئەبینێ.
من پێپلیکانەکانی سەربانم گسک داوە
شووشەی پەنجەرەکانیشم شتووە

کەسێ دێ
کەسێ دێ
کەسێ کە بەدڵ، بە هەناسە، بەدەنگی لەگەڵ ئێمەیە

کەسێ کە ڕێ
لە هاتنی ناگیرێ و
کەلەپچە ناکرێ و ناخرێتە زیندانەوە
کەسێ کە لەژێر درەختە کۆنەکانی یەحیادا منالی بووەو
ڕۆژ بە ڕۆژیش

گەورە ئەبێ، گەورەتر ئەبێ
کەسێ لە باران، لە دەنگی خورەی باران، لەنێو چرپە چرپی
گوڵە ئەتڵەسیەکانەوە
کەسێ لە ئاسمانی "توپخانە"وە لە شەوی یاریی دەمەقاچانا دێ و
سفرە ڕائەخاو
نان بەش ئەکاو
پیپسی بەش ئەکاو
باخی میللی بەش ئەکاو
شرویی کۆکە ڕەشە بەش ئەکاو
ڕۆژی ناونووسین بەش ئەکاو
نمرەی نەخۆشخانە بەش ئەکاو
جزمەی لاستیك بەش ئەکاو
سینەمای فەردین بەش ئەکاو
درەختەکانی کچەکەی سەید جەواد بەش ئەکاو
هەرچیەك ئاوسابێ بەشی ئەکاو
بەشی ئێمەش ئەدا
من خەونم دیوە..

## هەر دەنگە ئەمێنێتەوە

بۆ ڕاوەستم، بۆ؟
باڵندەکان چوونە سۆراخی شینایی
ئاسۆ ستوونی‌یە
ئاسۆ ستوونی‌یەو جووڵەش: فوارە ئاسا
لە سنووری ڕوانینیشا
هەسارە درەوشاوەکان ئەسووڕێنەوە
زەوی لە بەرزاییا ئەگاتە دووپاتبوونەوەو
چاڵەکانی هەواش
ئەبن بە تونێلی پەیوەندی

ڕۆژیش فراوانی‌یەکە
کە لە خەیاڵی تەسکی کرمی ڕۆژنامەدا جێی نابێتەوە.

بۆ ڕاوەستم؟
ڕێ بەنێو دەمارە باریکەکانی ژیانا تێئەپەڕێ.
چلۆنایەتیی ژینگەی کەشتیی منداڵانی مانگ
خانە ڕزیوەکان ئەکوژێ و
لە کەشوهەوای کیمیایی پاش خۆرکەوتنا
هەر دەنگە
بەرەو لای گەردیلەکانی زەمەن ئەچێ
بۆ ڕاوەستم؟

گۆماو ئەبێ چی بێ
ئەبێ چی بێ جگە لە شوێنی گەراداناني مێرووە گەندەڵەکان؟
تەرمە ئاوساوەکان بیروڕاکانی مەیتخانە پێکئەهێنن
نامەرد لە تاریکیا
نامەردیی خۆی شاردۆتەوەو
سیسرك.. ئاخ
کاتێ کە سیسرك ئەدوێ.

بۆ ڕاوەستم؟
هاوکاریی پیتە ڕەساسیەکان بێهودەیە
هاوکاریی پیتە ڕەساسیەکان
هزری هیچ و پووچ ڕزگار ناکا
من لە وەچەی درەختانم
مەڵمژینی هەوای وەستاو بێزارم ئەکا
ئەو باڵندەیەی مردبوو ئامۆژگاریی کردم
فڕین بە یادم بسپێرم

کۆتایی تەواوی هێزەکان پەیوەستی‌یە، پەیوەستی

بە ئەسڵی ڕۆشنی خۆرەوەو

ڕژانە ناو ئیحساسی تیشکەوە.

سروشتی‌یە کە ئاشە هەواییەکان دائەڕزێن.

بۆ ڕاوەستم؟

من گوڵە گەنمە نەگەیشتووەکان

ئەخەمە ژێر مەمکمەوەو شیر ئەدەم.

دەنگ، دەنگ، هەر دەنگ

دەنگی حەزی ڕوونی ئاو بۆ بەڕێکەوتن

دەنگی ڕژانی تیشکی ئەستێرە بەسەر دیواری مێینەی خاکدا

دەنگی بەدەڵەمەبوونی نوتفەی ماناو

دەنگی والاکردنی زەینی هاوبەشی عیشق

دەنگ، دەنگ، دەنگ، هەر دەنگە ئەمێنێتەوە.

لە وڵاتی گرگنەکانا

پێوانەکانی هەڵسەنگاندن

هەمیشە بەدەوری خولگەی سفردا سەفەر ئەکەن.

بۆ ڕاوەستم؟

من گوێڕایەڵی هەر چوار توخمەکەم و

کاری دانانی نیزامنامەی دڵم

کاری حکومەتی ناوچەیی کوێرەکان نی‌یە

من چیم داوە لە قروسکەی درێژی وەحشیانە

لە ئەندامی سێکسی‌ی ئاژەڵدا

من چیم داوە لە جووڵەی هیچ و پووچی کرم لە بۆشایی گۆشتندا

ڕەچەڵەکی خوێنینی گوڵان منی بە ژیانەوە بەستۆتەوە
ڕەچەڵەکی خوێنینی گوڵان، ئەزانی چییە؟

**باڵندە مەرگی لە پێشە**

دڵم تەنگە
دڵم تەنگە

ئەچمە هەیوان و پەنجەکانم
بە پێستی کشاوی شەودا دێنم

چراکانی پەیوەندی تاریکن
چراکانی پەیوەندی تاریکن
کەسێ نییە بەهەتاوم بناسێنێ
کەسێ نییە بە میوانی بمبا بۆ لای چۆلەکەکان
فرین بەیادت بسپێرە
باڵندە مەرگی لە پێشە

# گراکۆسی ڕاوچی

▪ چیرۆکی: فرانز کافکا

▪ و. له فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد


فرانز کافکا

دوو کوڕ لەسەر دیواری بەندەرەکە دانیشتبوون و یاری زارزارێنیان دەکرد، پیاوێك لەسەر پلیکانەی پەیکەرە یادمانیەکان[2]، لە سێبەری پاڵەوانێکی بەردیندا کە شمشێرەکەی لە حەوادا هەڵکێشابوو دانیشتبوو و ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، کچێك سەتڵەکەی لە کانی پڕ دەکرد، میوەفرۆشێك لە پاڵ تەرازوەکەیدا ڕاکشابوو و چاوی لە دەریا بڕیبوو، دوو پیاو، لە پەنجەرەیەکی کراوەو لەناو دەرگای کافیتریایەکەوە دەردەکەوتن و لە پشتەوەی کافیتریاکەوە شەرابیان دەخواردەوە، خاوەن کافیتریاکە لەبەردەم کۆگاکە لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوو وەنەوزی دەدا، بەلەمێك کە دەت وت دەستێکی نادیار هێناویەتی، لەسەرخۆ لە بەندەرە بچوکەکە نزیك دەبوەوە، پیاوێك بە چاکەتێکی شینەوە لە کەنار دەریاوە سەرکەوت و

گوریسێکی به ئەڵقەیەکدا کرد، دوو پیاوی تر بە چاکەتی رەشی دوگمە زیوینەوە، لە پشت سەری بەلەمەوانەکەوە، تابوتێکیان نایە سەرشان کە لەوە دەچوو مرۆڤێکی تیا پاڵ کەوتبێت، پارچە ئاوریشمێکی گوڵدارو گوڵینکەداری گەورەیشیان بەسەر تابوتەکەدا کێشابوو.

لەو شوێنەدا کە باری تیادەکرێت کەسێك نەبوو خۆی لە تازەهاتوەکان بکەیەنێت، تەنانەت کە تابووتەکەیشیان خستە سەر زەوی و چاوەڕێی هاتنی بەلەمەوانەکەیان کرد، کە هێشتا سەرگەرمی بێنەو بەردەی گوریسەکە بوو وەستان، کەسیان لێ نزیك نەکەوتەوە، کەس هیچی لێ نەپرسین، کەس وەك کرێسێکیش (فزولی) تەماشای نەکردن.

بەلەمەوانەکە سەرگەرمی کاری ژنێك بوو کە منداڵێکی گرتبوە باوشی و بە پرچە ئاڵۆزەکەیەوە لەسەر سەکۆی بەلەمەکە دانیشتبوو، پیاوەکە کەمێك چوە پێشەوەو ئاماژەی بۆ خانوویەکی دوو قاتی زەرد کرد کە لە پاڵ دەریاکەدا، لای دەستە چەپەوە، بەرز دیار بوو، تابوت کێشەکان بارەکەیان هەڵگرت، تا پاڵ دەرگای ماڵەکە کە دەرگایەکی نسزم بەلام ستوونەکانی زەبەلاح بوون بردیان، لەوکاتەدا کورپژگەیەك پەنجەرەیەکی کردەوە. تا ئەو کەسانە ببینێت کە لەنێو خانوەکەدا دیار نەدەمان، پاشان بە پەلە پەنجەرەکەی داخست، دەرگاکەش داخرا، دەرگاکە لە دار بەڕوویەکی رەش و زۆر توکمە دروست کرابوو، پۆلە کۆترێك کە بە دەوری بورجی کەنیسەکەدا باڵەفڕێیان بوو، لە سەرشەقامی بەردەم دەرگاکەدا نیشتنەوە، کۆترەکان کە دەت وت دانەکەیان لەناو خانوەکەدا ئەنبار کراوە، لەبەردەم دەرگای خانوەکەدا کۆبوونەوە، کۆترێکیان تا قاتی یەکەم باڵی گرت و دەنووکی لە پەنجەرەکەدا، کۆترەکانی دی رەنگیان کراوەو جوان و گۆشتن بوون، ژنی ناو بەلەمەکە، دەستی درێژکردو دانی بۆ فڕێدان، کۆترەکان دانەکەیان خواردو بەرەو ژنەکە باڵیان گرت.

پیاوێك کە کڵاوێکی شێوە لوولەکی لەسەردا بوو، لە کۆلانێکی باریك و زۆر لێژەوە، کە لە بەندەرەکەدا کۆتایی دەهات، هاتە خوارێ، شریتێکی رەشی بەکڵاوەکەیەوە بەستبوو، وەك سووسەکەر تەماشایەکی ئەملاولای کرد، شتێك نەدەبینرا کە ئەو دڵگیر نەکات، هەندێك گۆڤەکی لە سوچێکدا بینی، سەروچاوی پێکدادا، لەسەر پلیکانەی پەیکەری یادمانەکەدا توێکڵی میوەیان رشتبوو، بە پاڵیاندا تێپەڕی و بە دارەکەی دەستی گسکی دان، لە دەرگای خانوەکەی داو، هەر لەو کاتەیشدا بەدەستی، کە لە دەست کێشێکی رەشدا بوو، کڵاوە لوولەکیەکەی لەسەری داگرت، دەرگاکە زوو کرایەوەو نزیکەی پەنجا کورێژگە لە دوو ریزدا، لە داڵانێکی درێژدا، دەرکەوتن و لە بەردەمیا سەریان دا نەواند.

بەلەمەوانەکە لە پلیکانەکان هاتە خوارێ، سڵاوی لە پیاوە رەش پۆشەکە کرد، بردیە قاتی دووەم، لە ڕاڕەوە روناك و خۆشەکەوە، کە دەوری حەوشەکەی دابوو، رێنمایی کرد، هەردووکیان، لە کاتێکدا کە منداڵەکان، بۆ رێز لێگرتنیان، چەند هەنگاوێك لە دوایانەوە بوون، پێیان نایە ناو ژوورێکی گەورەو فێنکەوە کە بەودیوی ماڵەکەیدا دەیڕوانی. لە پەنجەرەی ژوورەکەوە بێجگە لە دیوارێکی سادە، رەنگ خۆڵەمێشی، رەش داگەڕاوی بەردین هیچ ماڵێکی تر دیار نەبوو، تابوت هەڵگرەکان سەرگەرمی دانان و داگیرساندنی چەند مۆمێکی درێژ بوون بەسەر سەری تابووتەکەوە، مۆمەکان

روناکیەکیان نەبوو بەڵکوو تەنیا ئەو سێبەرانەیان دەخستە سەر دیوار کە تا ئەو کاتە بێ جووڵە بون و پاشان کەوتنە لەرزین، قوماشی سەر تابووتەکەیان لابردبوو، پیاوێك کە تا ڕادەیەك لە ڕاوکەری دەکرد بەقژی درێژو ئاڵۆزیەوە تیا ڕاکشابوو،بێ جوڵەو وا دەهاتە بەرچاو کە هەناسە نادات و چاوی نووقاوە، لەگەڵ ئەمانەیشدا تەنیا شتەکانی ئەم لاولای وایان دەردەخست کەمردووە.

پیاوە خانەدانەکە هەنگاوی ناو هاتە سەر تابووتەکە، دەستی خستە سەر تەوێڵی ئەو پیاوەی کە تیا ڕاکشابوو، پاشان کەوتە سەر ئەژنۆو دروودی خوێند، بەلەمەوانەکە ئاماژەی بۆ تابووت هەلگرەکان کرد تا لە ژوورەکە بچنە دەرێ، ئەوان چوونە دەرەوە، منداڵەکان کە لە دەرەوە کۆببوونەوە دووریان خستنەوەو دەرگاکەیان داخست، وەلێ لەوە نەدەچوو ئەم کارە بەدڵی پیاوە خانەدانەکە بێت، تەماشایەکی بەلەمەوانەکەی کرد، بەلەمەوانەکە کەوتە لاوەو لە دەرگایەکی نهێنیەوە، لە ژوورێکی تردا ون بوو، پیاوی ناو تابووتەکە زوو چاوی کردەوە، بە ناخۆشیەوە سەری بۆ لای خانەدانەکە وەرگێراو وتی: "تۆ کێیت؟".

خانەدانەکە بێ ئەوەی سەیری لێ بێت، هەستاو وتی: "سەرۆك شارەوانی ریڤا"[3]

پیاوی ناو تابووتەکە سەری ڕاوەشاند، بە دەستە بێ تواناکەی ئاماژەی بۆ کورسیەك کردو دوای ئەوەی سەرۆك شارەوانی بە قسەی کرد وتی: "دیارە ئەوە دەزانم. جەنابی سەرۆك شارەوانی، شتێك هەیە، لە سەرەتای بەهۆش هاتنەوەمدا هەمیشە تووشی لەبیرچوونەوە دێم، شتەکان لە بەرچاومدا سوور دەخۆن و چاك وایە هەموو شتێك بپرسم، تەنانەت ئەگەر بیشی زانم، ڕەنگە تۆیش بزانیت کە من گراکوسی ڕاوچیم".

سەرۆك شارەوانی وتی: "بێگومان، دوێنێ شەو هەواڵی هاتنتم زانی، ماوەیەك بوو نوستبووین، لە نیوەشەودا ژنەکەم هاواری کرد: "سالڤاتورە– بەناوی خۆم بانگی کردم– تەماشای ئەو کۆترەی پشت پەنجەرە بکە" بە ڕاستی بە ڕاستی کۆتر بوو، بەلام هێندەی کەڵەشێرێك دەبوو، بەرەو لای من هەڵفڕی و بە گوێما چرپاندی کە سبەینێ گراکۆسی ڕاوچی کە مردووە دەگاتە ئێرە. بەناوی شارەوە پێشوازیی لێ بکە.

ڕاوچی سەری لەقاندو لێوی بەسەری زمانی تەڕکرد و وتی: "بەڵێ، کۆترەکان لێرە لە بەردەمی مندا هەڵفڕین، بەلام بە بۆچوونی تۆ، جەنابی سەرۆك شارەوانی، من لە ریڤادا دەتوانم بمێنمەوە؟"

سەرۆك شارەوانی وەلامی دایەوە: "جارێ ئەوە ناوترێت، تۆ مردوویت؟"

ڕاوچی وتی: "وەك دەی بینیت، بەڵێ، ڕاستیا سالانی پێشتر، بەڵێ، لە ساڵەهای ساڵ پێشتر، من لەناو دارستانە ڕەشەکەدا –یەعنی لەناو ئەڵماندا– هەروا کە کەوتبوومە دوای بزنە کێویەك لە بەرزیەکەوە هەڵدێرام، لەو کاتەوە تا ئێستا مردووم"

سەرۆکی شارەوانی وتی: "بەلام تۆ زیندوویشیت"

ڕاوچی وتی: "لە لایەکەوە بەڵێ، لە لایەکەوە زیندوم، کەشتی مەرگی من ڕێگاکەی ون کرد، ستێرنەکەی بە هەڵە سووڕاوە، یان کەشتیەوان بۆ چرکە ساتێك هەستی پەرت بوە، یان شەوقی

بینینی خاکی جوانی باوو باپیرانم بوە بەهۆ، ناتوانم بیلێم، ئەوەی دەتوانم بیلێم ئەوەیە کە لەسەر زەوی مامەوەو ئەوسا کەشتیەکەم، تا ئێستا، لەسەر ئاوەکانی سەرزەوی دێت و دەڕوات، بۆیە، من شتێکی لەوە چاکترم نەویستوە کە لەناو دڵی کێوەکاندا بژیم، دوای مردنم بەناو هەموو وڵاتەکانی گۆی زەویدا سەفەر دەکەم.

سەرۆکی شارەوانی بەرۆی لێکداو وتی: "یەعنی لەو دنیا کارێکتان نیە؟"

ڕاوچی وەڵامی دایەوە: "من هەمیشە بە سەر پلیکانە بەرزەکەوە وەستاوم کە بە دەروازەکەی کۆتایی دێت، بەسەر ئەو پلیکانە فراوان و بێ کۆتایی و پانە، بە هەموو لایەکدا دەڕۆم، جارێك بۆ سەرەوەو جارێك بۆ خوارەوە، تاوێك بۆ ڕاست و تاوێك بۆ چەپ، هەمیشە دەبزوم، ڕاوچی وەکوو پەروانەی لێ هاتوە، پێ مەکەنە"

سەرۆکی شارەوانی بەرگری لە خۆی کردو وتی: "پێ ناکەنم" ڕاوچی وتی: "گەورەیی خۆتانە، من هەمیشە دەبزوم، بەڵام کاتێك دەست بەفڕینی گەورە دەکەم و دەروازەکە دەبینم بەرانبەرم دەبریسکێتەوە، بێ سێ و دوو بەرەو کەشتیە کۆنەکەم، کە هێشتا غەریبانە لە سەر دەریای زەوی یا شتێکی وا لە قوڕ نیشتوە، لە خەو هەڵدەستم، لەناو ژوورەکەمدا ڕاکشاوم و تەنیا هەڵەی گەورەی مەرگم کاڵتەجاڕانە پێم پێ دەکەنێت، ژولیا، ژنی کەشتیەوان لە دەرگا دەدات و شەربەتی بەیانی سەرزەمینێك کە بەرێکەوت بە کەنار ڕۆخەکەیدا تێپەڕین، دەخاتە سەر تابووتەکە، من لەسەر شوێن خەوێکی دارین ڕاکشام، کفنێکی سپیم لەبەرکرد، -کەس چێژ لە بینینم نابات- مووی سەروریشم، کە ڕەش و هەندێك شوێنی خۆڵەمێشیە، بێ ئەندازە ئاڵۆز بوە، لەشم بە شاڵێکی گەورەی گوڵدارە ریشەدار داپۆشراوە، مۆمی دواشێوی مەسیح (عەشای ڕەبانی) بەسەر سەرمەوەیەو ڕووناکیم دەخاتە سەر، تابلۆیەکی بچووکی سەردیوار بەرانبەرم هەڵواسراوە کە بە ڕوونی "بوش مانێك"[4] نیشان دەدات کە ڕمێکی گرتۆتە من و زیرەکانە لە پشت سپەرێکی تێکەڵەڕەنگی جوانەوە خۆی پەناداوە، مرۆڤ کە لەناو کەشتیەکدا دەکەوێتە نێو خەیاڵاتی بێ عەقڵانەوە، باسی ئەم بوش مانانە، لە هەموو خەیاڵاتەکانی دی بێ عەقڵانەترە، بێجگە لەوەی کە وتم، سندووقە دارینەکەی من تەواو خاڵیە، لە کونە دیوارەکانی پاڵمەوە هەوای گەرمی شەوانەی باشوور هەڵدەکات و من دەنگی پێکدادانی ئاوو کەشتیە کۆنەکە دەبیستم.

"من، گراکوسی ڕاوچی دارستانی ڕەش، لەو کاتەوەی کەوتمە دوای ئەو بزنە کێویەو هەڵدێرام و لێرەدا کەوتم، هەموو کارەکان بە ڕێك و پێکی پێش هاتن. کەوتمە دوای بزنە کێوی، هەڵدێرام، لە دەربەندەکەدا ئەوەندەم خوێن لەبەر ڕۆشت کە مردم و بڕیار بوو ئەم کەشتیە من بەرێتە دنیاکەی دی. هێشتا لە بیرمە کە یەکەم ڕۆژ بە چ خۆشیەکەوە لەسەر ئەم ڕایەخە دارینە پاڵ کەوتم، هیچ کاتێك چیاکان، وەك ئەم چوار دیوارە تاریکە، گوێیان لەو ئاوازانەم نەگرت کە من سەرم بۆ دانان.

"بە خۆشی ژیام و بەخۆشی مردم، پێش ئەوەی پێ بنێمە نێو بەلەمەکە، کیسەی باروتە نابوودەکەم و کۆڵە پشت و تفەنگی ڕاوەکەم، کە هەمیشە بە شانازیەوە دەمکردە شانم، بەخۆشیەوە فڕێم دان وەك کچێك کە بەرگی بۆکێنی لەبەر بکات کفنەکەمم لەبەرکرد. پاڵ کەوتم و چاوەڕێ بووم، ئەوسا ئەم بەدبەختیە ڕێی پێ گرتم"

سەرۆکی شارەوانی دەستی بەرەنگاری بەرزکردەوەو وتی: "بڵێ کامە بەدبەختی، ئەی ئێوە خۆتان بە تاوانبار نازانن؟".

راوچی وتی: "نەء، من راوچی بووم، کەی ئەمە تاوان بوە؟ من لە دارستانی رەشدا، کە تازە گورگی تیا پەیدا دەبوو، بە دوای کاری خۆمەوە بووم، بۆسەم دادەنا، نیشانم دەنایەوە، نێچیرم راودەکردو دەم گروون، کەی ئەم کارە تاوانە؟ کارێکی چاك بوو، ناویان لیّ نابووم راوچی دارستانی رەش، گوناهی ئەم کارە لە چیدایە؟

سەرۆکی شارەوانی وتی: "من بۆ ئەمە نەهاتوومەتە ئێرە، راستی، بەرای منیش، ئەم شتانە تاوان نین، بەلاّم بابزانم، ئەی ئەم تاوانە لەملی کێیە؟

راوچی وتی: "لە ملی کەشتیەوانە، لێرە کەس گوێ بەقسەی من نادا، کەس نایەت هاوکاریم بکات، تەنانەت ئەگەر بەهەموو خەڵك بڵێن هاوکاریم بکەن، هیچ دەرگاو پەنجەرەیەکم لیّ ناکرێتەوە، هەموو دەچنە نێو پێخەف و مەل مەلەکەیان بەسەر خۆیاندا دەکێشن. هەموو ئەم گۆی زەوییە دەبێتە میوانخانەی شەو.

وە نەبێت ئەم کارە بێ مانایش بێت، چونکە کەس ئاگای لە بوونی من نیە، ئەگەر ئاگاداریش بێت جێگاکەم نازانێت و ئەگەر جێگاکەم بزانێت نازانێت چۆن رەفتارم لەگەڵدا بکات، نازانێت بە چ جۆرێك کۆمەکیم بکات، بیری کۆمەك کردن بە من جۆرێکە لە نەخۆشی، دەبێت بۆ چارەسەرکردنی لەناو جێگادا بکەویت.

"هەموو ئەمانە دەزانم، هەر لەبەر ئەمەیشە داوای کۆمەك لەکەس ناکەم، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك جار —وەك ئێستا کە تەواو شێواوم— بە راستی بیردەکەمەوە، بەلاّم بۆ ئەوەی کە لەدەست ئەو بیرانە رزگارم بێت پێویستە تەماشایەکی ئەم لاو ئەولای خۆم بکەم و بزانم لە کوێدام و —دڵنیاملەوەی— کە سەدان ساڵە لەکوێدا بووم".

سەرۆکی شارەوانی وتی: "ئا سەیرە، سەیرە! تۆ بیر لەوە دەکەیتەوە لێرە، لە ریفا، لای ئێمە بمێنیتەوە؟"

راوچی بزەیەکی کردو وتی: "بیر لەوە ناکەمەوە" بۆ ئەوەیش کە داوای پوزشی لیّ بکات دەستی نایە سەر ئەژنۆی سەرۆکی شارەوانی و وتی: "لەوە گەرێ کە من لێرەم، نازانم چی تر بڵێم، پێی رۆیشتنم نیە، کەشتیەکەم ستێرنی نیەو بەو بایە دەجولێت کە لە قولایی ولاّتی مەرگەوە هەڵدەکات.

## پەراوێز:

- Gracchas —
- پەیکەری یادانی (النصب التذکاریة). —
- Riva —
- (bushmaz) ئاماژەیە بە ریش سپێتی و کورتەبالاّی بیابانگەرەکانی ئەفریقا. —

# ڕەخنەیەك لە چیرۆكی

# (گراكۆسی ڕاوچی)

**لاینیل تریلینگ**

کەم تا زۆر هەرکەسێك ئەم چیرۆکە بخوێنێتەوە دەڵێت یان ڕەنگە بەسەر سامیەوە هاواری لێ هەستێت: "ئەم چیرۆکە مانای چیە؟ ئەم ریوایەتە سەیرە دەیەوێت چ شتێك بە من بڵێت؟" لە ڕاستیا خوێنەر لە دەرك كردنی یەکەیەکەی خاڵەکانی دادەمێنێت، ناتوانێت بڵێت چیرۆکەکە لە کوێ و کەی ڕوودەدات و یان بە چ لۆژیکێك ڕووداوەکان بەدوای یەکدا دێن، لە ڕاستیا، ڕەنگە یەکەمین پرسیاری نائومێدانەی خوێنەر ئەوە بێت کە: "ئەم چیرۆکە دەیەوێت چی بەسەر من بێنێت؟" چونکە چیرۆکەکە ناوەڕۆی ئەو واقیعە دەکات کە ئەو تێی گەیشتووەو بێ قەرارو نیگەرانی دەکات.

لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، چیرۆکەکەی کافکا ئەگەرچی هیچ گوێ بە لۆژیکی ئێمە نادات، بەڵام دەیەوێت شتێکمان لەگەڵدا بڵێت. تەنانەت لە خوێندنەوەی یەکەمدا، کە بەرەو دژوارییەکی ڕۆحیمان دەبات، دەزانین چ شتێکی بۆ وتن پێیە: شتێك شایەنی گرنگی پێدانە، شتێك پەیوەندی بەگیانی مرۆڤ و چارەنووسیەوە هەیە. لێرەیشەوە جۆری چیرۆکەکە دیاری دەکەین.

چیرۆکەکە ئەفسانە ئامێزە، ئەفسانەیەکە باس لە کۆمەڵێك ڕووداوی ناو ژیانی مرۆڤ دەکات لە هەل و مەرجێکی میتافیزیکیدا. ئەفسانە کەسانێك دروستی دەکەن کە بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە قۆناغی سەرەتایی گەشەکردنی کلتووردا دەژین، لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەگەرچی عەقڵ و زانست ئەم شێوە دەربڕینە ڕەت دەکاتەوە، بەڵام ڕووکردنە ئەفسانەو شێوەی بیرکردنەوەی ئەفسانەیی هێشتا لەناو ئەدەبیاتدا جێگای خۆی پاراستوە.

هەندێك لە ڕەگەزەکانی چیرۆکی کافکا– دەشێت دەست ئەنقەست بێت– بەشێك لە ئەفسانە کۆنەکانمان بیر دەخەنەوە. ڕاوچی ئەدونیسمان[1] وەبیردێنێتەوە، کە بەر ێکەوت لە ڕاوکردنێکدا گیانی لە دەست دا، "کەشتی مەرگ"، بەڕوونی، ئاماژەیە بەڕێ و ڕەسمی ناشتنی میسرییەکان کە بە کەشتی مینیاتوری جوان دروست کراو گۆڕەکانیان دەڕازاندەوە، چونکە وایان دەزانی کە گیان لە ڕێگا ئاوییەکانەوە سەفەر بەرەو ئەو دنیا دەکات. چارەنووسی گراکوسی ڕاوچی لەگەڵ "سندوقە دارینەکەیدا" لە چارەنووسی ئوسیریس[2]ش– قارەمانی میسری دەچێت، کە دەوترێت، خراوەتە ناو سنووقێکەوەو، دەرگاکەیان مۆرومۆم کردوەو داویانەتە دەم ڕووباری نیلەوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، لەنێوان ئەفسانەی تازەی کافکاو ئەفسانە کۆنەکاندا جیاوازی گەلێکی بەرچاوگیر هەیە، لە چیرۆکی ئەدونیسدا هەم ئەفرودەیتی[3] خوای خۆشەویستی و، هەم پیرسیفو[4]نەی خوای مەرگ، حەز لە ئەدۆنیسی گەنج و جوان دەکەن، چارەنووسی ئەویش وای هێناوە کە هەر شەش مانگ جارێك لەگەڵ یەکێك لەو دو خوایەدا بگوزەرێنێت، خەڵکی یۆنانی کۆن و ئاسیای بچووك زۆریان ئەدۆنیس دەپەرست. لە ساڵڕۆژی مەرگیا ڕۆژێکی تەواو پرسەیان بۆ دەگرت و ڕۆژی دوایی، لە ڕێو ڕەسمی زیندو بوونەوەیدا، ئاهەنگی خۆشیان دەگێڕا، مەرگی

ئەو رەمزی زستان و زیندوبوونەوەی رەمزی لە دایك بوونەوەی بەهار بوو. ئەفسانەی ئوسیریسیش باس لە زیندوبوونەوە دەكات، ئوسیریس كە هەندێك جار لەگەڵ ئەدونیسدا بەیەكی دادەنێن (لە هەندێك نووسراودا كە باس لە ئەفسانەی ئەو دەكات دەڵێت كە بەرازێكی كێوی دەیكوژێت، ئەمەیش هەمان چارەنووسە كە تووشی ئەدۆنیس دەبێت) بە هاوكاری هاوسەرەكەی ئیسیس[5] دوبارە زیندو دەبێتەوەو لە دیدی میسریەكانەوە دەچێتە وێنەی خوای مەرگ و خوای زیندو بوونەوەیشەوە، بەڵام لە ئەفسانەی كافكادا نە باس لە خوایەو نە لە خۆشەویستی و نە لە فیداكاری هاوسەر، نیشانەیەكیش بۆ زیندووبوونەوە نیە، ئەگەر ئەدۆنیس و ئوسیریس بەرجەستەیەكی ئومێدی مرۆڤبن، گراكۆسی راوچی بەرجەستەی نائومێدی مرۆڤە، ئەو هیچ كات ناتوانێت بگەڕێتەوە سەر ئەو زەویەی كە بە شادمانی ژیانی تیا بەسەر بردوە، كاتێك سەرۆكی شارەوانی لێی دەپرسێت: "كارێكتان لەو دنیا نیە؟" وەڵام بن برە– نەء. ئەو چەند هەوڵ بدات ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ.

ئەوانەی لە مێژووی ئاینەكاندا دەست بەكارن ئەدۆنیس و ئوسیریس بە پێش وێناكردنی مەسیح دادەنێن، مەسیحێك كە وەك ئەوان گیانی بەخشی و گەڕایەوە بۆ ژیان، راوچیە مردوەكەی چیرۆكەكەی كافكایش دەشێت مەسیحێكی نائومێد بێت كە ناگەڕێتەوە بۆ ژیان، نە باوكی "لە دیناكەی تردا" "پێشوازی" لێ دەكات و نە مرۆڤی ئەم دنیایش. هەموو سەرزەوی وەك "میوانخانەی شەو" ناو زەد دەكرێت و ئەمەیش ناخۆشترین وەسفی نائومێدانەی راوچیە، كە بەم بەیادهێنانەوەیەدا ناتوانین بیر لە خێزانی پیرۆز نەكەینەوە كاتێك كە سەفەریان بۆ میسر كرد نەیان هێشت بچنە میوانخانەوە، لە قسەكانی راوچیدا دەردەكەوێت كە خەڵكی دنیا بۆ هەمیشە دەستوورەكانی مەسیح دەخەنە لاوە.

"لێرە كەس گوێ لە من ناگرێت، كەس كۆمەكم ناكات، تەنانەت ئەگەر بەهەموو خەڵك بڵێن كۆمەكیم بكەن هیچ دەرگاو پەنجەرەیەكم لێ ناكرێتەوە، هەموو دەڕۆنە نێو پێخەف وەلمەلەكانیان بەسەر خۆیاندا دەكێشن. هەموو ئەو گۆی زەویە دەبێتە میوانخانەی شەو. وەنەبێت ئەمە كارێكی بێ مانایش بێت، چونكە هیچ كەسێك ئاگای لەبوونی من نیە، ئەگەر ئاگای لێ بێت جێگاكەم نازانێت، ئەگەر جێگاكەم بزانێت نازانێت چۆن هەڵس و كەوتم لەگەڵدا بكات، نازانێت بە چ شێوەیەك كۆمەكیم بكات، بیری كۆمەك كردن بە من جۆرێكە لە نەخۆشی دەبێت بۆ چارەسەركردنی لەناو جێگادا بكەوێت".

لە نێوان راوچی و مەسیحدا لێك چونێكی ناتەواو هەیە نەك بنەبڕ، ئەو ئاماژەیەی دێتە ئاراوە زۆر ئاشكرایە، بەڵام نە بەڵگەی سەلماندنە نە سەپاندن. ئێمە ئازادین وا بیربكەینەوە كە دەشێت راوچی مەسیح بێت، یان مرۆڤایەتی بێت، چاكتری بڵێین دەنگی نائومێدانەی مرۆڤایەتیە كە بە وتەی پڕ لە مەترسی راوچی، كە چیرۆكەكە بەرەو كۆتایی دەبات دەبیسترێت.

"لەوە گەڕی كە من لێرەم، نازانم، دەبێت بڵێم، پێی رۆیشتنم نیە، كەشتیەكەم ستێرنی نیەو بەو بایە دەجووڵێت كە لە قوڵایی وڵاتی مەرگەوە هەڵدەكات".

دەتوانین وایشی وێنا بكەین كە نووسەری چیرۆكەكە وای هەست كردوە چارەنووسی خۆی هەمان چارەنووسی گراكۆسی راوچیە، لە راستیا كە لەناوی راوچی، واتا گراكوسی ورد دەبێنەوە

هەست دەکەین کە ئەم بۆچوونە لە واقیعیەتی چیرۆکەکەدا نزیکترە، لە نێوان دوو کەسی ناوداری رۆحیدا کە ناوی گراکوسیان لەخۆ ناوە، واتا برایانی گراکی[6] کە داکۆکیان لە مافی هەژاران کرد دژی زۆرداران، لەگەڵ ئەوەیشدا کە لە رووداوی ناو چیرۆکەکەدا هیچ پەیوەندیەکیان پێکەوە نیە، بەڵام وشەی لاتینی گراکوسی[7] کە مانای قەلەباچکەیە، بەزمانی چیکیش، ئەو زمانەی کە کافکا دەسەڵاتی تەواوی بەسەریا دەشکێت، بە قەلەباچکە دەوترێت کافکا، قەلەباچکەیش ئەو باڵندەیەیە کە بەسەر دەرگای کۆگاکەی باوکی کافکاوە لە پراگ وێنەکرابوو، کە ئاماژەیە بۆ پیشەی بازرگانی ئەو، گەلێك جاریش کافکا خۆی بە قەلەباچکە ناو دەبرد. لەم چیرۆکەدا هیچ شتێك لەو بەلگەیە ترسناکتر نیە کە بۆ هەل و مەرجی نالەباری راوچی دەهێنرێتەوە.

"کەشتیەکەی مەرگی من رێگای ون کرد، ئێستا ستێرنی بەهەڵە سووڕاوە، یان کەشتیەوان بۆ چرکەساتێك هەستی پەرت بوە.."

بەهەرحاڵ "بەدبەختی بوو، راوچی لە وەڵامی سەرۆکی شارەوانیدا کە دەپرسێت: "ئەی تۆ خۆت بە تاوانبار نازانیت؟" تەواو پێ لەسەر وەڵامەکەی دادەگرێت: "نەخێر".

لە نەریتی جولەکە- مەسیحیدا دەربارەی دەردو ئازاری بوونی مرۆڤ و، بەخشندەیی خوا رایەك هەیە کە دەوترێت ئازاری مرۆڤ ئەنجامی حەتمی گوناهەکانیەتی، بەڵام راوچی کە سەرۆکی شارەوانی دەربارەی چارەنووسی لێی دەپرسێت، ئەو وەڵامی دەداتەوە کە ئازاریئەو پەیوەندی بەو کارانەیەوە نیە کە کردوویەتی، کەشتی مەرگ لە ئەنجامی هەڵەی کەشتیەوانەکەوەیە رێگای ون کردوە، دیارە چ بەلگەیەکمان لە دەستا نیە کە بۆ دەبێت بڕوا بە راوچی بکەین، لەگەڵ ئەوەیشدا، تەواوی باوەڕی پێ دەکەین.

راوچی قسەیەك ناکات و چیرۆکەکەیش ئاماژە بە شتێك ناکات کەبوونی لاهوت رەت بکاتەوە، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە، راوچی باسی کارەکانی دەکات کە "بەرەکەت"یان تیا بوە، ئەو بە رستەی "پلیکانەی فراوان و زۆرپان" و دەروازەی درەخشاوەی "دیناکەی دی" ئاماژە دەکات. ئاماژە بۆ جێگایەك دەکات کە بە رواڵەت شوێنی خواپەرستانە، مۆمێك کە بەسەر سەری راوچیەوەیە، مۆمی (دوا شێوی مەسیح)ەو ژیانی خەڵکی شار بۆ سازدانی رێ و رەسمێکی زۆر پێویست رێك خراوە، لەگەڵ ئەمانەشدا، ئەگەر کافکا دەست بۆ وێنەی ژیان لە بواری لاهوتدا ببات، ئەوا ئەم لاهوتە هەمان ئەم لاهوتە نیە کە پەرستگای ئاینە ئاشناکانەو لە نێوان ئەو و مرۆڤدا، بە رواڵەت، پەیوەندیەکی زۆر کەم هەیە.

بە راستی، بڕوابوون بە لاهوت هیچ ئومێدو تاسەیەك لە دڵی مرۆڤدا زیندو ناکاتەوە، ژیان لە بەندەرێکی بچووکدا، لەگەڵ ئەوەیشدا کە چالاکیەکانی ژیانی ئاسایی مرۆڤی لەخۆ گرتوە، وا دایارە پڕبێت لە بێ هودەییەکی ترسناك، کارەکانی خەڵکی، کە هەر لە سەرەتای چیرۆکەکەوە وێنەی کراوە، لە خەو دەچن، ئەو کوڕانەی یاری زارزارێن دەکەن. پیاوێك کە رۆژنامە دەخوێنێتەوە، کچێك کە سەتڵەکەی لەکانی پڕ دەکات، ئەو پیاوانەی کە لە کافیتریاکە شەراب دەخۆنەوە، هەموو ئەمانە وا دێنە بەرچاو کە، لە پووچی ژیان و پەیکەرە یادمانیەکاندا هاوبەشن، کاتێك کە کەشتی مەرگ لە رێوە دەگات، هەموو ئەو کارانەی کە پەیوەندیان بە رێو رەسمی پێشوازیەوە هەیە بە وردی ئەنجام

دەدرێن، تەنانەت کۆترەکانیش دەوری خۆیان دەزانن و "پەنجا کورپێژگەیش کەم تا زۆر دەزانن کە دەبێت لە پاڵ یەکدا کۆوەبن و دوو ریز ببەستن تا سەرۆکی شارەوانی بە نێوانیاندا تێپەڕێت". لەگەڵ ئەوەیشدا بێجگە لە کوڕێک کە "لەو کاتەدا پەنجەرەیەکی کردەوە تا ئەو کەسانە ببینێت کە لەناو خانوەکەدا دیار نەدەمان، پاشان بە پەلە پەنجەرەکەی داخست" هیچ کەسێکی تر، لە ئەنجامی بەڕێ کردنی ڕێورەسمەکەدا تووشی هەژانێک نەهاتن، لێرەدا هەست دەکەین کە خەڵکی شارەکە هێند لە موسافیرەکەی کەشتیی مەرگ زیندووتر نین، تەنانەت ئەو لەوان زیاتر نیگەرانە، هەرچیەک بێت راوچیەکی بەناوبانگ بووەو تامی خۆشی چێشتووەو ئێستا بە ریشی نەتاشراوو، قژی ئاڵۆزو، کفنێکی چڵکنەوە لێی راکشاوە، وەسفی داپۆشینی راوچی بە "شاڵێکی گەورەی گوڵداری گوڵنکەدار" بۆ پێگەی راوچی وەسفێکی قێزەون و نامۆیە، لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا پێگەی ئەو لە دیدی چەندایەتیەوە، لەگەڵ پێگەی خەڵکی شاردا جیاوازە نەك لە رووی چۆنایەتیەوە.

ڕووداوەکانی چیرۆکی کافکا سەیرو دوور لە رەوشی کاری ئاسایین، لەگەڵ ئەوەیشدا، ئێمە تەنیا لەبەر ئەم بەڵگەیە ناتوانین بە چیرۆکی خەیاڵ پەروەری ناوی بەرین، وتەی "خەیاڵ پەروەی" شتێکی نامۆو ئازادمان بیردێنێتەوە، ئازادی زەین لە کۆتی لۆژیك و واقیعیەت، لە کاتێکدا کە ئەم چیرۆکە لە سەرویەندی ئەوەدایە ئێمە هەست بەوە بکەین کە: بە ناچاری، بووینەتە دیلی زیندانی کاری دزێو و چارەسەرنەکرواەکان.

بەڵام ئەگەر جارێك هەستی بە تاڵی و بێمانایی ژیانمان تاقی کردبێتەوە، ئەگەر جارێك هەستمان کردبێت کە رەفتاری ئێمە جەبریەو پەیوەندی بە خۆمانەوە نیەو، ویستی ئێمە لە ئیختیاری خۆمان بەدەرە، یان لانی کەم ئیدی هیچ شتێکمان لەدەست نایەت و ئازارکێشین، ئەگەر هەستمان بە مانە کرد ئەوسا بەرانبەر خەیاڵی ترسناکی کافکا لە وجودی مرۆڤ بە دژواری دەتوانین خۆمان بگرین.

**پەراوێز:**

1- *Adonis*
2- *Osiris*
3- *Aphro dait*
4- *Persephone*
5- *Lsis*
6- *Gracchi*
7- *Gracalas*

**سەرچاوە:**

داستان و نقد داستان– بەرگ چوارەم
گۆڕین و ئامادەکردنی" ئەحمەدی گوڵشیری

## پــۆزش

لە ژمارەی پێشووی (سەردەم)دا بابەتێك بە ناوی (بەرپرسایەتی نووسەر)ەوە بڵاوبۆتەوە، ئەو سەرچاوەیەی لێوەی کراوە بە کوردی لەسەرەتای بابەتەکەدا ئاماژەی بۆ کراوەو ئەو سەرچاوەیەی کە لە کۆتایی بابەتەکەدا هەیە بەهەڵە هاتووە، بۆیە داوای لێبوردن لە خوێنەران و لەوەرگێڕی بابەتەکە دەکەین.

**سەردەم**

# گفتوگۆ

لەگەڵ ڕۆماننووسی کۆلۆمبیایی

(گابریل گارسیا مارکیز)دا

# وتووێژێك لەگەڵ گابریل گارسیا ماركیزدا

• و. لە فارسییەوە: سەلاح ئەمانی

گابریل گارسیا ماركیز ساڵی **1928** لە شارۆچكەی ئاركاتاكا (***Arcataca***) ی كولومبیا لە دایك بوو. ماكوندۆ، كە چواردەورەكەی مەزرای مۆزەو دولجار بوو بە شوێنی سەدساڵ تەنیایی، سەر بەو شارۆچكەیەیە. گارسیا ماركیز زۆرترین كاتەكانی دەورانی منداڵی خۆی لەگەڵ نەنك و باپیری بەسەر برد. بە شوور و شەوقێكی زۆرەوە ئەوانی حەقایەت خوانی جادوویی ناو نابوو و بۆ زۆربەی رۆمان و كورتە چیرۆكەكانی چێژی لەوان وەرگرتبوو. هەرچەند لە سەرەتاوە شیعرو عیرفان كاریان كردۆتە سەر شتەكانی بەڵام ئەودەم نووسراوەكانی بەشێوەی گوزارش بوون كە لە رۆژنامەی ئێل سپێكتادۆر (***El Spectador***) چاپ كراوە، رۆژنامەیەك كە خۆی رەخنەگری فیلم و گوزارشتەكانی بوو. هەروەها چەند ساڵێكیش لەنێوان ساڵەكانی **1950** هەتا **1959** لە رۆم و پاریس وەكو هەواڵنێری دەرەوە دەست بەكار بوو.

لە سەرەتاوە گابریل گارسیا ماركیز چیرۆكەكانی ئەوكاتانە دەنوسی كە شەوانە ئیتر رۆژنامەنووسەكان دەرۆیشتنەوە ماڵێ. بەڵام دوای تێپەڕبوونی ساڵانێك و پاش ئەوەی كە چەند هاورێییەكی هانیان دا چاپ كرا. ئەورۆكە بەرهەمەكانی وەرگێڕاوەتە سەر زیاتر لە بیست زمانی زیندووی دنیا كە بریتین لە: زریانی گەڵا (***1955***)، كەس بۆ سەرهەنگ نامە نانووسێ (***1961***)، سەعاتی شوو ; (***1962***)، كە خەڵاتی ئەدەبی كولومبیای پێ بەخشرا. بەڵام تەنیا لە ساڵی **1967**دا بوو كە بە بڵاوكردنەوەی "سەدساڵ تەنیایی"، كتێبێك كە ساڵیانێك لە هەوڵی نووسینیدا بوو، لە سەرتاسەری دنیا ناو و ناوبانگی دەركرد. كتێبەكە لەرێوە بە شاكارێكی گەورە دانراو ساڵی **1969** خەڵاتی باشترین كتێبی خارجی ئەكادیمیی فەرانسەی پێ بەخشرا. لە ساڵی **1975** دا"پاییزی باوك سالاری، درێژەی

لێکۆڵینەوەی چیرۆکی تەنیاییو پێوەندی لە دەسەڵاتەوە، وەکو رۆمانەکەی پێشوو لەگەڵ تاریف و دەست خۆشیەکی زۆر بەرەو روو بوو، رۆمانی "راپۆرتی مەرگێك لە پێش دا راگەیەنراو" ساڵی *1981* بڵاوبۆوە. گۆڤاری ئێل پایس (*El Pais*)ی چاپی ئیسپانیا، چاپی ئەو دوو رۆمانەی بە رووداوێکی گەورە لە ئەدەبیاتی زمانی ئیسپانیا دانا.

گ. گ. مارکیز ساڵی *1961*، بێجگە لەوەی ماوەیەکی کورت لە بارشیلۆن ماوە، دەنا لە مەکسیکۆ دەژیا. زیاتر لە بیست ساڵە کە لەگەڵ یاری دەورانی منداڵی خۆی، مێرسێدێس، (*Mercedes*) زەماوەندی کردووە دوو کوڕیشی هەیە بەناوەکانی روودریگۆ (*Rodrigo*)، کە لە زانکۆی هارفارد دەرس دەخوێنێو گوونسالۆ (*Gonsalov*) کە کەڕەنا ژەنەو لە پاریس دەرس دەخوێنێ.

ئەو وتووێژە، لە دیوی کارەکەی، لەگەڵ گابریل گارسیا مارکیز کرا، کە رێك لە پشت ماڵەکەی لە سان ئانخیل (*San Anjel*)، شوێنێکی قەدیمی و جوانی لێیە کە پڕە لە گوڵی رەنگاورەنگی مەکسیکی جوان کە ئینسان حەزدەکا چاویان لێکا. دیوی کارەکەی کە لە ماڵەکەیەوە زۆر دوور نیە، ساختومانێکی نەویو دوورو درێژەو دادەنوێنێ کە تایبەتی بۆ پێشوازی ساز کراوە. لایەکی دیوەکە قەنەفەیەك و دوو مۆبل و بوخچەیەك -کە سەهۆڵدانێکی سپی چکۆلە کە برێك ئاو مەعدەنی لەسەرە لێ دانراوە.

سەرنج راکێشترین شتی ئەو دیوە وێنەیەکی گەورەی گارسیا مارکیزە کە لەسەر قەنەفەکەوە هەڵواسراوەو پاڵتۆیەکی خستۆتە سەرشانیو با لێی دەدا. وێنەکە نەختێك وەك ئانتونی کوین دەچێ.

گارسیا مارکیز، لە ئاخری دیوەکە لەسەر مێزێك دانیشتبوو لە سەرخۆییو سەری حاڵی بەرەو پیرم هات،. پیاوێکی بە شان و باهۆیەکە. باڵای میترێك و حەفتاو پێنج سانتیمیترە. وەکو بۆکسۆرێکی مام ناوەندی دەهاتە پێش چاو. چوارشانەیە بەڵام لاقی نەختێك باریك دیاری دەدا. شاڵوارێکی مەخمەری بۆرو چاکەتێکی گەرمی یەخەدارو هەروەها جوتێك پۆتینی مەیلەو رەشی لەپێدابوو. قژێکی لوول و رەنگ خورماییو سمێڵێکی زل و بابری بوو.

وتووێژەکە هەموو رۆژێ لای ئێوارێ کە دوو سەعاتێکی دەخایاند لە ماوەی سێ رۆژدا تەواو بوو. هەرچەند گارسیا مارکیز زمانی ئینگلیزی بە باشی دەزانی زیاتر بە زمانی ئیسپانیایی دەدوا و دوو کوڕە حەڤدەو هەژدە ساڵەکەی کە لە مەدرەسەی ئینگلیزی زمانەکانی مەکسیکۆ و ئیسپانیا دەرسیان خوێندوە، بوونە دیلمانجی ئەو وتووێژە.

کاتێك کە قسە دەکا خۆی رادەژێنێ. دەستیشی زۆربەی کاتەکان دەجووڵێنێو بە ئاماژە کردنی کورت و سووربوون لەسەر مەسەلەیەك بە دەستی تەئکید دەکا یان ئەوەی کە گۆڕینی بیروراکەی نیشان دەدا. کاتێ بیرمەندانە قسە دەکا یان خۆی بەلای بیسەرەکەیدا خوارکردۆتەوە یان لاقی لەسەر لاقی داناوەو خۆی تەواو کێشاوەتە دواوە.

* * *

### پیتر هـ. ئێستۆن (Peter H. stone): ئێوانت لەگەڵ ریکۆردەردا چۆنە؟

گابریل گارسیا مارکیز (Gabriel Garcia Marqeuez): مەسەلەکە ئەوەیە هەرکە ئاگادار دەبی خەریکن وتوویژەکەت زەفت دەکەن، بۆچوونت دەگۆڕێ. ئەگەر لە من دەپرسن زوو دەکەومە حاڵەتی پشتیوانی لەخۆ. من وەکو رۆژنامەگەرێك هەست دەکەم کە ئێستاش فێر نەبووین بۆ وتوویژ کەڵك لە زەفت وەرگرین. پێم وایە باشترین شێوە بۆ وتوویژ ئەوەیە کە پێکەوە تێروتەسەل قسەبکەین بێئەوەی ئەو کەسەی وتوویژت لەگەڵ دەکا قسەکانت یادداشت کا پاشان لە هەلێك دا وتوویژەکە وەبیر خۆی بێنێتەوەو ئەو شتانەی کە هەستی پێ‌کردوە لەسەر کاغەز بینووسێ. پێویست ناکا دانە بەدانەی وشەکان بنووسێتەوە. شێوەیەکی تر کە بەهرەی زیاترە ئەوەیە کە ئەو کەسەی وتوویژت لەگەڵ دەکا چەند یاداشتێك لە قسەکانت هەڵگرێو پاشان بەجۆرێك وەفاداری سەبارەت بە وتوویژەکە دەست بکا بە شیکردنەوەی قسەکانی. هەڵە بوونی تۆمارکردنی تەواوی وتوویژەکە لەوەدایە کە تۆمارەکە سەبارەت بەو کەسەی کە وتوویژی لەگەڵ دەکری وەفادار نیە چونکە کاتێك کە ئەو لە شوێنێك تووشی ئارۆزیان سەرلێشێواوی دەبێ، ریکۆردەرەکە هەمووی دەخاتە خاتریەوە. هەربۆیە کاتێك کە ریکۆردەرم لە لا دادەنێن پەیتا پەیتا لەبیری ئەوەدام کە خەریکم وتوویژ دەکەم؛ بەڵام لە حاڵێك دا ئەگەر زەفت و مەفت لە گۆڕیدا نەبێ بەخاترجەمی و زۆر ئاسایی قسە دەکەم.

### کەوایە هەست دەکەم لەوبارەیەوە تاوانبارم بەڵام پێم وایە بۆ ئەو جۆرە وتوویژانە پێویستە.

بەهەر حاڵ مەبەستم لە قسەکانم ئەوە بوو کە بتانخەمە حاڵەتێکی پشتیوانی لەخۆ.

### دەتانەوێ بڵێن کە لەو وتوویژەدا قەت کەڵکتان لە زەفت وەرنەگرتووە؟

وەك رۆژنامەگەرێك قەت کەڵکی لێ وەرناگرم. من زەفتێکی زۆر چاکم هەیە بەڵام تەنیا بۆ گوێ گرتن لە مۆسیقا کەڵکی لێ وەردەگرم. ئەوەش بڵێم کە وەك رۆژنامەگەرێك قەت وتوویژم لەگەڵ کەس نەکردووە. گوزارشم ئامادە کردووە بەڵام وتوویژێکم نەکردووە کە پرسیارو وەڵامی تێدابێ.

### بیستوومە لەگەڵ مەلەوانی کەشتیەکی نوقم بوو وتوویژێکی گەرم و گوڕت بووە.

پرسیار و وەڵامێك لە گۆڕیدا نەبوو. مەلەوانەکە تەنیا بەسەرهات و رووداوەکانی خۆی بۆ دەگێڕامەوەو منیش یاداشتم دەکردو هەوڵم دەدا قسەکانی بەشێوەی "یەکەم کەسی تاك" بێنم؛ دەتگوت ئەو بۆخۆی نووسەری رووداوەکەیە. کاتێك کە نووسراوەکە دوابەدوای یەك لە رۆژنامە بڵاوبۆوە لە ماوەی دوو حەوتوودا، هەموو رۆژێ، دەچوە بەردەستی خوێنەران و هەروەها ئیمزای مەلەوانەکەی پێوەبوو نەك ئیمزای من. تەنیا پاش تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر ئەو رووداوەدا بوو کە یەکجێ هەمووی بڵاوبۆوەو خەڵك زانیان کە من نووسیومە. هەتا "سەدساڵ تەنیایی" بڵاونەبووە، هیچ بڵاوکەرەوەیەك نەیزانی کە نووسراوەیەکی بە بایەخ و جێی سەرنجە.

* * *

***به بڕوای ئێوه ڕۆمان دەتوانێ کاری وا بکا که له توانای ڕۆژنامەگەریدا نیه؟***

نەخێر، پێم وا نەبێ لە نێوان ئەو دوانەدا جیاوازیەك هەبێ. سەرچاوەیەکە، پێداویستیو کەرەسەو زمانیش هەریەکە. "گوزارشنامەی ساڵی تاعوون" نووسینی دانیال دیفۆی (*Danial Defoe*)، ڕۆمانێکی گەورەو هیرۆشیماش نووسینی جان هێرسێی (*John Hersey*) بەرهەمێکی گوزارشی گەورەیە.

***ئایا ڕۆژنامەگەرو ڕۆمان نووس له هەڵسەنگاندنی "ڕاستی و خەیاڵ" ئەرکی جیاوازیان هەیە؟***

لە ڕۆژنامەگەریدا تەنیا ئەوە بەسە کە ڕووداوێکی درۆ لە بەرهەمەکەت دا بگونجێنی هەتا تەواوی بەرهەمەکەت بێ بایەخ بێو کەڵکی نەمێنێ. لە بەرامبەر ئەوەدا، لە چیرۆك دا، گونجاندنی ڕووداوێکی ڕاست سەرجەم بەرهەمەکەت بە بایەخ و جێی سەرنج دەکا. ئەوە تەنیا جیاوازیەکەو ئەو کارەش لە ئەستۆی نووسەرەو پێوەندی بە خۆیەوەیەتی.

*         *         *

***چۆن دەستت کرد بە نووسین؟***

بە نەقاشی، نەقاشی کارتۆن. پێش ئەوەی فێری نووسین و خوێندنەوە بم لە ماڵێ و لە مەدرەسە شکل و شێوەی پێکەنینیم دەکێشاوە. خۆشیەکەی لەوەدایە ئێستا کە بیری لێ دەکەمەوە دەزانم کاتێ لە دواناوەندی دەرسم دەخوێند منیان وەك نووسەرێك دەناسی هەرچەند لە ڕاستیدا شتێکم نەدەنووسی. ئەگەر بیان ویستایە داخوازیەك یان بەشێك لە کتێبێکیان نووسیبایە دەیان خستە ئەستۆی من چونکە وایان دەزانی من نووسەرم. کاتێك کە چوومە زانکۆ بە هەڵکەوت زانیم کە بونیەی ئەدەبیم بەهێزەو لە هەموو هاوڕێکانم باشترم. لە زانکۆی بۆگۆتا هاوڕێ و ئاشنای تازەم گرت کە منیان بە نووسەرەکانی ئەو سەردەمە ناساند. شەوێکیان یەکێك لە هاوڕێکانم کۆمەڵە چیرۆکێکی فرانتس کافکای بە ئەمانەت دامێ ڕۆیشتمەوە بۆ پانسیۆنی شوێنی مانەوەم و دەستم کرد بە خوێندنەوەی چیرۆکی "مەسخ"**. یەکەم دێڕم کە خوێندەوە شتێکی نەمابوو لەسەر قەرەوێڵەکەوە بەربمەوە. سەرم سوڕما. یەکەم دێڕ ئەوە بوو: *"کاتێك کە گریگۆر سامسا (Gregor Samsa) لە خەونی ناخۆشی بێ ئۆقرەی خۆی هاتە دەرێ زانی کە بووە بە جانەوەرێکی زل و زەبەلاح"*. ئەو دێڕەم کە خوێندەوە لە فکری خۆم دا وتم کە کەسێك ناناسم بەو شێوەیە بنووسێ. ئەگەر بمانسیبایە زۆر لەمێژ بوو دەستم کردبوو بە نووسین. زۆر زوو دەستم کرد بە نووسینی کورتە چیرۆك. تەواوی ئەو چیرۆکانەی کە نووسیومن ڕووناکبیرانەن چونکە بەپێی ئەزموونی ئەدەبیم نووسراون هێشتا پێوەندیم لە نێوان ئەدەبیات و ژیان دا نەدۆزیبۆوە. چیرۆکەکان لە پاشکۆی ئەدەبی ڕۆژنامەی ئێل ئێسپێکتادۆر، لە بۆگۆتا، چاپ دەکراو ئەوکاتەش سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا؛ پێم وابێ هۆیەکەشی ئەوە بوو کە کەس لە کۆلۆمبیا چیرۆکی ڕووناکبیرانەی نەدەنووسی. ئەو سەردەمە ئەو شتانەی کە دەنووسران تەنیا لە بارەی ژیانی دێهات و کۆمەڵگاوە بوون. کاتێك کە چیرۆکەکانم نووسی پێیان وتم کە لە ژێر کاریگەری جۆیس دا نووسیومن.

### ئەوکات بەرهەمەکانی جۆیست خوێندبۆوە؟

نەمخوێندبۆوە. هەر بۆیە دەستم کرد بە خوێندنەوەی یولیسس (*Ulysses*). تەنیا نووسخەیەکی ئیسپانیایی کە هەبوو و پاش ماوەیەکی زۆر، دوای ئەوەی کە یولیسسم بە زمانی ئینگلیزی و هەروەها زمانی فەرانسە کە زۆر باش وەرگێڕابوو، خوێندەوە، زانیم کە بە راستی خراپ وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئیسپانیایی. شتێك کە فێری بووم، شتێك کە لە داهاتوودا لە بواری نووسین دا یارمەتی کردم، رەوشتی (*Techique*) وتووێژی دەروونی بوو. پاش ماوەیەکی تر ئەو شتەم لە بەرهەمەکانی ویرجینیا وولف دا بینیو شێوەی ئەوم لەو کارەدا زیاتر لە شێوەی جۆیس بە دڵ بوو. هەرچەندە پاش ماوەیەکی دیکە زانیم کە داهێنەری وتووێژی دەروونی نووسەری بێ ناوونیشانی گۆچان کێشی تورمس (*Lazarillo de Tormes*)ی بووە.

### چێژت لە چ کەسانێك وەرگرتووە؟

ئەو کەسانەی کە بە راستی یارمەتیان دام تا لە دەست بۆچوونی ڕووناکبیرانە سەبارەت بە کورتە چیرۆك رزگارم بێ، نووسەرانی فەسڵی بێ ناو و نیشانی ئەمریکا بوون. تێگەیشتم کە ئەدەبیاتی ئەوان لەگەڵ ژیان پێوەندییەکانیان هەیە کە کورتە چیرۆکەکانی من لێیان بێ بەشن: پاشان ڕووداوێکم بۆ هاتە پێش کە سەبارەت بە ئەو شێوە بۆچوونە زۆر بە بایەخ بوو. لە نۆی ئاپریلی ساڵی *1948*، گیتان (*Gaitan*)، یەکێك لە ڕێبەرە سیاسییەکان بە فیشەك کوژراو خەڵکی بۆگوتا وەك شێت ڕژانە سەر شەقامەکان. من لە پانسیونی شوێنی مانەوەم خەریکی خواردنی نانی نیوەڕۆ بووم کە ئەم هەواڵەم بیست. بە پەلەپرووزە چووم بۆ شوێنی ڕووداوەکە بەڵام گیتانیان خستبۆوە ناو تاکسیەك و دەیانبرد بۆ خەستەخانە. لەکاتی گەڕانەوەم بۆ پانسیون چاوم بە ئاپۆرەی خەڵك کەوت کە لەسەر شەقامەکان خۆپیشاندانیان وەڕێ خستبوو، دووکانەکانیان تاڵان دەکردو ساختومانەکانیان ئاور دەدا. خۆم گەیاندە ئەوان. بۆ دوانیوەڕۆو شەوی ئەو ڕۆژە بوو کە تێگەیشتم لە چ وڵاتێك دا دەژیم. کورتە چیرۆکەکانم بچووکترین پێوەندیان بەوانەوە نیە. دواجار کە ناچار گەڕامەوە بۆ باڕانکیێلا (*Barranguilla*) لە دووروگەی کارائیب، کە دەورانی منداڵیم لەوێ بردبوە سەر، تێگەیشتم کە ئەو جۆرە ژیانم بەسەر براوەو هەستم کرد کە مەیلم هەیە شتی لە بارەوە بنووسم.

دەورووبەری ساڵەکانی *1950* و *1951* ڕووداوێکی تر کاریگەری کردە سەر مەیل و بۆچوونی ئەدەبیم. دایکم داوای لێکردم کە لەگەڵی بچم بۆ ئارکاتا، شوێنی لە دایك بوونم و ئەو ماڵەی کە ساڵەکانی سەرەتای ژیانم لەوێ بردبوە سەر، بفرۆشین. کاتێك گەیشتمە ئەوێ حەپەسام، چونکە بیست و دوو ساڵی تەمەنم بەسەرچوو بوو و لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە تا ئەوکات چاوم بەوێ نەکەوتبوو. لە راستیدا هیچ شتێك نەگۆڕابوو؛ هەستم دەکرد چاو لە ئاواییەکە ناکەم بەڵکو دەتگوت کتێبێکی کراوە دەخوێنمەوە. دەتگوت ئەو شتەی کە دەم دی پێشتر نووسرابوو، تەنیا کارێك کە کردم ئەوەبوو کە دانیشتم و ئەو شتانەی کە پێشتر وجودیان بوو و هەروەها هەر شتێك کە دەمخوێندەوە یادداشتم لێ هەڵدەگرت. هەمووی ئەو شتانە دەستیان دابووە دەستی یەك هەتا ئەو خانووبەرانە، خەڵك و بیرەوەرییەکانم بێتە ناو

ئەدەبیاتەوە. جوان لەبیرم نیە کە ئەوکات بەرهەمەکانی فاکنێرم خوێندبۆوە یان نا، بەڵام ئێستا دەزانم کە تەنیا ڕەوشتێك (**technique**) لە چەشنی ڕەوشتی فاکنێرم بوو کە توانایی پێ دابووم هەرشتێك کە دەیبینم، بینووسمەوە. حاڵ و هەوا (فەزا)، لەنێوچوون و گەرمای ئاواییەکە تەقریبەن هەر ئەو جۆرە بوون کە لە بەرهەمەکانی فاکنێر هەستم پێ کردبوو. ئەو ناوچەیە مەزرایەکی مۆز بوو کە بڕێکی زۆر لە ئامریکاییەکانی سەر بە کۆمپانیای میوە لەوێ دەژیان و حاڵ و هەوایەکی تایبەتیان پێ دابوو کە لە بەرهەمی نووسەرەکانی "باشووریترین شوێنی ئامریکا" دیبووم. ڕەخنەگران قسەیان لەسەر کاریگەری ئەدەبی فاکنێر لەسەر بەرهەمەکانی من کردووە، بەڵام من پێم وایە ئەو کاریگەریە جگە لە هەڵکەوت هیچ شتێکی تر نەبووە. من، هەر ئەوەندە، کەرەسەی لە جۆری کەرەسەی فاکنێرم دۆزیبۆوە هەتا دەست بدەمە کارێك کە پێشتر فاکنێر کردبووی.

پاش ئەوەی لەو سەفەرە گەڕامەوە، یەکەم ڕۆمانی خۆمم بەناوی "تۆفانی گەڵا" نووسی. ئەو شتەی کە بە ڕاستی لە سەفەری ئارکاتادا بۆم دەرکەوت ئەوە بوو کە تێگەیشتم تەواوی شتەکانی دەورانی منداڵی من بایەخی ئەدەبیان بووە. لەو کاتەوە کە تۆفانی گەڵام تەواوکرد زانیم کە دەمەوێ نووسەر بم؛ کە هیچ کەسیش ناتوانێ پێش بەوکارەی من بگرێ؛ ئەویش تەنیا کارێك کە دەبێ بیکەم ئەوەیە هەوڵ بدەم ببمە باشترین نووسەری دنیا. ئەو باسە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی **1953** بەڵام تەنیا ساڵی **1967** بوو کە پاش نووسینی پێنج کتێب لەو هەشت کتێبەم، مافی نووسینیان (حقّ التألیف) پێدام.

***بەبڕوای ئێوە ئەوە شتێکی ئاساییە کە نووسەرە لاوەکان بایەخێك بۆ دەورانی منداڵی و ئەزموونەکانیان دانانێن و لەسەرەتاوە وەکو ڕووناکبیرێك شت دەنووسن؟***

نەخێر، زۆرجار شێوەی کار بە پێچەوانەیە. بەڵام ئەگەر قەرار بوایە سفارشم لە نووسەرێکی لاو بکردایە دەموت لە بارەی شتێکەوە بنووسێ کە بە سەرخۆی هاتووە، هەمیشە زۆر بە هاسانی دەتوانی تێبگەی کە نووسەرێك لە بارەی شتێکەوە دەنووسێ کە بەسەرخۆی هاتوە یان خوێندوویەتەوە یان بیستوویەتی. پابلۆ نرۆد لە یەکێك لە هەڵبەستەکانیدا دەڵێ: *"خودا یارمەتیم بکا هەتا لەکاتی دانانی شیعردا شتێك ساختە نەکەم"*. ئەو شتەی کە لێرەدا دەبێتە هۆی خۆشحاڵی و سەرگەرمی من ئەوەیە کە بەرهەمەکانم زیاتر بە خاتری خەیاڵی بوونیان تاریفیان لێوە دەکرێ، لە حاڵێکدا کە ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە کە لە نێو بەرهەمەکانی مندا دێڕێك بەرچاو ناکەوێ کە ڕیشەی لە ڕاستیەکاندا نەبێ. مەسەلەکە ئەوەیە کە ڕاستی ڕووداوەکانی دوورگەکانی کارائیب لەگەڵ سەیرو سەمەرەو غەریب ترین خەیاڵەکاندا دێتەوە.

***ئەو سەردەم بۆ چ کەسانێکتان دەنووسی؟ خوێنەرەکانتان چ کەسانێك بوون؟***

تۆفانی گەڵام بۆ هاوڕێکانم نووسی کە یارمەتیان دەکردم و کتێبەکانیان بە ئەمانەت پێدەدام و بە ئاواتی خوێندنەوەی بەرهەمەکانم بوون. کاتێك کە دەنووسم هەمیشە و دایم وریام کە ئەو هاوڕێیەم خۆشی لەو بەشە دێ و ئەو هاوڕێیەی دیکەم تام و چێژ لە وشەی دیکە وەردەگرێ. ئاخرێکەی بۆم دەردەکەوێ کە

هەموو کتێبەکانم بۆ هاوڕێکانم نووسیوە. تەنگوچەڵەمەو دژوارییەك کە پاش نووسینی "سەدساڵ تەنیایی" هاتۆتە سەر ڕێم ئەوەیە کە نازانم بۆ کام یەك لەو ملیۆن خوێنەرە دەنووسم؛ ئەو مەسەلەیە تۆقرەی لێهەلگرتووم و پەکی کارم دەخا. دەڵێی یەك ملیۆن کەس چاویان تێبڕیوەو بە ڕاستی ئینسان نازانێ کە ئەوانە بیر لەچی دەکەنەوە.

### رۆژنامەگەری چ کاریگەرییەکی کردۆتە سەر چیرۆکەکانت؟

بە بڕوای من کاریگەرییەکە دوولایەنە بووە. چیرۆك بارمەتی رۆژنامەگەری منی داوە چونکە بایەخی ئەدەبی پێداوە. رۆژنامەگەریش زۆر یارمەتی چیرۆکەکانی منی داوە چونکە منی لە پێوەندی نزیك لەگەڵ راستیەکاندا ڕاگرتووە.

### پاش نووسینی تۆفانی گەڵاو پێش ئەوەی کە دەست بکەن بە نووسینی سەدساڵ تەنیایی، لە پێناو دۆزینەوەی شێوەو رەوشتێکی تایبەت چ کارێکتان کرد؟

پاش ئەوەی تۆفانی گەڵام نووسی بەوە گەیشتم کە نووسین لە بارەی دێهات و دەورانی منداڵی لە ڕاستیدا خۆشاردنەوەیە کە لە ڕووبەڕووبوونەوەو نووسین لە بارەی ڕاستی ڕووداو سیاسییەکانی وڵاتە. بەهەڵە وام بیر دەکردەوە کە خۆم لەناو ئەو جۆرە دڵتەنگیە بۆ دەورانی منداڵی و شوێنی لە دایك بوونم دەشارمەوە هەتا لەگەڵ مەسەلەو ڕووداوەکانی دەوروبەرم بەرەو ڕوو نەبم. ئەوە ڕاست لەو سەردەمەدا بوو کە زۆر باسی پێوەندی نێوان ئەدەبیات و سیاسەت دەکرا. من هەوڵم دا کەلێنی نێوان ئەو دووانە پڕکەمەوە؛ لای فاکنێرم بەرداو لای هەمەنگوایم گرت. "کەس بۆ سەرهەنگ نامە نانووسێ"، "سەعاتێکی شووم" و "سەرەخۆشی دایە گەورە"م نووسی کە تەقریبەن هەموویانم لە سەردەمانێك دا نووسی و لایەنی هاوبەشیان زۆرە. شوێنی ئەو ڕۆمانانە ئاواییەکی تر جیا لە شوێنی ڕۆمانی تۆفانی گەڵاو سەدساڵ تەنیایی. لەو ئاواییە هیچ خەبەرێك جادوو نیە. ئەو ئەدەبیاتە دەبێ بە ئەدەبیاتێکی گوزارشی دابنێ. بەڵام کاتێك کە سەعاتێکی شوومم تەواو کرد تێگەیشتم کە بۆ جارێکی تر تەواوی بۆچوونەکانم بەهەڵەدا چووە. بەو نەتیجەیە گەیشتم کە نووسراوەکانم لە بارەی دەورانی منداڵی زۆرتر سیاسی بوون و زیاتر لەوەی کە بیرم کردبۆوە راستی ڕووداوە سیاسیەکانی وڵاتەکەم دەخاتەڕوو. پاش نووسینی سەعاتێکی شووم بۆ ماوەی پێنج ساڵ دەستم بۆ قەڵەم نەبرد. بیرێك لە زەینمدا دایمە کەڵکەڵەی دەدام و تینی بۆ دێنام، بەڵام هەرچەندم کرد تێنەدەگەیشتم. شتێك کە چەندو چۆنەکەیم بە باشی نەدەزانی هەتا ئەوەی کە ڕۆژێك شێوەیەکی (لحن) باشم کەشف کرد؛ شێوەیەك کە ئاخریەکەی لەسەد ساڵ تەنیایی دا بەکارم برد. ئەو شێوەیە وەکو حەقایەت خوانی دایە گەورەم وابوو. ئەو شتانەی کە ئەو دەیگێڕانەوە ما بعد الطبیعي و خەیاڵی دەهاتنە بەر نەزەر بەڵام زۆر ئاسایی دەیگێڕانەوە. کاتێك کە ئاخریەکەی شێوەیەك کە دەبوو بەکاری بەرم کەشفم کرد، هەژدە مانگ دوابەدوای یەك کارم کرد.

***دایە گەورەت چۆن ئەو شتە خەیاڵیانەی تا ئەو رادەیە ئاسایی دەگێڕایەوە؟***

شتێك کە جێی سەرنج بوو حاڵەتێك بوو کە لە رووخساریدا دەخوێنراوە. لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانیدا شێوەو حاڵەتی قسەکردنی نەدەگۆڕاو هەمووومان سەرمان سوور دەما. لە سەرەتای نووسینی "سەد ساڵ تەنیایی" دا هەوڵم دەدا بۆ ئەوەی کە خۆم بڕوام بە چیرۆکەکە بێ بینووسم. دوایی بۆم دەرکەوت کە دەبێ بڕوام پێیان هەبێو بەهەمان شێوە بینووسم کە دایە گەورەم چیرۆکەکانی بۆ دەگێڕاینەوە، بە رووخسارێك لە چەشنی بەرد.

***لەو رەوشتە (Tecnique) یان شێوە قسەکردنەدا چلۆنایەتیەکی گوزارشی تێیدا دەبینرێ، ئێوە رووداوە خەیاڵیەکان هێنە بە وردی شیدەکەنەوە کە بە راست دەگەرێ. ئایا ئەوە هەر ئەو شتەیە کە لە رۆژنامەگەری وەرتان گرتووە؟***

لە رۆژنامەگەریدا فێڵ و تەڵەکەیەك هەیە کە دەتوانی لە ئەدەبیاتیش دا بەکاری بەری. بۆ وێنە، ئەگەر بڵێی فیلەکان لە ئاسمان هەڵدەفڕن خەڵك بڕوا بە قسەکەت ناکەن، بەڵام ئەگەر بڵێی چوار سەدو بیست و پێنج فیل هەڵدەفڕن زۆرتر لەوەدەچێ کە بڕوات پێ بکەن. سەدساڵ تەنیایی پڕە لە شتی وا. ئەوە رێك ئەو رەوشتەیە (Tecnique) کە دایە گەورەم بەکاری دەبرد. چیرۆکی ئەو کابرایەی کە پەپوولەی زەرد دەوریان دەدا، بەباشی لەبیرمە. کاتێك کە زۆر منداڵ بووم کرێکارێکی کارەبا دەهات بۆ ماڵمان. ئەو کرێکارە کەمەربەندێکی بوو کە لە دارتێلێکی چراکانی کارەبا پێی دەچووە سەرێ. ئەو کەمەربەندە زۆر سەرنجی رادەکێشام. دایە گەورەم دەیوت هەرکات کە ئەو پیاوە دێ بۆ ئەوێ، ماڵەکە پڕ دەبێ لە پەپوولە. کاتێ کە دەمویست ئەوە بنووسم زانیم کە ئەگەر بڵێم پەپوولەکان زەردن خەڵك بڕوا ناکەن. کاتێ کە چیرۆکی فەرعی رێمێدیو (Remedios) جوانکیلەم نوسی کە دەڕوا بۆ بەهەشت، ماوەیەکی پێچوو تا کردمە شتێکی جێ بڕوا. رۆژێك چووم بۆ باخ و تووشی ژنێك بووم کە شیو و کوڵی ماڵی ئێمەی دەکرد. مەلافەکانی هەڵخستبوو هەتا وشك بنەوەو بایەکی توندیشی دەهات. ئەو لەگەڵ با شاخ بە شاخ ببوو کە نەکا مەلافەکانی لەگەڵ خۆی بەرێ. زانیم کە ئەگەر جێگەی مەلافەکان و رێمێدیۆس جوانکیلە بگۆڕمەوە، ئەو هەڵدەفڕێ. هەر ئەو کارەم کرد و بوو بە شتێکی جێ بڕوا. دژواری هەموو نووسەرێك ئەوەیە کە ئەو کارە بکا. هەموو کەس دەتوانێ لە بارەی هەموو شتێکەوە بنووسێ بەو مەرجە کە جێگەی بڕوابێ.

***تاعوونی بێخەوی لە سەدساڵ تەنیاییدا ریشەکەی لە کوێوە هاتووە؟***

تاعوونەکان هەمیشە سەرنجی منیان راکێشاوە. لە بارەی تاعوونەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لێکۆڵینەوەی زۆرم کردووە. یەکێك لەو کتێبانەی کە عەلاقەی زۆرم پێیەتی، گوزارشتنامەی ساڵی تاعوون، نووسینی دانیال دیفۆیە. یەکێك لەو هەموو دەلیل و هۆیانەی کە عەلاقەم پێیەتی ئەوەیە کە دیفۆ گوزارشت گەرێکە کە هەروەکو نووسراوەکەی خەیاڵێکی پەتیە. ساڵیانێك بوو کە پێم وابوو دیفۆ تاعوونی لەندەنی بەچاوی خۆی دیوە، بەڵام دوای

تێگەیشتم کە گوزارشەکەی ڕۆمانە چونکە کاتێك کە لە لەندەن تاعوون هەموو لایەکی گرتۆتەوە ئەو حەوت ساڵان بوو. تاعوونەکان هەمیشە یەکێك لە تیمەنەکانی بەرهەمەکانی من بوون-کە لە شێوەی جۆراوجۆردا دووپات بۆتەوە. پێش لە نووسینی "سەدساڵ تەنیایی" لە چیرۆکی "ڕۆژێك پێش شەممە" تاعوونێکم بەکاربرد کە هەموو باڵندەکانی دەکوشت. لە سەدساڵ تەنیاییدا تاعوونی بێخەویم وەکو فێڵ و تەڵەکەیەکی ئەدەبی بەکاربرد چونکە دژی تاعوونی خەوە. لەوانە گەڕێین، ئەدەبیات جگە لە دارتاشی هیچ شتێکی دیکە نیە.

*نەو هەڵسەنگاندن و بۆچوونە نەختێك زیاتر شیکەنەوە.*

هەم دارتاشی و هەم نووسین کارێکی دژوارن. نووسینی هەر شتێك تەقریبەن وەك دژواری سازکردنی مێزێك وایە. لە هەردووکیاندا سەرو کارت لەگەڵ ڕاستیە. ڕاستیەك کە وەك دار ڕەق و تەقە. هەردووکیان پڕ لە فێڵ و تەڵەکەو ڕەوشتن (*Technique*). ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لەگەڵ نەختێك جادو و کۆڵێك کاری دژوار بەرەو ڕووین و هەر ئەو جۆرە کە وتویانە -پێم وایە پرۆ وتوویەتی- لە سەدا دە چێژ (الهام)و لە سەدا نەوەد عارەقە ڕشتنی پێویستە. من قەت دارتاشیم نەکردووە بەڵام زیاتر لەهەر کەسب و کارێکی تر تاریف و تەمجیدی دەکەم؛ بە تایبەتی بە خاتری ئەوەی کە کەست پێ شك نایا کارێك بە دڵی خۆت بکا.

*لە بارەی یاو و تاوی مۆز لەسەد ساڵ تەنیایی دا دەڵێن چی؟ تا چ ڕادەیەك پێوەندی بە کارەکانی کۆمپانیای یوونایتێد فرۆتەوە هەیە؟*

یاو و تاوی مۆز، ڕێك پێوەندی بە ڕاستیەکانەوە هەیە. هەڵبەت دەبێ بڵێم کە من فێڵ و تەڵەکەی ئەدەبیم لە بارەی ئەو شتانەوە بەکار بردووە کە پێشینەی مێژووی نەبووە. بۆ وێنە کوشتنی بەکۆی مەیدانەکە بە تەواوەتی ڕاستە بەڵام کاتێك کە بە پێی قسەوباس و بەڵگەنامەکان نووسیم، زۆر جوان نەت دەزانی کە چەند کەس کوژراون. من ژمارەی سێ هەزار کەسم بۆ دانا، کە بە ڕواڵەت لە ڕادەبەدەر زۆرە. بەڵام یەکێك لە بیرەوەریەکانی دەورانی منداڵیم ئەوەیە کە قەیتارێکی دوورو درێژ کە پڕیان کردووە لە مۆز، لە مەزرایەکی مۆزەوە تێدەپەڕێ. ئەو قەیتارە دەیتوانی سێ هەزار تەرمی بارکردبێ‌و ئاخریەکەی بردبێتی لە دەریا بەتاڵی کردبێ. زۆر سەیرە کە ئێستا لە مەجلیس دا قسەی لێوە دەکەن و ڕۆژنامەکان باس لە "سێ هەزار مردوو" دەکەن. من پێم وایە نیوەی تەواوی مێژوو بەو شێوەیە سازکراوە. لە "خەزانی باوك سالاری"دا، سەرەڕۆ (دیکتاتۆر) دەڵێ کە ئەگەر ئێستا بەڕاست نەگەڕێ زۆر گرنگ نیە چونکە لە داهاتوودا بەڕاست دەگەڕێ. درەنگ یا زوو خەڵك بەجێی ئەوە کە بڕوا بە قسەی حکوومەت بکەن، قسەی نووسەرەکە قبووڵ دەکەن.

*کەوایە بەو جۆرەی کە ئێوە دەڵێن، نووسەر هێزێك پێکەوە دەنێ، ئەرێ؟*

بەڵێ، منیش هەر ئەو بۆچوونەم هەیە. ئەو مەسەلەیە ئەرکێکی گەورە دەخاتە سەر شانم. بە ڕاستی ئەو کارەی کە پێم خۆشە بیکەم

بەرهەمێکی گوزارشی‌یە کە بە تەواوی مانا راست و دروست بێ بەڵام بەهەمان هێزە خەیاڵیەکەی "سەدساڵ تەنیایی"یەوە. هەرچی زیاتر دەژیم و شتم لە رابردوو بیر دەکەوێتەوە، زۆرتر هەست دەکەم کە ئەدەبیات و رۆژنامەگەری پێوەندیەکی نزیکیان پێکەوە هەیە.

* * *

*ئێوە زیاتر دیمەنی هێز بەکاردەبەن.*

ئینسان هەرچی زیاتر بەهێزبێ، دژوارە کە بزانی کێت لەگەڵەو کێت لەگەڵ نیە. کاتێك کە بە هێزێکی سەرەڕۆ دەگەی ئیتر هیچ پێوەندیەکت بە راستیەوە نامێنێ‌و ئەوەش خراپترین جۆری تەنیاییە. ئینسانێکی زۆر بەهێز، ئینسانێکی سەرەڕۆ، دەورووبەری بەعەلاقەو خەڵکێك تەنراوە کە ئامانجی سەرەکیان جیاکردنەوەی ئەو لە راستیەکانە؛ هەموو شتێك دەست دەدەنە دەستی یەك هەتا ببێتە کەسێکی دوورەپەرێز.

*لە بارەی تەنیایی نووسەردا چی دەڵێن؟ ئایا ئەمەیان شتێکی جیاوازە؟*

لەگەڵ دوورەپەرێزی هێز (انزوای قدرت) زۆر لەیەك دەچن. هەوڵی نووسەر، بۆ باسکردنی راستیەکان، زۆرجار ئەو بەرەو شکل و شێوەی راستیەکان رادەکێشێ. هەر ئەو جۆرەی کە دەڵێن بورجی عاج نشینەکان لە هەوڵی پاش و پێش خستنی راستیەکاندا رەنگە پێوەندی خۆیانی لەگەڵ، لە دەست دەن. رۆژنامەگەریش پارێزگاری لە بەرامبەر وەها کارێك دایە. هەربۆیەو بەپێی ئەو شتە بووە کە من هەمیشە خەریکی کاری گوزارشگەری بووم چونکە ئەو کارە پێوەندی من لەگەڵ دنیای راستیەکان رادەگرێ؛ بەتایبەتی گوزارشە سیاسیەکان و سیاسەت. دوورەپەرێزیەك کە پاش نووسینی سەدساڵ تەنیایی هەرەشەی لێکردم دوورەپەرێزی نووسەر نەبوو، بەڵکو دوورەپەرێزی ناو و ناوبانگ بوو کە زۆر لە دوورەپەرێزی هێز بەربڵاوتر بوو. هاوڕێکانم لە بەرامبەر وەها خۆگوم کردنێکدا پشتیوانیان لێ کردم؛ هەر ئەو هاوڕێیانەی کە دایم و دەرهەم حازرن.

*چۆناو چۆن؟*

چونکە من هاوڕێی گیانی بە گیانی‌و نەگۆڕم لە سەرتاسەری ژیانم دا بووە. مەبەستم ئەوەیە کە من لە هاوڕێ قەدیمیەکانم دانابڕم و پێوەندی خۆمیان لەگەڵ رادەگرم. ئەوان کەسانێکن کە دەم هێننەوە سەر زەوی، ئەوان هەمیشە لاقیان لەسەر زەویەو ناو و ناوبانگێکیان نیە.

* * *

*ئایا رۆمانەکانتان وەرچەرخانی کتوپڕ دەکەن؟*

لە سەرەتای کارکردنم دا وابوو. لەیەکەم چیرۆکەکانی کە دەمنووسی تەرحێکی گشتیم لە شێوەی کار لە زەیندا بوو بەڵام زیاتر خۆمم دەسپاردە دەست قەزاو قەدەر. باشترین پێشنیار کە لە سەرەتاوە پێم کرا ئەوە بوو، ئینسان کە لە جەوانی‌دا لێواو لێوی چێژە (الهام) ئەوکارە ئیرادی نیە بەڵام ئەگەر بەدوای رەوشت (*Technique*)دا نەگەڕێو فێری نەبێ دواجار کە خەبەرێك لە چێژ (الهام) نیەو دەبێ رەوشت بخاتە جێگەی، تووشیاری دەردی سەرو گیروگرفت دەبێ. ئەگەر لە سەر وەختی خۆی فێری رەوشتی چیرۆك نووسین نەبووم ئێستا نەمدەتوانی لە پێشەوە تەرح بۆ ساخت (*Structure*)ی بەرهەمەکانم داڕێژم. ساخت

مەلەسەیەکە کە تایبەتەن بەستراوەتەوە بە رەوشت و ئەگەر نووسەر لە سەرەتای کارکردنەوە فێری نەبوو ئیتر قەت فێری نابێ.

***کەوابە رێکوپێکی و نەزم زۆر گرنگە؟***

پێواناکەم ئینسان بتوانێ کتێبێکی بە بایەخ بنووسێ بێئەوەی کە نەزم و تەرتیبێکی لە رادەبەدەری تێدا بەکار بردبێ.

***لە بارەی بۆچوونە دەستکردەکانەوە (مصنوعی) دەڵێن چی؟***

شتێك کە هەمەنگوای نووسیو کاریگەریەکی زۆری کردە سەرم ئەوە بوو کە بە بڕوای ئەو نووسەری وەك وەرزشی بۆکسۆری وایە. ئەو بایەخێکی زۆری بەلەش ساغی و خواردن و خۆراك دەدا. فاکنێر نێوبانگی بە کەسێکی سەرخۆش و مەست دەرکردووە بەلام لە هەر وتووێژێك کە پێکەوە بوون دەیگوت کە قەت وانەبووە بە سەرخۆشی دێڕێکی شت نووسیبێ. هەمەنگوایش هەر وای دەگوت. خوێنەرە بەپرتەو بۆڵەکانم لێیان پرسیوم کە ئایا لە کاتی نووسینی هێندێك لە بەرهەمەکانم مەوادی موخەدیرم بەکار نەهێناوە؟ ئەو پرسیارە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوان هیچ شتێك لە بارەی مەودای موخەدیرو ئەدەبیاتەوە نازانن. بۆ ئەوەی کە نووسەرێکی باش بین دەبێ لە سەرتاسەری کاتەکانی نووسیندا بە تەواوی وریاو لەش ساغ بین. من بە توندی دژی ئەو هەڵسەنگاندنە رۆمانتیکیەم لە نووسیندا کە دەڵێ نووسین جۆرێك قوربانی کردنەو هەتا بارودۆخی ئابووریو حاڵەتی روحی خراپتر بێ نووسراوەکە بە بەیاختر و باشترە. بە بڕوای من نووسەر دەبێ وەزعی روحیو لەشی لە بارودۆخێکی زۆرباشدا بێ. من پێم وایە ئافراندنی ئەدەبی لەش ساغیەکی تەواوی پێویستەو ئەسڵی بێ ناو و نیشان ئەو مەسەلەیەی دەزانی. ئەوان کەسانێك بوون کە ژیانیان خۆش دەویست.

***بلایز ساندرا (Blaise Sandrars- نووسەرێکی فەرانسەییە). دەیگوت نووسەر لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ زۆریەك لە کارو پیشەکان ئیمتیازێك بە حسێب دێ نووسەران رەنج و ئازاری خۆیان لە رادەبەدەر زۆر نیشان دەدەن. ئێوە لەوبارەیەوە دەڵێن چی؟***

من پێم وایە کە نووسەریی کارێکی زۆر دژوارە؛ هەر کارو پیشەیەکی تریش ئەگەر بێت و بەسەرنج و لە دڵەوە بیکەی هەر ئەو حاڵەتەی هەیە. بەلام ئیمتیازەکە لەوەدایەو کە ئینسان کارەکە بەدڵی خۆی بکا. من هەست دەکەم زیاد لە حەد بەرامبەر بەخۆم و کەسانی تر پێداگرو لاسارم و ناتوانم چاوپۆشی لە هەڵەکانم بکەم. بەهەرحاڵ من پێم وایە ئیمتیازەکە لەوەدا کە هەر کارێك تاحەدی خۆیو پێگەیشتن بکەین. زۆربەی نووسەرەکان نەخۆشی خۆبەزل زانیسان هەیەو خۆیان بە ناوەندی دنیاو ویژدانی کۆمەڵگا دەزانن. بەلام من تاریف لە کارێك دەکەم کە بەباشی کرابێ. لە سەفەردا کاتێك هەست بە بەختەوەری دەکەم کە بزانم فڕۆکەوانەکان لە منی نووسەر باشترن.

***ئێستا باشترین کات بۆ کارکردن چ وەختێکە؟ بەرنامەی کارکردنتان هەیە؟***

کاتێك بووم بە نووسەرێکی پیشەیی و موشکیلەی من دانانی بەرنامەیەك بۆ کارکردن بوو. مانای رۆژنامەگەری یانی شەوکارکردن.

کاتێك که کاری نووسەریم بە شێوەیەکی درێژ وە دەست پێکرد چل ساڵم تەمەن بوو، بەرنامەی کارەکەم لە نۆی بەیانیەوە تا دووی دوانیوەڕۆ بوو -یانی تا کاتێك کە کوڕەکانم لە مەدرەسە دەگەڕانەوە. چونکە خووم بەکاری دژوار گرتبوو، هەوڵم دا دوانیوەڕوانیش کاربکەم. بەڵام زانیم تەواوی ئەو شتانەی کە دوانیوەڕۆ دەینووسم بۆ بەیانیەکەی دەبێ سەرلەنوێ بیاننوسمەوە. هەر بۆیە بڕیارم دا کە لە سەعاتی نۆی بەیانیەوە هەتا دووی دوانیوەڕۆ کاربکەم و دەست بۆ هیچ کارێکی تر نەبەم. دوانیوەڕوان بە قەرارو وتوویژەکانم را دەگەم و هەروەها هەر کارێکی دیکە کە پێش دێ. موشکیلەیەکی تری من ئەوەیە کە لە شوێنە ناسراوەکان و ئەو جێگایانەی کە پێشتر کارم لێ کردووە دەتوانم بنووسم. لە میوانخانەکان یان دیوی کەسانی کەو بە ماشێنی تەحریری دیکە ناتوانم شت بنووسم. هەروەها لە کاتی سەفەرکردنیش دا کە ناتوانم کاربکەم مووشکیلەم بۆ دێتەپێش. هەڵبەت ئینسان بۆ ئەوەی کەمتر کاربکا بەدوای بیانوودا دەگەڕێ. هەر بەپێی ئەوەشە کە هەلو مەرجێك کە ئینسان بۆخۆی بەسەرخۆی دا دەسەپێنێ هەمیشە مووشکیلەی بۆ درووست دەکا. بەڵام ئینسان سەرەڕای هەموو ئەو رووداوانە دڵ بەچێژ (الهام) دەبەستێ. ڕۆمانتیکەکان لە وشەی چێژ (الهام) بەخراپە کەڵکیان وەرگرتووە. هاوڕێ مارکسیستەکانی من، لە قبووڵکردنی ئەو شتەدا لەگەڵ دژواری رووبەڕوون بەڵام هەر ناوێکی لەسەر دادەنێن من پێم وایە جۆرە حاڵەتێك لە زەینی ئینساندا هەیە کە تێیدا بە ئاسوودەییەکی زۆرەوە دەنووسێ و نووسراوەکان وەك لافاو بەزەینت دا دێن و هەموو ئەو بیانووانە -بۆ وێنە ئەوەی کە تەنیا دەتوانی لە ماڵێ شت بنووسی- وەلا دەنرێ. دەڵێی ئەو سات و کات و حاڵەتە زەینیە تەنیا کاتێك پێدەگا کە ئێوە دیمەنێکی باش و شێوەیەکی باشتان بۆ بەکاربردن دۆزیبێتەوە. جیا لەوەش، بەراستی کاردەبێ بە مەیل و خواستی ئینسان بێ چونکە بە راستی هیچ کارێك ناخۆشتر لەوە نیە کە بە دژی خواست و مەیلی ئینسان بکرێ.

یەکێك لە دژوارترین شتەکان نووسینی بەشی هەوەڵی چیرۆکەکەیە. من چەندین مانگ خەریکی بەشی هەوەڵی چیرۆکێك بووم و کاتێك کە تەواوم کردووە زۆر ئاسان باقی چیرۆکەکەم نووسیوە. دیمەن و شێوەو ئاهەنگی (لحن) چیرۆکەکە لە خۆوە رەوتی خۆی گرتۆتەبەر: "لانی کەم بۆ من، بەشی هەوەڵی چیرۆکەکە جۆرێك شێوەکارەکە نیشان دەدا باقی کتێبەکە چۆناوچۆن دەبێ. هەر بەپێی ئەوەشە کە نووسینی کۆمەڵە چیرۆکێك زۆر دژوارتر لە نووسینی ڕۆمانێکە. هەموو کەرەتێ کە دەست دەکەی بە نووسین کورتە چیرۆکێك دەبێ هەموو شتێك لە سەرراوە دەست پێ بکەی.

### *ئایا خەیاڵەکان (ڕۆیاها ) "وەکو سەرچاوەیەکی چێژ (الهام) هەمیشە جێگەی بایەخ و سەرنجن؟*

من هەر لە سەرەتای چیرۆك نووسینەوە گرنگیەکی زۆرم پێ دەدان. بەڵام پاشان تێگەیشتم کە ژیان خۆی گەورەترین سەرچاوەی ئیلهام و خەیاڵ (ڕۆیا) بەشێکی زۆر بچووکە لەو لافاوەی کە ناوی ژیانە. شتێك کە لە بارەی نووسەری منەوە راستە ئەوەیە کە من زۆر حەز دەکەم لە مانای جۆراوجۆری خەیاڵەکان (ڕۆیاها) تێبگەم و تاووتوێیان بکەم. بە گشتی من خەیاڵ

وەکو بەشێك لەژیان دادەنێم بەلام راستیەکان زۆر غەنی ترو بەبایەختن. رەنگە مەسەلەکەش ئەوە بێ کە خەیاڵەکانی (رۆیاها) من هێندە بە بایەخ نین.

* * *

***ئایا پێتان وایە کە رەخنەگران حسێبێکت بۆ ناکەنەوە؟***

به بڕوای من رەخنەگران نموونەی بەرچاوی شتێکن کە ناوی ڕووناکبیرگەراییە ئەوان لە پێشەوە فەرزو گومانێکیان هەیە کە تایبەت بە نووسەرەو هەوڵ دەدەن کە لەو چوارچێوەیەی خزێنن و ئەگەر هاتو و لەو چوارچێوەیەدا جێی نەبۆوە هەوڵ دەدەن بە زۆر جێگەی بکەنەوە. من تەنیا بەخاتری ئەوەی کە وەڵامم بەئێوە دابێتەوە ئەو قسەیە دەکەم، چونکە بە راستی هیچ عەلاقەیەکم بەوە نیە کە بزانم نەزەر و بیروڕای رەخنەگران سەبارەت بە خۆم چیە. ساڵیانێك دەبێ کە رەخنەیەکم نەخوێندۆتەوە. ئەوان خۆیانیان خزاندۆتە نێوان نووسەرو خوێنەرەوە. من هەمیشە هەوڵم داوە شتەکانم زۆر بە سەرنج و ڕوون و ئاشکرا بنووسم تا بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەگەڵ خوێنەر قسە بکەم و پێویستم بە رەخنەگر نەبێ.

***لە بارەی وەرگێڕەکانەوە دەڵێن چی؟***

من ڕێزو حورمەتم هەیە بۆ وەرگێڕەکان، بێجگە لەو کەسانەی کە پاوەرەقی بەکار دەبەن، چونکە هەوڵ دەدەن شتێك بۆ خوێنەر شیبکەنەوە کە زۆر جار بیروڕای نووسەرەکە نیە؛ و خوێنەرەکە ئەزێت دەکا. وەرگێڕانێکی باش ئافراندنە بە زمانێکی تر. هەر بۆیە من گریگۆری راباسم (*Gregory Rabasa*)**** قبووڵەو ئافەرینی لێدەکەم. کتێبەکانی من وەرگێڕاوەتە سەر بیست و یەك زمان و لەو نێوەدا تەنیا وەرگێڕێك کە قەت داوای لێنەکردووم شتێکی بۆ ڕوون کەمەوە هەتا لە خوار لاپەڕەکەوە بینووسێ، راباسا بووە. من پێم وایە کە تەواوی بەرهەمەکانم بە زمانی ئینگلیزی ئافراندراونەتەوە.

هەمیشە چەند بەش لە کتێبێك وەرگێڕانەکەی بەشێوەی وشە بە وشە دژوارە. ئینسان وا هەست دەکا کە وەرگێڕەکە کتێبەکە دەخوێنێتەوەو پاشان بە فکرو زەینی خۆی دووبارە دەینووسێتەوە. هەر بە پێی ئەوەشە کە ئەو جۆرە وەرگێڕانەم قبووڵەو بە دڵمە. ئەوان زۆرتر لە فکری ئاشکراکردن (مکاشفە)دان تا ڕووناکبیرگەرایی. نە تەنیا ئەو شتەی کە ناشرەکان خەریکین کەمە بەڵکو کارەکەیان ئافراندنی هونەری بە حسێب ناهێنن. من خۆم تووشی کتێبی وابووم کە ویستوومە وەریگێڕمە سەر زمانی ئیسپانیایی، بەلام ئەو کارە بەقەت نووسینی کتێبەکانم وەخت دەبا و هێندەشم پووڵ و پارە بەدەستەوە نیە کە بتوانم گوزەرانی پێوە بکەم.

* * *

***بە بڕوای ئێوە خراپە نووسەر زوو ناوبانگ دەرگاو سەرکەوتن [illegible]؟***

له هەر تەمەنێکی [illegible] بکا خراپە. من پێم باش بوو کە پاش مردنم ناوم کەوتبایە سەرزار، لانی کەم لە ولاتانی سەرمایەداری کە ئینسان دەبێتە جۆرە کاڵایەك.

***بۆچی پێتان وایە کە ناوبانگ تا ئەو رادەیە بۆ نووسەر خراپە؟***

زیاترێکەی بەخاتری ئەوە کە هێرش دەکاتە سەر ژیانی ئینسان؛ ئێوە لە دنیای راستیەکان

دوور دەخاتەوە. نووسەرێکی باش کە دەیەوێ درێژە بە نووسین بدا دایم و دەرهەم دەبێ لە بەرامبەر ناو و ناوبانگدا پشتیوانی لەخۆی بکا. من بە راستی ئەو مەسەلەیە لەو روانگەیەوە ناهێنمەوە گۆڕێ کە شتێکی راست و درووست نیە، دەبێ بڵێم کە من پێم خۆش بوو کە کتێبەکانم پاش مردنم بڵاوبێتەوە هەتا ناچار نەبوویایەم لەگەڵ مەسەلەی "ناو و ناوبانگ" و "نووسەری گەورە بوون"، دەرگیر بم. بە بڕوای من تەنیا تایبەتمەندی ناو و ناوبانگ ئەوەیە کە ئینسان دەتوانێ لە کاروباری سیاسیدا کەڵکی لێ وەرگرێ. جیا لەوە بەکاری هیچ شتێکی دیکە نایا. مەسەلەکە ئەوەیە کە لەماوەی شەو و رۆژێک دا بیست و چوار سەعات بە نێوبانگی و ناتوانی بڵێی: "وەڵا خۆ زۆر چاکە، لە ئێستاوە تا سبحەینێ بەناوبانگ نیم". یان ئەوەی کە پاڵ بە دووگمەیەکەوە بنێی و بڵێی: "من ئێستا و لێرە بەناوبانگ نیم".

## ئایا پێش بینیتان دەکرد کە "سەدساڵ تەنیایی" ئاوا سەرکەوتنێک بەدەست بێنێ؟

دەمزانی دەبێتە کتێبێک کە هاورێکانم زۆرتر لە هەر کەسێکی تر پێی خۆشحاڵ دەبن بەڵام کاتێک ناشرە ئیسپانیاییەکە پێی وتم کە دەیەوێ هەشت هەزار نووسخەی لێ چاپ بکات، سەرم سووڕما چونکە کتێبەکانی ترم قەت ژمارەیان لە حەوسەد نووسخە زیاتر نەبووە. پرسیارم کرد کە بۆچی بە ژمارەیەکی کەمترەوە دەست پێ ناکا، بەڵام ئەو وتی کە هاتۆتە سەر ئەو بڕوایە کە کتێبێکی باشەو هەشت هەزار نووسخە لە ماوەی حەوت مانگدا دەفرۆشرێو هەرواشی لێهات و هەمووی لە ماوەی حەوتوویەک دا، لە بۆینۆس ئایرێس، فرۆشرا.

## ئەی بە بڕوای ئێوە سەدساڵ تەنیایی بۆچی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی بەدەست هێنا؟

من ناتوانم لەو بارەیەوە بیروڕایەک دەربڕم چونکە من بەرامبەر بە بەرهەمەکانم رەخنەگرێکی خراپم. یەکێک لەو لێکدانەوەو هەڵسەنگاندانەی کە زۆر جار بیستوومە ئەوە بووە کە سەدساڵ تەنیایی کتێبێکی لەسەر ژیانی خەڵکی ئامریکای لاتین و هەروەها لە ناوەوەی کۆمەڵگاوە نووسراوە. لەو لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنە سەرم سووڕما چونکە من لە سەرەتاوە ناوی "ماڵ"م لەسەر دانا. دەمویست بەربڵاوی تەواوی رۆمانەکە لە ناو "ماڵ"ێ دابێ‌و ئەو شتانەی کە لە دەرەوەی روودەدا تەنیا لە پێوەندی لەگەڵ ماڵێ دا بێتە گۆڕێ. پاشان ناوی "ماڵ"م وەلا نا. رووداوەکانی کتێبەکە کاتێک دەگاتە ماکوندۆ لەوێ زیاتر تێناپەرێ. هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەیەکی تر کە بیستوومە ئەوەیە کە هەر خوێنەرێك ئەو شتەی کە خۆی دەیەوێ دەتوانێ لە کەسایەتیەکانی چیرۆکەکەدا ببینێ‌و ئەوان بە کەسانی خۆی بزانێ. من نامەوێ لەسەر ئەو رۆمانە فیلم سازکرێ چونکە ئەو کەسانەی کە فیلمەکە دەبینن رەنگە لەگەڵ شکل و شێوەو کەسایەتیەک بەرەو روو بن کە بەبیریشیاندا نەهاتبێ.

## کەس پێشنیاری پێکردوون کە لە روویەوە فیلم سازکەن.

بەڵێ، وەکیلکەم یەک ملیۆن دۆلاری پێ پێشنیارکردم هەتا ئەو کەسانە دڵساردکاتەوە کە بە هیوای ئەو کارەن، بەڵام کاتێك دیتی کە

کەسانی تر تا یەک ملیۆن دۆلار پێشنیاریان پێ کردووم نرخەکەی تا سێ ملیۆن دۆلار بردە سەرێ، بەڵام من هێندەم عەلاقە بەو فیلمە نیەو تا کاتێك کە بتوانم پێشگری لە سازکردنی دەکەم. پێم باشە کە هەمیشە وەك پێوەندیەکی تایبەتی لەنێوان خوێنەرو کتێبەکەدا بمێنێتەوە.

*بە بڕوای ئێوە هەموو کتێبێك دەتوانێ سەرکەتووانە بکرێ بە فیلم؟*

پێم وا نیە هیچ فیلمێك لە رووی رۆمانێکی باشەوە سازکرابێ بەڵام پێم وایە فیلمە چاك و زۆرەکان لە رووی رۆمانە خراپەکان سازکراون.

*بۆ خۆتان قەت بیرتان لە سازکردنی فیلم کردۆتەوە؟*

دەورانێك پێم خۆش بوو ببمە کارگێڕی سینەما. من لە رۆم دەرسی کارگێڕی سینەمام خوێندووە. هەستم دەکرد کە سینەما شتێکی بێ سنوورەو لە چوارچێوەکەیدا هەموو کارێك دەکرێ. هەر بە پێی ئەوەش هاتم بۆ مەکسیك کە دەمویست لە سینەما دا کاربکەم -وەك فیلم نامە نووسێك، نەك وەکو کارگێڕی سینەما. بەڵام چونکە سینەما هونەری سەوداگەریە (تجاری)، سەرتاسەر سەوداگەریە، زۆر بەرتەنگە. لە سینەمادا بە راستی دژوارە بتوانی بیروڕای خۆت دەربڕیو قسەی دڵت بکەی. من ئێستاش هەر بیری لێدەکەمەوە، بەڵام من ئەو کارەم وەك کارێکی جوان و رازاوە خۆش دەوێو پێم خۆشە بە یارمەتی هاوڕێکانم لەو بوارەدا کاربکەم بێ ئەوەی کە هیوادارىم ئەو شتەی کە خۆم دەمەوێ و لە دڵمدایە بیلێم. هەر بۆیەش پەیتاپەیتا لە سینەما دوورکەوتوومەتەوە. پێوەندی من لەگەڵ سینەما وەکو پێوەندی نێوان ژن و مێردێك وایە کە ناتوانن جیا لە یەك ژیان بکەن. بەڵام پێکەوەش هەڵناکەن. سەرەڕای ئەوانە ئەگەر بڵێن پێت خۆشە کۆمپانیایەکی فیلم بەرداریت بێ یان ئیدارەیەکی رۆژنامە، دەڵێم ئیدارەی رۆژمانە.

*وەکو نووسەرێك چ ئاوات و ئارەزوویەکتان هەیە؟*

پێم وابێ وەڵامەکەی من هەر ئەوەبێ کە لە وەڵامی ئێوە سەبارەت بە ناو و ناوبانگ دامەوە. هەر دوێنێ بوو کە لێیان پرسیم عەلاقەت بە خەڵاتی نۆبل هەیە یان نا، بەڵام من پێم وایە کە ئەو خەڵاتە بۆمن بە تەواوی مانای کارەساتێکی گەورەیە. هەڵبەتە هەست دەکەم شایستەی وەرگرتنی ئەو خەڵاتە هەم، بەڵام وەرگرتنەکەی بۆ من ترسناکە. ئەو مەسەلەیە تەنانەت دژواریەکانی ناو و ناوبانگ ئاڵۆزتر دەکا. تەنیا شتێك کە لە ژیانمدا ئاواتی بۆ دەخوازم ئەوەیە کە کچێکم بێ.

-ئایا کارێکی واتان بەدەستەوە هەیە بیکەن؟

+من بەو ئەتیجەیە گەیشتووم کە دەبێ گەورەترین کتێبی خۆم بنووسم، بەڵام ناوی کتێبەکەو هەروەها وەختی نووسینی کتێبەکە نازانم. کاتێك وەها هەستێك دام دەگرێ-کە ئێستا ماوەیەکە وەها هەستێکم هەیە- زۆر لە سەرەخۆو ئارام دەبمەوە تا بتوانم لە داوی خەم.

**پەراوێزەکان:**

*ئەو وتووێژە لە فەسڵنامەی ئەدەبی "پاریس ریڤیو" (پائیزی *1981*) چاپ کراوە. فەسڵنامەی ئەدەبی سێنکراستۆس (*Cencrastus*)ی چاپی ئیسکاتلەند (زستانی ئەو ساڵە) ژمارەی ئەو زمانانەی کە بەرهەمەکانی گ. گ. مارکیزی وەرگێڕاوەتە سەری، *32* زمان راگەیاندووە. ئەو ژمارەیە هاوکات لەگەڵ راگەیاندنی خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵی ئەدەبیاتی *1982* بۆ گارسیا مارکیز، بەپێی گوزارش رۆژنامەی تایم، گەیشتووە بە *33* زمان و....

**مەسخ: (مسخ) وشەیەکی عەرەبیە. دوو مانای هەیە:

*1*-گۆڕینی رووخسار بە شێوەیەکی زۆر ناتەرزو ناشیرین. *2*-کەسێك کە شکل و شەمایلی گۆڕابێ و بووبێت بە شتێکی ناتەرزو ناحەز.

وەرگێڕ.

***(رۆیاها)- وشەیەکی عەرەبیە، بەمانای ئەو شتانە کە لە خەون دا دەیبینی. بەڵام لێرەدا مەبەست شتێکی ترە بۆ وێنە: ئەم چیرۆکە خەیاڵیە. واتە بەخەیاڵ دروست کراوە.. و

****گریگۆر راباس وەرگێڕی بەرهەمەکانی گارسیا مارکیزە بە زمانی ئینگلیزی.

**ئەم چاوپێکەوتنە لە پێشەکی رۆمانی-سەعاتی شووم-ی چاپە ئینگلیزیەکەدا هاتووە، بەڕێز وەرگێڕە فارسیەکە دەقی چاوپێکەوتنەکەی بۆ فارسیی کردووە، وەرگێڕە کوردیەکە هەندێك پەرەگراف و چەند بەشێکی لاداوەو وەری نەگێڕاون، بەڵام لەبەر گرنگی دیمانەکە ئێمە بڵاومان کردەوەو ئەو کەموکورتیەمان لەبەرچاو نەگرت.**

**سەردەم**

## یانەی سینەما Cinema Club

# قولەڕەشەکان و سینەما

• ئامادەکردن و وەرگێڕانی: هەڵگورد عارف

کێشەی قولەڕەشکان و کۆیلەکان لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا بووە کێشەی ژمارە یەکو سەرەکی لەئەمریکا.. لەساڵی **1862**ز سەرۆك (ئیبرهام لنکۆڵن *Abraham Lincoln*–)[1] کەنازناوی رزگاریکەری کۆیلەکانە بڕیاری وەستاندنی کاری بە یاسای کۆیلەکان دەرکردو یاسای نەهێشتنی سیستەمی کۆیلایەتی مۆر کردو جاڕیدا..

بەشی خواروی ئەمریکا کە زۆربەی ناوەندە بازرگانیەکانی کۆیلەی تیادابوو بەم یاساو جاڕنامەیە قایل نەبوون.. چونکە ڕاستەوخۆ دژی بەرژەوەندیەکانیان بوو.. ئەمە بووە هۆی هەڵگیرسانی جەنگێکی ناوخۆیی خوێناوی پڕ ئازارو ئەشکەنجە لەنێوان باکورو باشوری ئەم وڵاتەو چەند ساڵێکی خایاند.. وەمەترسی گەورەشی خستە سەر یەکپارچەیی خاکی ولایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا..

بەڵام ئەم جەنگە بەسەرکەوتنی بەشی باکور کەحکومەتی مەرکەزیو سەرۆك لنکولن نوێنەرایەتیان ئەکرد بەسەر بەشی باشوردا کۆتایی هات.. وڵات یەکپارچەیی بەخۆوە دی.. وئەو یاسایە جێگیر بوو سیستەکی کۆیلایەتی لەناو چوو.. بەڵام.. ئایا قولە ڕەشەکان وەك سپی پێستەکان هەموو مافێکیان هاتە دەست؟.. ئایا بەیەك چاو سەیرکران وەك هەر هاووڵاتیەکی ناو ئەمریکا.؟

نەخێر.. ناوەندە رەگەزپەرستەکان.. بازرگانەکانی کۆیلە.. کۆنەپەرستەکان.. سەرمایەدارەکان.. هەروا زوو خۆیان نەدا بەدەستەوە بەئاشکراو نهێنی دژایەتی سیستەمی



دیمەنێك لە فیلمی (بۆ گەورەکەم لەگەڵ خۆشەویستیدا) لای چەپ ئەکتەری ناودار (سیدنی بواتیە)

نوێ‌و یاساو دەستووریان ئەکرد.. لەزۆربەی ولایەتەکاندا باری قولەڕەشەکان تا ئەهات خراپتر ئەبوو.. لەگەڵ ئەوەشدا کەخۆیان‌و ژمارەیەك لەسپی پێستە پێشکەوتنخوازان بەرەنگاری ئەو رەوش‌و بارە بوونەوەو بەرامبەر وەستان‌و خەباتی بێ وچانیان کرد لەپێناو بەدەست هێنانی مافی تەواو بۆ رەش‌پێستەکان‌و یەکسانی نێوان هەموو هاوولاتیان.. بەلام ئەم بارە دزێو و ناهەموارە تا سالانی نزیکی پێش کۆتایی سەدەی بیستەم درێژەی هەبوو.. ناوەندە رەگەزپەرستەکان لەسەرمایەداران بەتایبەت ئەوانەی زیانیان لەئەنجامی نەمانی یاسای کۆیلایەتی لێ‌کەوتبوو.. لەبەر ئەوەی هێشتا دەسەلاتی گەورەی مادی‌و سیاسیان هەر مابوو هەموو رێگایەکیان ئەگرتە بەر.. هەموو کارێکیان ئەنجام ئەدا بۆ قەرەبوو بوونی زیانەکانیان.. لەبەرئەوەی ئەم ناوەندانە دەستیان لەهەموو بازرگانیەکاندا هەبوو کاتێك سینەما داهات‌و پاش ماوەیەکی کەم بووە پیشەسازیەکی پڕ سوود‌و بازرگانیەکی مادی باش ئەم ناوەندانە قۆستیانەوەو بۆ بەرژەوەندیەکانیان وایان کوشی تەنها یەك دلۆپ تەڕاییان تیادا نەهێشتەوە چ لەرووی بلاوکردنەوەی ئەو هزرو بیروڕایانەی کەلەگەل مەرامەکانیا ئەگونجا.. بۆیە هەر لەپەیدابوونی سینەما تا ئەم سالانەی دوایی سینەمای ئەمریکی بەپێشەنگایەتی هۆلیود بۆ ئالۆزکردنی باری ژیانی قولەڕەش‌و پوچەلکردنەوەی یاسای رزگاریان لەکۆیلایەتی قولەڕەش وەك کەسایەتیەکی دواکەوتوو دڕندەو کۆیلەو دوور لەشارستانیەت‌و داماڵراو لەهەموو سیفەتێکی مرۆیی پێشکەش بەبینەرانی سینەما لەسەرتاسەری جیهاندا کرا..

دکتۆر لورنس فردریك لەیەکێك لەنووسینەکانیا لیستێك بەو کەسایەتیانە دیاری ئەکات کە بەرهەم هێنەرانی هۆلیود لەسەر پەردەی سینەما بۆ قولەڕەشەکانیان دروست کردوەو پێشکەشیان کردوە کەتوانیویانە لەناخو دەرونی بینەراندا بیچەسپێنن چ لەئەمریکا چ لەولاتانی تری جیهاندا وەك:

(قولەڕەشی دڕندە)و (کۆیلەیەکی رۆح سوك)و (خزمەتکارێکی دەستەمۆ– *The Devoted*

*Servat*)و (سیاسەتمەدارێکی چەپەڵ)و (هاوڵاتیەکی هەڵاتوو لەلێپرسراوێتی) (دزێکی داماو)و (زەبەلاحێکی پڕ هەوەس)و (رەش پێستێکی هەڵگەڕاوە لەرەنگی خۆی)و (بەرەگەز چێشتکەر)و (مۆسیقاژەنێکی نابوت)و (ئەکتەرێکی بانتومیم)[2] و (گێلەپیاو) ..هتد..

پێشکەشکردنی قولەرەش لەسەر پەردەی سینەما بەم شێوەیە بوە هۆی لاوازکردنی ئارەزوی لە بەدی هێنانی مافەکانی و کردیە مرۆڤێکی بێ ئاگا لەرووداوەکانی دەوروبەری و کۆمەڵەکەی. بەوەش سینەمای ئەمریکی سەلماندی کە بەهێزترین چەکە لەکاری سەرکوتکردنی رەگەزی رەش..و بەفیڕۆدانی مافەکانی و هێشتنەوەی کۆت و زنجیر لەگەردنی بۆ بەرژەوەندی سپیەکان.. ئەگەر بەخێرایی گوزارشتێک بکەین بەناو ئەو فیلمە ئەمریکیانەی کە دەربارەی قولەرەشەکان بەرهەم هێنراوە رەچاوی ئەوە ئەکەین کە بەسەر چوار قۆناغدا دابەش بووەو ئەم قۆناغانە لەساڵی *1903*وە دەست پێدەکات هەتا ئەم ساتە.. قۆناغەکانیش ئەمانەن:

- قۆناغی زەلیلی
- قۆناغی دوای جەنگی جیهانی
- قۆناغی ئەزموونی کۆمەڵایەتی
- قۆناغی بەرەنگاربوونەوەی (نەگەتیڤەکان و پۆزەتیڤەکان)

**قۆناغی یەکەم:**

لەگەڵ بەرهەم هێنانی فیلمە کورتەکەی دەرهێنەر (جۆرج میلییە – *George Mele*) بەناوی (نەخۆشخانەی بلومینج – *Bloming Hospital*) لەساڵی *1903* ئەم قۆناغە دەستی پێکرد کەباسی چوار قولەرەش ئەکات بەخێراییەکی شێتانە عەرەبانەیەکی شەش ئەسپی لێدەخوڕن.

(پیتر نوبل *Peter Nonel*–) لەکتێبەکەیدا بەناوی (سینەمای قولەرەشەکان *Negro Cinema*–) کەلەساڵی *1953* بڵاوی کردۆتەوە ئەڵێ: ئەو ئەکتەرانەی لەم فیلمەدا بەشداربیان کردووە لەقولەرەشەکان نەبوون.. بەڵکو ئەکتەری سپی پێست بوون و دەموچاوو دەستیان بەبۆیە رەش کردبوو.. بێگومان رەنگگۆڕینی ئەکتەرێکی سپی پێست بەرەنگی رەش زۆر ئاسانترە لەوەی هانا بەرن بۆ ئەکتەرێکی رەش پێست، چونکە ئەو ئەکتەرە سپی پێستە بەئاسایی و بەئارەزوی خۆی گەورەترین بەش لەگێلێتی و نەفامی ئەخاتە پاڵ کەسایەتیە قولەرەشەکان.

ئەم فیلمەی (میلییە) سەرکەوتنێکی چەماوەری باشی بەدەست هێنا کەوای لەپیاوانی سینەمای ئەمریکی کرد زنجیرەیەك لەم جۆرە فیلمە کۆمیدیایەی کەپشت ئەبەستێ بەکەسایەتی قولەرەشەکانەوە کەبەشێوەیەکی گێل و کەم مێشك پیشسان ئەدرێن بەرهەم بهێنن. لەناوبانگترین ئەم کەسایەتیە دروستکراوانە کەسایەتی (راستوس–*Rastos*)و (سامبو–*Sambo*)و (مام جیم– *Uncle Jim*) بوو..

زۆربەی جەماوەری ئەم فیلمانە لەمناڵان بوون کەدڵخۆش و سەرسوڕماوی ئەم هەڵوێستە کۆمیدیو گاڵتەجاڕیانەی کەسایەتیە قولەرەشەکان بوون کە لە ئەنجانی گێلی و بێ مێشکیەوە رووی ئەدا..

لەهەمان ساڵدا واتە لەساڵی *1903* دەرهێنەری ئەمریکی (ئۆدیون س. پۆرتەر–

Oduion C. Borter) فیلمێکی بێ دەنگی بەناوی (کوخەکەی مام تۆم – Uncle Tom's Cottage)[3] کە لە نوسینی (هاریت بیتشر سنو– Harit Betchir Snow) بوو. لەساڵی 1853 نوسراوەو رەخنەگران ئەڵێن: ئەم چیرۆکە ئەگەر هۆی راستەوخۆی هەڵگیرسانی جەنگی ناوخۆی ئەمریکا نەبووبێت ئەوا هۆیەکی سەرەکی بووە لەهۆیەکان وەک سەرۆک لنکۆڵن باسی کردوە.. چونکە بوەتە هۆیەک بۆ لەکارخستنی یاسایی کۆیلە.. ئەو یاسایەی بووە هۆی ماڵوێرانیو لەناوچوونی دەیان هەزار خێزانی قولەرەشەکان.

لەساڵی 1907دا فیلمی (تێکەڵکەر–The Masher) دەرکەوت کەهەڵوێستێکی توندڕەوی رەگەزپەرستانەی دژی رەنگ پێستەکان (الملونین) تیادابوو.. بەرامبەر هەموو رەگەزەکان جگە لەسپی پێست.. لەسەرو هەموویانەوە رەگەزی رەش پێست.. ئەم هەڵوێستە بەشێوەیەکی ئاشکراو دڕندانە لەفیلمێکدا جێگیر بوو کەناوی (کۆیلە– The Slave) بوو کەلەلایەن باشترین دەرهێنەری سینەمایی دەست پێکردنی سەدەی بیستەم (دیڤید جریفث D.W. Griffith–) دەرهێنرابوو.. ئەم دەرهێنەرە یەکێکە لە تونڕەوەکانی باشوور.

جریفث نارەزوویەکی بێ سنووری هەبوو لەدژایەتی قولەرەشەکان بۆیە بەخراپترین شێواز لەفیلمەکانیدا دەری ئەخستن.. بەتایبەتی ئەو فیلمانەی چیرۆکو بابەتەکانی پەیوەندی هەبووبێت بە(جەنگی ناوخۆ– Civil War)[4]ی ئەمریکاوە.. وەک فیلمەکانی: (کۆیلە– The Slave)و (شەڕ– The Battle)و لەدایک بوونی نەتەوەیەک– The Brith of a Nation)[5] و (مەزنترین شت لەژیاندا– The Greatest Thing in Life)و (شەوێکی هەڵچوو– On Oxeciting Night)و (ئەبرەهام لنکولن– Abraham Lincoln).

بەڵام لەناو گشت فیلمەکانی جریفث کە بابەتە سەرەکیەکەی قولەرەشەکانە فیلمی (لەدایکبوونی نەتەوەیەک) بەپلەی یەکەم دێت کەپڕە لەدیمەنی ریسواو سەرکوتکردنو ئازاردانی قولەرەشەکان.. هەوڵدانی بێ ئەندازە لەرێزلێگرتن.. پشتگرتنی رێکخراوە بەدناو و خوێن رێژە کۆنەپەرستە ناسراوەکە بە رێکخراوی (کوکلوکس کلان– Kuklux Klan)[6] کەئەندامەکانی دەستیان سوربوو لەخوێنی منداڵو پیرو ژنو پیاوی بێ تاوانی قولەرەش.. کەتەنها تاوانیان ئەوە بوو رەنگی پێستەکیانیان رەش بووەو بەس .

لە کاتی خۆیدا زۆربەی ناوەندەکان نارەزایی توندیان بەرامبەر نمایشکردنی ئەم فیلمە دەربڕی.. لەگۆڤارێکی سیاسیدا (ئەلبرت فۆنتۆن_ Albert Fonton) باسی ئەم فیلمە ئەکاتو ئەڵێ: ئەمە فیلمێکە بۆ ئەو مەبەستە بەرهەم هاتووە کە ئەوە بچەسپێنێت



دیمەنێک لە فیلمی لەگری شەودا
نواندنی سیدنی بواتییە

قولەڕەشەکان چەند پلە یەك لەخوار رەگەزی سپی پێستەکانن.. قولەڕەشە باشەکان تەنیا ئەوانەن کە نۆکەری بەوەفای ئاغا سپیەکانیانن.. ئەوانەشی کە دژایەتی سیستەمی کۆیلایەتی ئەکەن‌و هەوڵی دەستکەوتنی مافی ڕەوای خۆیان ئەکەن شایانی نەفرەت لێکردن‌و لەناوبردنن‌و مەترسی گەورەیان هەیە بۆ سپی پێستەکان.. وهەموو مرۆڤایەتی..

ئەم نارەزایی بەرهەڵستیە بەرامبەر فیلمەکەی جریفث نەك لەهەموو جیهاندا هەبوو بەڵکو بەخودی ئەمریکادا دەرکەوت.. لەساڵی.. **1946** کۆمەڵەی سینماتیکی ئەمریکی زنجیرە ئاهەنگێکی سینەمای بۆ فیلمە مێژووییەکان سازکردو فیلمی (لەدایلبوونی نەتەوەیەك)ی لەو ئاهەنگانەدا وەدەرهێناو لەبڵاوکراوەیەکیدا بەو بۆنەیەوە رایگەیاند: بەلێبوردنەوە بڕیارماندا ئەم فیلمە نمایش نەکەین لەم زنجیرە فیلمانەدا لەگەڵ باوەڕی تەواومان کە ئەم فیلمە یەکێکە لەگەورەترین فیلمە مێژووییەکان لەروی هونەرییەوە.. بەڵام لەبەر ئەوەی بەئاشکرا بانگەوازی رەگەزپەرستی‌و دژایەتی نەمانی سیستەمی کۆیلایەتی ئەکات‌و دژی خواست‌و ئاواتەکانی قولەڕەشەکانە.. بۆیە کاری پیشاندانی ئەم فیلمە کارێکە هیچ پاساوێکی لۆژیکی بۆ نیە!!.

کورتەی باس ئەوەیە کارمەندانی سینەمای ئەمریکی لەم ماوەیەدا بەشێوەیەك سەیری قولەڕەشەکانیان ئەکرد کەنمونەیەکن لە گێلەپیاو.. بەتایبەتی ئەم مەبەستەیان لە فیلمە کۆمیدیەکاندا بەرجەستەکرد.. لە فیلمە تراجیدیەکاندا هەموو کات سۆراخی کەسایەتی مرۆیەکی شەڕانی‌و باوەڕپێنەکراو و داوێنپیس ئەکرد بۆ ئەوەی بیدەنە ئەکتەرێکی قولەڕەش تابەشێوەیەکی فراوان گەورەترین ژمارەی بینەران‌و جەماوەری سینەما رق‌و کینەی بەرامبەریان هەبێت.

**قۆناغی دووەم:**

لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم ئەم قۆناغە دەستیپێکرد.. سەربازە قولەڕەشە ئەمریکاییەکان سەلماندیان کە هیچیان کەمتر نیە لەسەربازە سپی پێستەکان لەئازایەتی‌و تواناداا.. ئەو ماوەی دە ساڵەی نێوان جەنگی جیهانی یەکەم‌و دووەم گۆڕانکارییەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی لەرووی باشبوونی باری قولەڕەشە ئەمریکییەکان.. یەکێك لەو گۆڕانکاریانە دەرکەوتنی دیاردەیەك کەپێی ئەوترا (قولەڕەشی نوێ)..

گەڕەکی (هارلم—*Harlem*)[7] بوو بە مەڵبەندی جموجوڵ‌و چالاکی وێژەیی‌و کاری هونەری.. کە تیایدا قولەڕەشەکان سەلماندیان کە ئاگادارو زانیاری گیروگرفت‌و کێشە کۆمەڵایەتی‌و ئابوریەکانن.. ئەم بارودۆخە بوە هۆی ئەوەی هەندێ لەسینەماییەکان ئەو سوکایەتیانەی دووچاری قولەڕەشەکان هاتوە ئاشکرای بکەن. لەهەمان کاتدا گۆڕانکاری لەڕۆڵەکاندا بکەن لەبەرژەوەندی کەسایەتی قولەڕەشەکاندا ئەوە بوو (پول سلوانی – *Paul Slwany*) لەساڵی *1929*دا فیلمێکی دەرهێنا بەناوی (دڵەکان لەدیکسی[8]– *Hearts in Dixie*)و دەرهێنەری ناوداری ئەمریکی (کنج فیدور—*King Vidor*) فیلمی (هللیویا – *Helloya*)ی دەرهێناو دەرهێنەر (ڤیـنانی هیرست



هاری بیلافۆنتی لەگەڵ کچە ئەکتەر جوان فۆنتین ، دیمەنێك لە فیلمی (دورگەیەك بە رۆژدا)

- *Ve Nany Herst*) فیلمی (ترادیسیۆنی ژیان- *Limitation of life*)[8] ی دەرهێنا کە سەرکەوتنێکی جەماوەری مەزنی بەدەست هێنا.. ئەم فیلمە ساڵی ***1931*** بەرهەم هێنرا.

ئەوەی راستی بێت کەمێك باشبونی باری قولەڕەشەکان کەسیمای فیلمەکانی ئەم قۆناغە بۆ لە ئەنجامێکی فەلسەفەی پوختو پاراو نەبوو.. بەڵکو پێچەوانەیەکی ناچاری بارودۆخەکە بوو.. داوایەکی راستگۆیانەی بەئاشتی پێکەوە ژیانی گشت رەگەزنامەکان نەبوو.. یان دانانی چارەسەری پۆزەتیڤانەی راستەوخۆ بۆ هەموو کێشەکانی قولەڕەش..

بەڵکو بەشێوەیەك باسی لەو کێشەیە ئەکرد بە لۆژیکی تەمومژاوی ئەوتۆ کە هەوڵی ئەدا ئەوە بسەلمێنێ کە کەسایەتی قولەڕەش خودی خۆی رەگەزی لەرەگەزی سپی بەنزمتر ئەزانێتو سپی پێست لەخۆی بەگەورەترو بەنرختر دائەنێت.

**قۆناغی سێیەم:**

لەساڵی ***1949*** ماوەی ئەزمونی کۆمەڵایەتی دەستی پێکرد لەمێژووی سینەمای ئەمریکیدا.. بیرۆکەی داکۆکی لە قولەڕەشەکانو مافەکانیان لەچوار فیلمی مەزندا خۆی نواند کە زۆریەی ئەم فیلمانە پاڵێورابوون بۆ وەرگرتنی ژمارەیەك

لەخەڵاتەکانی ئۆسکار.. ئەم چوار فیلمەش کە هەمووی لەساڵی 1949دا بەرهەم هێنرا بوو ئەمانە بوون:

1)(ماڵی ئازا- *Home of the Brave*) کە لە بەرهەمی (ستانلی کرامەر- *Stanley Kramer*)[(10)] وە لە دەرهێنانی (مارك روبسون- *Mark Robson*) بوو کە باسی چیرۆکی سەربازی قولەڕەشی لاو ئەکات و ناوی (موسی)یەو لە جەنگی جیهانی دووەمدا لەبەرەکانی زەریای باسفیك قارەمانێتی بەرچاوی هەبووە..

2)فیلمی (سنورە نادیارەکە- *The Lost Frontier*) کە لە دەرهێنانی (الفرد ویرکر_*Elfred Werker*) بەشێوازێکی تۆماری باسی چیرۆکی ژنە زانایەکی قولە ڕەش ئەکات کە بۆ ماوەی زیاتر لە 25 ساڵ ناوبانگی لەناو کۆمەڵگایەکی سپیەکان دەرکردبو.

3)فیلمی (مشەخۆر لەخۆڵدا- *Intruder In the Dust*) کە لەدەرهێنانی (کلارنس براون- *Clarence Brown*)و لە چیرۆکی (ولیام فولکنر- *William Faulkner*)ە.. ئەم فیلمە بەشێوەیەکی واقعی باسی باری قولەڕەشەکان ئەکات لە کۆمەڵگایەکی قولایی باشوری ئەمریکا کە ژیانی ڕۆژانەیان بەزەلیلیو لە ژێر ئازارو ئەشکەنجەدا بەدەست ناوەندە توند ڕەوەکانەوە بەسەر ئەبەن.

4)فیلمی (بینکی- *Benkye*) لەبەرهەم هێنانی بلیمەت (داریل ئوف. زانوك- *Darryl F. Zanuck*)ە، ئەم فیلمە باسی ژیانی کیژێکی قولەڕەش ئەکات کە ڕەنگی پێستی لەشی گۆڕاوە بۆ ڕەنگی سپیو لەکاری پزیشکیدا لەیەکێك لە



کچە ئەکتەری قولە ڕەش (دورسی داندریج)
لە دیمەنێك لە فیلمی (دورگەیەك لە رۆژدا)

ولایەتە باشورەکانی ئەمریکا کار ئەکات.. لەوێ ئەکەوێتە داوی خۆشەویستی لاوێکی سپی.. بەڵام پاش ماوەیەك ئەو خۆشەویستیە بە دەیان کۆسپی دێتە رێ بەهۆی پیادە بوونی سیستەمی رەگەز پەرستیو دژایەتی کردنی قولەڕەشەکان.

ڕەخنەگرانی سینەمای جیهانی ئەم چوار فیلمەیان خستە بەر باسو لێکۆڵینەوە بەوەی کە (دیاردەیەك)ی پێویستە توێژینەوەی لەسەر بکرێت.. ڕەخنەگری ناودار (جون لی- *John Lee*) لەم بارەیەوە نووسیویتی:

(ئەم فیلمانە بەهای خۆی هەیە.. ناتوانرێت پشت گوێ بخرێت.. ئەم فیلمانە یەکەم جارە لە مێژوویی سینەمای ئەمریکیدا هەوڵ ئەدەن قولە

ڕەش لە هەڵوێستی قارەمانێتیدا دابنێن.. لە ژینگەیەکی ناقۆلای نا ئارام کە سپیەکان تیایدا باڵا دەستن.

بەڵام ڕەخنەگر (ف.ج. جیروم-F.G.Jeroom)[11] بەگشتی تێڕوانینێکی جیاوازی هەیەو باوەڕی وایە کە ئەم فیلمانە وای دەرئەخەن کە هەوڵی بەرجەستە بوونی یەکسانی نێوان ڕەش‌و سپی ئەدات.. بەڵام لە ڕاستیدا وانیە.. بەڵکو تۆی ناکۆکی‌و ناڕێکی لە نێوانیاندا ئەچێنێت!!

جیروم دووپاتی کردەوە کە ئەو چوار فیلمە بەتوندی بەرگری لە کۆشە نیگای چینی دەسەڵاتدارە سپیەکان ئەکات.. ئینکاری بوونی کێشەی ڕەوای قولە ڕەشەکان ئەکات بەوەی کاتێك لەلایەن سپیەکانەوە دەست درێژی ئەکرێتە سەر مافەکانیان وای ڕوون ئەکاتەوە کە ئەمە بارێکی ڕەوشتیەو بە ڕووی چینە باش‌و لەبارەکە بۆتەوەو وا لە بینەر ئەکات کە قولەڕەشەکان بە بونەوەرێك دابنێت شایستەی بەزەیی‌و لێبوردنە.. نەك خاوەن مافی زەوت کراو..

بە باوەڕی من بەڵگەکانی ئەم فیلمانە لە هەڵوێستە ڕەخنەدارەکان تێدەپەڕێت بۆ ڕامانێکی گشتی کە ئەم کارانە هەوڵێکی هەنگاو لە دوای هەنگاوی تیادایە بۆ تێگەیشتنی ڕاستیەکان لەسەر کێشەی قولەڕەشەکان لەکرۆکدا کاتێك توێژینەوە لەسەر ئەم فیلمانە ئەکەین ئەبێ چەند ڕاستیەك هەیە بیدرکێنین کە کارتێکەرێکی گەورەی لەسەر سینەمایە ئەمریکیەکان هەیە وەك:

*1*)بەرهەم هێنەرەوەکان سڵیان لەوە ئەکردەوە ئەو فیلمانەی بابەتەکانی چارەسەری کێشەی قولەڕەش ئەکات.. بەتایبەتی لە ئەمریکا لەوانەیە بازاڕی گەرم نەبێت.. لەبەر ئەوەی تێکڕا قولەڕەشەکان قبوڵ ناکرێن‌و خۆشەویست نین..

2)ئەم فیلمانە بەرەو چارەسەری پێچاو پێچ‌و فێڵاوی ئەچێت بۆ هاوکێشە بوون‌و خۆپاراستن لە یاساکانی چاودێری‌و بەرهەم هێنانی کارە سینەماییەکانی ئەمریکا کەلەو کاتانەدا پەیڕەو ئەکرا.

**قۆناغی چوارەم:**

ئەم قۆناغە لەگەڵ ئەوبڕیارەدا دەستی پێکرد کە دادگای باڵای ئەمریکا لەساڵی ***1954*** دەریکردو تیایدا خوێندنی یەکسان کرد بۆ هەموو مرۆیەکی ڕەش‌و سپی.. ئەم بڕیارە مەزنە هەنگاوی یەکەمی گرنگی پێدانی بەرهەم هێنەرەکانی هولیود بوو بەکێشەی قولەڕەشەکان.. ئەوە بووە هۆی دەرکەوتنی شەپۆلێکی گەورە لەو فیلمانەی کە بابەتەکانی پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بەکێشەکەوەو لەبارەی کێشەکەی لەناو کۆمەڵگای ئەمریکادا ئاشکرا کرد لەگەڵ چۆنیەتی پەیوەندی ڕەش‌و سپی لەو کۆمەڵگایەدا.

بێگومان لەم قۆناغەدا هەندێك لەبەرهەم هێنەران‌و دەرهێنەرەکان وەك (ستانلی کرامەر-*Stanley Kramer*)و دەرهێنەر (ئیلیا کازان-*Elia Kazan*)[12] و (ئوتو پرمنجر-*Otto Perminger*)[13] ڕۆڵێکی گەورەو باشیان هەبوو بۆ پەرەسەندنی ئەو فیلمانەی باسی کێشەی قولەڕەشەکان ئەکات.. لەبەر ئەوەی داکۆکیان لەمافی ڕەش پێستەکان‌و هێرش کردنیان بۆ سەر هەموو کارو مومارەساتێکی ڕەگەز پەرستانە لەناو کۆمەڵگای ئەمریکی بوە هۆی هاندانی



ئەکتەری بەناوبانگ کە ئیستا بەزۆری دەوری کەسایەتی قولەڕەش ئەبینێ لە فیلمەکاندا (دینزل واشنتۆن)

خەڵکی هەمان ڕێگا بگرن و ژمارەی ریسواکەرانی ئەم ڕێبازە سستەمە ڕۆژ بەڕۆژ لەزیادبوندا بێت..

لە فیلمەکانی ستانلی کرامر:

(ماڵی ئازا- *Home of the Brave*)و (پێوەندم شکاند-*I'd Broken My Hancuff*) (بانگێشتێك بۆ کوشتن-*Invitation to Kill*).

لە فیلمەکانی دەرهێنەری ناودار ئیلیا کازان:

(بینکی-*Benkye*)و (روباری هەڵچوو-*The Rage River*)

لە فیلمەکانی دەرهێنەر ئوتوبرمنجر: (کارمن جونز-*Carmen Jonse*) (بورجی و بێس-*Porgy and Bess*)و فیلمی (با خۆرنشین خێرابێت-*Hurry Sun Down*) لەڕێگای ئەم فیلمانەوە بۆمان رون ئەبێتەوە کە ئەم کەڵە دەرهێنەرانە حەزو ئارەزووی تەواویان هەیە بۆ تیمارکردنی زامە قوڵەکانی کۆمەڵگای ئەمریکی لەڕێگای شاڵاوی ڕێك و بەهێز دژی ڕەگەزپەرستی و باشکردنی باری ژیانی ڕەشەکان و بەرجەستە کردنی یەکسانی نێوان هەموو هاوڵاتیان بەبێ جیاوازی ڕەنگ و باوەڕ.. ئەوە بو بەهەنگاوی خێرا ئەم جۆرە ئاراستەیە شوێن پێی خۆی گرت لەقەبارەی بەرهەمی سینەمای ئەمریکی ساڵانی دوایدا..

لەم قۆناغەدا هەڵوێستی سینەمای ئەمریکی بەرامبەر کێشەی قولەڕەشەکان هەشت ئاراستەی بەخۆوە بینی:

**ئاراستەی یەکەم:**

هەوڵیدا قەبارەی ئەوزیانانە دەربخات کە قولەڕەشەکان توشی هاتن لەئاکامی زەبروزەنگە نادادوەریەکەی دادگای ئەمەریکی وەك لەم فیلمانەی خوارەوە دەردەکەون:

(چاوەشی ڕەش - *Sergeat black*)ە کە لەدەرهێنانی(جۆن فۆرد - *john ford*)[14] و فیلمی(کوشتنی کۆلارە - *to kill amockingbird*)کە لەڕۆمانی( هارپلی-*harper Lee*)یەو لەدەرهێنانی(ڕۆبێرت مولیجان*robert-- Mullingan*--) و (لەگەرەی شەودا-*in the heart of the Night*) کە لەدەرهێنانی(نورمان جویسون-*Noman jewison*)ە .

فیلمی (کوژرانی کۆلارە )بە بەهێزترین و ئازاترین فیلم دادەنرێت لە سینەمای ئەمریکیدا کە بەئاشکرا بەرەنگاری ستەم و ناراستیەکانی سیستەمی دادوەری لەئەمەریکا ئەبێتەوە لەچارەسەرکردنی کێشەی قولەڕەشەکان .

لەم فیلمەدا پایزەرێکی سپی کە (گریگوری بیك- *Gregory Peck*) ڕۆڵەی ئەبینێت لەدادگادا چەند وتەیەك ئەڵێت ئەبێتە هۆی ڕاکێشانی هێزی

بینەر بۆ هەمو بەهاو نرخەکانی کە گەلانی ئەمریکا لەچوارچێوەی ویلایەتە یەککگرتوەکاندا بۆیان بەجێماوە.. کاتێك ئەڵێ: ((هەرکاتێك کێشەکە کێشەی پیاوێکی ڕەش ئەبێت بەرامبەر پیاوێکی سپی..ئەوا دادوەرە سپیەکە بەتەواوی بێ لێکدانەوە دەست بەرداری هەموو لۆژیکێك(منطق)ئەبێتەوە لەپێناوی سەرخستنی ئەوپیاوە سپیە گەرچی ماف و یاساشی لەگەڵ نەبێت )) بەم شێوەیە ئەم فیلمە پەردەدەم هاوارئەکات و ڕاستیەکان ئەخاتە بەردیدەو ویژدانی سپیەکان و ڕەگەز پەرستەکان کە ئەم واقعەیان پێ هەرس ناکرێت

**ئاراستەی دووەم:**

درێژەپێدانی ئاڕستە کۆنەکەیە کەسینەمای خستبوە خزمەتی ئامانجەکانی لەداگیر کردنی وڵاتان و دەست بەسەر گرتنی گەلانی کیشوەری ڕەش..کیشوەری ئەفریقا لەپێشەنگی کاروانی ئەو فیلمانەی زنجیرە فیلمەکانی ( تەرەزان – *Tar zan* )[15] کە ئەوساو ئێستا هەر سورە لەسەر ئەوەی کەتەنها پیاوی سپیو ڕەگەزی سپی ڕزگارکەری ئەفریقایەو پیشڕەویتی لەدواکەوتن و لە نەهامەتیەکان .

بەڵام ئەمە واتای ئەوە نیە کە هەمور فیلمە ئەمریکیەکانی لەسەر ئەفریقا دەرکراوە وەیان لەناویدا وێنەی گیراوە

یان چارەسەری بەبابەتێکی کردوە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەو کیشوەرەوە بوبێت..نیاز پاك نەبوە .. نەخێر فیلمی چاك و خراپی هەیە ..هەوڵی جدی دراوە بۆ وێنەگرتنی ئەفریقای نوێ وەك فیلمەکانی:

(ڕەگەکانی ئاسمان – *TheRoots of Herven*)و (پاشاکانی دارستان– *(Kings of Jungle*و (بەفرەکانیکلیمنجارو– *The snows &KilimanJdro*) کە لەنوسینی ڕۆمان نووسی جیهانی خاوەن خەڵاتی نۆبڵی لە ئەدەبدا ( ئارنست همنگوای - *Ernest Hemingway*)یە کەئیلهامی نوسینی لەگەشتێکی بۆ ئەوکیشوەرە وەرگرتوە.. ئەم فیلمە باسی نوسەرێکی ئەمریکی ئەکات پەلەقاژێ ئەکات لەگەڵ مەرگدا لەئەنجامی ژەهراوی بوونی خوێنی لەشی کاتێك لە چادرێکدایە لە دامێنی شاخی کلیمنجارو .. ئەم فیلمە لێکۆڵینەوەیەکی سایکۆلۆجیە بۆ پیاوێك لەسەرەمەرگدایە.. لەهەمانکات دا بیرو بۆچونی پێشکەوتن خوازانەی همنگوای بە ڕونی بەدی ئەکرێت لەم چیرۆکەدا لەوێنەگرتنی ژیانی نوێی گەلانی ڕاپەڕیو ڕزگار بوی ئەم کیشوەرە ڕەشە ..

لەم ئاڕاستەیەداچەند فیلمێك بەرهەم هێنراوە کەبوەتە مایەی سەرسوڕمان کە لە ئامانجە شەکاوەکانیان..وەك فیلمەکانی (خەرتوم– *Kahartoum*)[16] و (بەکرێگیراوەکان– *Pensioners*) هەرچەندە کەوێنەی هەندێك لە کێشەکان

دەرئەخات و زەقیدەکاتەوە بەڵام لە چەند هەڵوێستێکدا هەندێك بابەت پێچەوانە ئەکاتەوە کەئەبێتە مایەی دەستەبەرکردنی پڕوپاگەندەی.ژەهراوی بۆ بەرژەوەندی ئیمپرالیزم و داگیرکەران .

**ئاراستەی سێهەم :**

چەند فیلمێك ناو ئەبەین وەك : نمونە / دەربارەی پەیدابوونی پەیوەندی خۆشەویستی

لە نێوان کوڕێکی سپیو کچێکی ڕەشدا وەك فیلمەکانی:

(دورگەیەك لەرۆژدا-*Island In the Sun*)وفیلمی (ژنێکی مەحرەم-*The Invisble Woman*)وفیلمی (سێ دڵی ئازار دراو-*Thee Hearts prevent*)و ( جیهان و جەستەو شەیتان-*The World The Fleshand The Devil*)و فیلمی تۆپەڵێکی شین-*Blue prudence*).

ئەم فیلمانە چونەتە ناخو ناوەرۆکی ئەوکێشانەی لەئەنجامی پەیوەندی خۆشەویستی نێوان لاوێکی سپیو لاوێکی ڕەشدا پەیدائەبێت و لەدوایدا ئاکامەکەی بەشێوەیەکی دڵ تەزێن بێ سود و بێ هودە تەواو ئەبێت لەم بارەیەوە پرۆفیسۆر (فرید زنیی-*Fred zeniy*) لێکۆڵینەوەیەکی چروپڕی هەیە بە ناوی(لەپێناویەئاشتی ژیان ..لەنێوان ڕەش و سپیدا)..لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەڵێ:((بەلای منەوە واپێویستە قولەڕەشەکان مافیان پارێزراو بێت...وسپیەکانیش دان بەخۆیاندا بگرن ... خۆشەویستیو تەبایی کوێرە لەئاستی ڕەنگەکاندا..لەسپی ئەبینی ونەڕەش!!)) لەسینەمادا تەنها ڕێگا ئەدرا پیاوێکی سپی کچێکی رەش بخوازێت.. پێچەوانە قەدەغەبو.. نەئەتوانرا بیر لەوە بکرێتەوە کە وێنەی پیاوێکی رەش دەربخات کە ببێت بەهاوسەری کچێکی سپی پێست.. وەبگرە تەنانەت چیرۆکێکی خۆشەویستیش لەنێوانیاندا پەیدا ببێت..

بەڵام دەرهێنەری پێشکەوتوخواز (ستانلی کرامر-*Stanly Kramer*) لەم بنەمایە لای داو بوێرانە فیلمێکی دەرهێنا کە هەراو زەنایەکی فراوانی لەسەر دروست بو دەربارەی لاوێکی ڕەش پێست لەدوای چیرۆکێکی خۆشەویستی بەهێز کچێکی سپی پێست ئەخوازێت.. فیلمەکە بەناوی (کێ بۆ خوانی ئێوارە میوانە؟- *Guess Who's Coming to Dinner*).

**ئاراستەی چوارەم:**

فیلمەکانی ئەم ئاراستەیە بەڕاشکاوی باس لەو گرفتانە ئەکات کە بوە بە بازنەیەك بۆ کێشەی قولەڕەشەکان. بەڵام لەهەمان کاتدا هیچ چارەیەکی بۆ ئەم گرفتو کێشانە دانەناوە بگرە پێشنیاریشی کردووە.. ئەمەش بوە مایەی مشتومڕی نیوان رەخنەگران.. هەندێکیان تۆمەتی ئەوە ئەخەنە پاڵ ئەم فیلمانە تەنها چەند دروشمێکی هەڵواسراوی پڕوپاگەندەن بەرامبەر ڕای گشتی جیهان ریزکراونو بەس.. لەم فیلمانەی ئەم ئاڕاستەیە:

(پاریسی شین-*Paris Blues*)و (عەرەبیك - *Arabian*) (پیاوێك ناوی ئادەمە - *A man called Adam*)و (دڵ تەنها ڕاوچیەکە - *The Heart is a Lonely Hunter*)و (روداوەکەی ئۆکس بو- *The Ox- Bow Incident*) بەڕایی من فیلمی (باریسی شین) فیلمێکی نمونەیی ئەم ئاراستەیەیە.. باسی چیرۆکی لاوێکی قولەڕەشی ئەمریکی ئەکات کە ئەکتەری قولەڕەش (سیدنی بواتییە- *Sidney Poitier*) ڕۆڵی سەرەکی نمایش ئەکات کە کۆچی کردووە بۆ فەرەنسا بەهۆی ئەشکەنجەو چەوسانەوەی ڕەگەزپەرستی لە وڵاتەکەی خۆیدا.. لەساتێکی دڵتەنگیدا ئەم گفتوگۆیە لەگەڵ هاوڕێکەیدا ئەکات کە کیژێکی لاوی قولەڕەشەو دانیشتوی فەرەنسایەو بەڵام خەڵکی ئەمریکایە:

کچەکە: بیرو سۆزت نیە بۆ وڵاتەکەت؟



ئەکتەری بەتوانا (جیم براون)، لەدیمەنێك لە فیلمی (بەکرێگیراوەکان)

سیدنی: بۆ بیری بکەم.. ئاگاداری چی بەسەر قولەڕەشەکان دیت لەوێ.. بەتایبەت لەباشوردا؟

کچەکە: بارو دۆخی قولەڕەشەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەوێ باشتر ئەبێت.. ڕۆژێك ئەبێت بگەنە ئامانجو هەموو مافەکانیان بەدەست بهێنن.. ئەبێت بەرەنگاری ڕاستیەکان ببیتەوە.. خودی خۆت بدۆزیتەوە.. پێویستە لە خۆت ڕانەکەیت.. چەند لەپاریس بمێنیتەوە نابیت بە فەرەنسی.. ئەوە باش بزانە جێگات ئەمریکایە نەك ئێرە.. بۆت دەرئەکەوێت درەنگ بێت یان زوو..

لەم گفتوگۆیەدا کێشەی لاوەکانی ئەمریکا خۆی ئەنوێنێت.. هەندێکیان هیچ هیوایەکیان بەکۆمەڵگای ئەمریکاوە نەماوە.. هەندێکیشیان باوەڕی بەدوا ڕۆژە.. با ئەو دوا ڕۆژە دوریش بێت.. بەڵام سەرو سیمای ئەو دوا ڕۆژە چۆنە؟ لێرەدا فیلمەکە بێ دەنگ ئەبێت.. هیچ چارەسەرێکی بنەڕەتو ماقوڵی پێ نیە.. ئەوەندە ئەبێت لۆژیکی میتافیزیکی هەندێك لەبرینە خوێناوییەکانی ئەمریکا لەبەر کۆمەڵگای جیهانی بەساکاری تیمار ئەکات..

**ئاراستەی پێنجەم:**

ئەم فیلمانە پەیوەستن بەم ئاراستەیەوە لەو ڕۆمانو شانۆگەریانەوە وەرگیراون کە تەوەری سەرەکیان ژیانی قولەڕەشەکانە.. ئەم فیلمانە هەوڵی ئەوەیان داوە ڕاستی کێشەی قولەڕەشەکان بەزەقی بخاتە پێش چاو.. بەشێوازێکی هەستیارو ئارامو لۆژیکی.. بەشێوازێك دور لەشێوازی تۆمار کراوی پڕ لە سوکایەتی بۆ ڕەگەزی ڕەش.. لەهەمان کاتدا وەك لەسەر زاری ڕەخنەگری ڕۆژنامەی (نیوزیك) هاتوە ئەم فیلمانە لەو ڕاپۆرتانە ناچێت کە مژدە بەرە مەسیحیەکان بلاویان ئەکردەوە یان وەك ڕاپۆرتە پڕ سۆزەکانی ئاوەندە پەیوەندیدارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لەڕاستیدا سوکایەتی تەواو بوو بۆ خەباتی قولەڕەشەکانو زیرەکی بینەرانی سینەما.. بەڵکو دەست پاكو ڕاشکاو بوو لە دەربڕینەکانی بەرامبەر خەباتو ژیانی قولەڕەشەکان لە ئەمریکا .. لەم فیلمانە:

(ئانا لاکۆستا– *Anna Lacusta*)و فیلمی (ترێکان لەبەر ڕۆژ– *Grapes in the Sun*) و فیلمی (بورجی وبیس– *Porgy and Bess*) وفیلمی (تەنیا پیاوێك– *Only a man*)و (داری زانیاری– *knowledge*).

**ئاراستەی شەشەم:**

فیلمەکانی ئەم ئاراستەیە.. قولەڕەش لەڕۆڵی مرۆیەکی ئەمریکی ئاسایی پێشکەش ئەکات وەك .. پزیشك.. مامۆستا.. ئەفسەری پۆلیس.. ئەندازیار..کرێکار.. مۆسیقاژەن و گۆرانی بێژ.. لەم ڕۆڵانەدا کە مرۆڤ بەجۆرەها شێوازی جیاواز ژیان بەسەر ئەبەن.. لەم فیلمانە.. فیلمەکانی (سیدنی بواتییە) وەك (زەنبەقەکانی کێلگە- *Lilies of the Feld*)و (بۆ گەورەم لەگەڵ خۆشەویستی- *To Sir With Love*)و (خاڵی روخاندن-*Downfall Point*).. وەهەروەها فیلمی (فیلادلفیا-*Philadelphia*) کە لەفیلمە نوێیەکانەو لەساڵی *199*بەرهەم هێنراوەو ئەکتەری قولەڕەشی بەتوانا (دینزل واشنتۆن- *Denzel Washington*) ڕۆڵی پارێزەرێکی زیرەكو سەرکەوتوو ئەبینێت لە چارەسەرکردنی کێشەیەکی تایبەت کە پەیوەندی بەنەخۆشی ئایدزەوە هەیە لەم فیلمەدا ڕۆڵی سەرەکی ئەکتەری سپی پێستی بەتواناو ناودار (توم هانکس-*Tom Hanks*) نمایشی ئەکات و هەر لەسەر ئەم ڕۆڵەی خەڵاتی ئۆسکاری ئەو ساڵەی لە ئەکتەری پیاودا بەدەست هێناوە.

هیوادارین ئەم ئاراستەیە ئاراستەی ئایندە بێت لە سینەمای ئەمریکادا.. چونکە ئەم جۆرە فیلمانە هەوڵی بێ وچان ئەدات ئاشتیی و تەبایی و پێکەوە ژیان لەنێوان ڕەش و سپی بەرجەستە بکات.

ئەکتەر (دینزل واشنتۆن) کە ئێستا قارەمانی زۆربەی ئەم جۆرە فیلمانەیە ئەڵێ: ڕۆڵەکانی من لەم فیلمانەدا پیاوێکی سپی زۆر سەرکەوتوانە ئەتوانێت بیبینێ.. بەبێ ئەوەی دەستکاری سیناریۆ بکرێت. ئەم شێوازە ئامادەییەکی جەماوەری گەورەی بۆ پەیداکردوم لەناو ئەمریکاو بگرە لەهەموو جیهاندا.. من لەو باوەڕەدام ئەم کارانە پاڵێکی توندی ناوە بەجەستەی مردوی ڕەگەز پەرستی بەرەو گۆڕی کۆتایی.

**ئاراستەی حەوتەم:**

لەگەڵ سەرهەڵدان و پەیدا بوونی بزوتنەوەی هێزی ڕەش لە ئەمریکا.. دیارە لای کارمەندانی سینەما واپێویست بوو ئەم ڕووداوانەی پەیوەندی بەم بزوتنەوەیەوە هەیەو بە قۆناغێکی مێژووی نوێ دائەنرێت لەململانێی نێوان ڕەش و سپی بەجدی وەربگیرێت و بەرجەستە بکرێت. راپەڕینێك سەری هەڵداو بەتوندی شێوازی نارەزایی دەربڕین و مل شۆڕی ڕەت کردەوەو دەستی کرد بەشێوازێکی نوێ لەبەرگری کردن و ئەنجام دانی کاری توندو تیژی دژی ناوەندە ڕەگەز پەرستیەکان.. لەهەردوو فیلمی (ڕوداو- *Accident*) لەدەرهێنانی (لاری پیرس- *Lary Perse*)و (بەرەبەیانی ڕەش- *The Black Bawn*) لە دەرهێنانی (روبرت ئالان ئارثر- *Robert Alan Arther*) گۆشە نیگای هولیودو سینەمای ئەمریکی دەربارەی ئەم بزوتنەوەیە ڕوون و ئاشکرا ئەبێت.

لەکاتێکدا (لاری پیرس) لە فیلمەکەیدا هەڕەشەو گورەشە لەشۆڕشی ڕەش ئەکات لەئەمریکا بەشێوازێکی پێچاو پێچ و چەپەڵانە ئەبینین (روبرت ئالان ئارثر) ڕەگەز پەرستی خۆی ئەخاتە ڕوو لە فیلمی (بەرەبەیانی ڕەشدا).

قارەمانانە قولە ڕەشەکەی فیلمەکە (سیدنی بواتییە)[17] کەسایەتیەکی ئاسایی نیە. قولەڕەشیکی ڕۆشنبیرەو پەیوەندی بەبزوتنەوەی ڕەشەوە هەیە.. باوەڕی بەدروشمی مەرام

پاساوی شێوازە (الغایە تبرر الوسیلە) هەیە.. بۆیە دزی ئەکات.. ئەکوژێت.. هەموو خراپەو کارێکی دڕندانە ئەکات لەپێناو دەستکەوتنی پارە.. بۆ یارمەتی دانی خێزانی قولەڕەشە گیراو بەندەکان‌و ئاوارەکان لەئەندامانی بزوتنەوەی هێزی ڕەش.

لێرەدا (ئالان ئارش) هەوڵی ئەوە ئەدات لەڕێگای پێشکەش کردنی ئەم کەسایەتیەوە.. بزوتنەوەی ڕەش‌و سەرۆک‌و ئەندامەکانی لەکەدار بکات‌و بەدڕندەیان دابنێت‌و کارە شۆڕشگێڕانەو ڕەواکانیان بەکاری تیرۆرو ناشارستانی بداتە قەڵەم.. ئامانجی کۆتایشی ئەوەیە هەموو کارو چالاکیەکی نامرۆیی هەیە بیخاتە پاڵ قولەڕەشەکان‌و خەباتە ڕەواکەیان. هەر بەوەشەوە ناوەستێ بەڵکو بەڕاشکاوی لەفیلمەکەدا ئەڵێ: قولەڕەشەکان بەهەموو دەستەو تاقمێکیانەوە تەنها کۆمەڵێك چەتەو پیاو کوژن.. دزو خاوەن ڕق‌و کینەو گێل‌و شێتن..

لە فیلمی (رودلو) شێوازی هەڕەشەو تۆقاندنی زۆری تیادایە بۆ سەرکردەکانی بزوتنەوەی ڕەش وەك (ستوکلی-*Stokly*)و ( کارلمایکل-*Caram*)و (راب براونی-*Rab Brawne*).. لەم فیلمەدا پیاوێکی قولە ڕەشی ڕۆشنبیرمان پێ ئەناسێت.. کە پیاوێکی توند ڕەوە.. هەموو کات دروشمەکانی بزوتنەوە ئەڵێتەوە.. رقی تەواوی لەبەرگری نەگەتیفە.. باوەڕی بەناڕەزایی دەربڕین نیە.. ئەڵێت: مرۆڤ پێویستە بزانێت کێ تاوانبارەو تاوان ئەنجام ئەدات.. دەست بەجێ کاری پێویستی بەرامبەر بکرێت.. زۆرجار بەرەنگاری هاوسەرەکەی ئەبێتەوە کە ژنێکی لەسەرخۆیەو داوای چاوەڕوانی لێدەکات بۆ باشتر بوونی باری قولەڕەشەکان.. پیاوەکە هەموو



سیدنی بواتییە لەیەکێك لە فیلمەکانیدا

جارێ بەتوندی وەڵامی ئەداتەوەو ئەڵێ: خودی تۆو ڕەگەز پەرستەکان گەرەکتانە صەد ساڵ ڕۆژی سەرکەوتن دوا بخەن!!.

فیلمی (بەرەبەیانی ڕەش) بەشێوازێکی ئەزیەریانە (ارتجال) باسی ئەو هۆیانە ئەکات کە یارمەتی‌دەر بوون بۆ پەیدا بوونی بزوتنەوەی ڕەش.. ڕوداوەکانی ئەم فیلمە لەولایەتی

(کلیفلانـــد—Cliffland)[18] لــە ســـاڵی 1968 لەئەمریکا لەدوای ئەو ئاڵۆزیو بارە نائاسییەی لە ئەنجامی تیرۆرکردنی سـەرکردەی ئاشتی خـوازی قولـەکان (مـارتن لوثـر کنـج—Martin Luther King) بەرپابوو..

ساڵ لـەدوای ساڵ باری قولـە ڕەشـەکان لـە ئـەمریکا بـەرەو باشـتر ئـەچێت یاسـاکانی لەبـەرژەوەندی ئەوانـە زیـاتر جێگـیر تـر دەبێـتو یاسای نوێ دائەنرێت.. بۆ زیـاتر ناسـاندنی بینـەر بـەم بارو دۆخـە.. لـەم دواییـەدا کۆمـەڵێك لـەو فیلمانە بەرهەم هێنراوە کەباس لەوە ئـەکات نـەك تەنها بەرەو هێور بوونەوەو چاکـتر چـوە.. بـەڵکو کۆمەڵانێکی زۆر لە سپیەکان ئێستا چونەتە ریـزی ئەوانەی کە لەکۆنـەوە لایـەنگری یەکسـانی نێوان ڕەشو سپی بـوون.. لـەو فیلمانـە لێرەدا باسـی تەنها سێ فیلم ئەکەم کە لـەکۆتایی حەفتاکانـەوە تا کۆتایی نەوەدەکان بەرهەم هێنراون:

یەکەم فیلم/ (گەمەی هەڵۆکان—A Game for Vultures) کە لەساڵی 1979 لەلایەن کۆمپانیای کولومبیـای ئەمریکیـەوە بەرهـەم هێـنراوە لـەنواندنی ئەکتـەری قولەڕەشـی بـەتواناو نـاودار (ریتشارد راوندتری—Richard Roundtree)یـەو لـە دەرهێنـانی (جیمـس فـارجو—James Fargo)یـەو ئـەم فیلمـە باسـی خـەباتی گـەلی (زیمبـابۆی) ئـەکات.. بـەرەی نیشـتمانی لەسەردەمی حوکمڕانی سپیەکاندا لـە ڕودیسیای پێشـوو شۆڕشـێك هەڵئەگیرسـێنێ.. ریشـارد راوندتـری) لـەم فیلمـەدا ڕۆڵـی سـەرکردەیەکی سەربازی ئەو شۆڕشە ئەبینێ..

دووەم فیلـم/ (شـانازی— Glory) لەبەرهـەمی ساڵی 1989یـە لەلایـەن کۆمپانیـای کولومبیـای ئەمریکی لەدەرهێنانی (ئیدوارد زیـوك—Edward Zwick)و لەنواندنی ئەکتەری قولەڕەش (دینـزل واشنتون—Denzel Washington)ە.. ئەم فیلمە بەڕاستی یەکێکـە لـە فیلمـەکانی کـە بەڕاشـکاوی سـەروەریو قارەمـانێتی ئەخاتـە پـاڵ قولەڕەشەکان لەپاراستنو پارێزگاری یەکپارچەیی خـاکی ئـەمریکا.. چیرۆکی فیلمەکە باسـی پێـك هێنـانی هـێزێکی تایبـەت ئـەکات لەسـەربازە قولەڕەشـەکان بـۆ بەشـداری جـەنگ لەشـەڕی نـاوخۆی ئـەمریکا لـە سـاڵانی ئـەو جەنگـە خوێناویـەداو ئـەم هـێزە لـەریزی حکومـەتی ناوەندی ئـەمریکا بـو بـۆ ڕزگارکردنی کۆیلـەکانو نەهێشتنی ڕەگەز پەرستیو لـە کۆتـاییدا هـەموو ئەندامانی ئەو هێزە گیان بـەخت ئەکەن لـەپێناو ئەو بەها پیرۆزانە.

سـێیەم فیلـم/ (خێوەکـانی مسیسـپی—Ghosts of Mississippi) ئەم فیلمـە بەرهـەمی ساڵی 1998و لەدەرهێنانی دەرهێنەر (ویبر رینر—Rob Reiner)ەو لەنواندی الیـك بـالدوین—Alec Baldwin)و (جیمـس ودز—Jamees Woods) ئـەم فیلمـە باسـی ڕوداوێك ئـەکات کـە لەسـاڵی 1963دا ڕوی داوە ئـەویش تـیرۆر کردنـی یـەکێك لەسەرکردە ئاشـتی خوازەکانی ڕێکخراوی مـافی قوله ڕەشـەکانە لەویلایـەتی میسیسبی ئـەمریکی بـەناوی (میرجـارد) لەلایـەن تونـد ڕەوێکـی سـپی ڕەگـەز پەرسـتەوە بـە ئاشـکراو لەبـەر چـاوی خـەڵکی.. هەرچـەندە ئـەگیرێ بـەڵام دادگـا زۆر بەئاسـانی ئـازادی ئـەکات.. لەسـاڵی 1990دا داواکارێکی گشتی لاوی سپی پێست کە ڕۆڵەکەی (ئەلیك بادوین) نمایشی ئەکات ئـەم ڕوداوەو زۆری ڕوداوەکـانی تـر بـەتاوانو بـەناڕەوای دائـەنێت بەهەموو هێزێکیەوە بەهاوکاری خێزانی ئەو تـیرۆر کـراوە کێشـەکە زینـدو ئەکاتـەوەو پیـاو کوژەکـە

راپێچی دادگا ئەکاتەوەو لەدوای چوار ساڵ تێکۆشانی بێ وچان ئەو تاوانبارە ئەخاتە سەر سێدارەو تۆڵەی لێ ئەسێنێتەوە.. ئەم فیلمە گۆڕانکاریەکی تەواوی گۆشەنیگای هولیودو سینەمای ئەمریکیە لەسەر کێشەی قولەڕەشەکان لەگەڵ کۆتایی سەدەی بیستەمو هاتنی سەدەی نوێ.

**ئاراستەی هەشتەم:**

درێژەی ئەو ئاراستەیە کەلەگەڵ پەیدا بوونی دەنگ بۆ سینەما دەستی پێکرد.. یەکەم فیلمی دەنگدار کە فیلمی (گۆرانی بێژی جاز- The Jazz Singer)بوو کە قارەمانەکەی گۆرانی بێژێکی قولەڕەشی هەژار بوو.. سینەمای ئەمریکی کەلەپوری موسیقای قولەڕەشی قۆستەوە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی وەك (بلوز-جاز- گۆرانیە ئاینیەکان) لەدەیان بگرە لە سەدان فیلمی جەماوەری سەرکەوتوو.

لەم فیلمانەدا تیشك خرایە سەر دەیان گۆرانی بێژو ئاواز دانەرو مۆسیقا ژەن وەك (بول روبسن- Robson Paul) و (لویس ارمسترونج-Lewis Armistrong)و (نات كنج كول - Nat King Coll)و (ایتبل ویلدر-Etable Wilder)و (سامی دیفزی بچووك-Sammy Davis Jnr) هتد..

دوور لە تەوژمی ڕەگەز پەرستی کە سیمای زوربەی فیلمەکانی ئەمریکاییەکان بو.. بەلام ناچار دەبین دان بەوەدا بنێین کە ئەو سینەمایە ژمارەیەکی گەورەی لە ئەستێرە درەوشاوەکانی ئەم هونەرە لە قولەڕەشەکان دروست کردو پێگەیاند.. کە ناوبانگیان هەموو ناوەندە هونەریە جیهانیەکانی گرتەوەو زوربەیان خەلاتی ئۆسکارو خەلاتی سینەماییو شانۆییو مۆسیقاییەکانیان بەدەست هێنا.. ئەم دەرکەوتنو سەرکەوتنو درەوشانەوەیە هەروا بەئاسانی نەبوو.. ڕێگای ئەمان وەك ڕێگای سپیەکان تەختو سێبەر نەبوو.. ڕێگایان پڕکۆسپو تەگەرەو دڕكو داڵ بوو.. جگە لە تەوژمی ڕەگەز پەرستی لەڕوویاندا..

لێرەدا ناوی کۆمەڵێك لەو ئەستێرانە. لەقولەڕەشەکان دیاری ئەکەم کە لە دەرکەوتنی سینەماوە تا ئێستا ڕۆڵی بەرچاو ئامادەیی هەمیشەییان هەبوە لەزوربەی فیلمەکانی بەرهەمی هولیوددا:

بیتر فلای ماکوین – *Butter Fly Mcqueen*
بول روبسن – *Paul Robson*
هاتی ماکدانیل – *Hattie Mcdaniel*
نات کنج کول – *Nat King Coll*
ئیتابل ویلدر – *Etable Wilder*
لویس ئارمسترونك – *Lewis Armistrong*
جیمس ئیدواردز – *James Edwards*
جانو هیرناندیز – *Juano Hernandez*
سامی دیفیز – *Sammy Davis. Jnr*
هاری بیلافونتی – *Harry Belafonte*
سیدنی بواتییە – *Sidney Poitier*
دوژی داندریدج – *Dorothy Dandrige*
جیم براون – *Jim Brown*
ریشارد راوندتری – *Richard Roundtree*
جیم کیلی – *Jim Kelly*
ملفین فان بییلز – *Milfen Van Beels*
ئیدی مووروی – *Edie Murphy*
میل بروکس – *Mel Brooks*
دینزل واشنتون – *Denzel Washington*
سبایك لی *Spack Lee*–

ئەبێ ئەو هەڵوێستانەشمان لە یاد نەچێت کەهەندێك لە ئەستێرە قولە ڕەشەکان نواندیان بۆ ڕێزگرتن لە ڕەگەزەکەیانو ئاراستە دانانی گرنگ

لەریزەوی سینەمای ئەمریکی لەبەرژەوەندی کێشەی قولەرەشەکان.. لەوانە ژنە ئەکتەری دەرکەوتوو (بیتر فلای ماکوین) کە لەپێشدا لەچەند فیلمێکی مەزندا وەك رۆیی بە با- Gone With The Wind) رۆڵی کارەکەری بینی.. لەدوایدا رەزامەند نەبوو درێژە بەم جۆرە رۆلانە بداتو نمایشی بکات..

هەروەها بەرێزەوە پێویستە سەیری هەڵوێستەکانی ئەکتەرو گۆرانی بێژی ئاشتی خوازی مەزن (پول روبسن) بکەین کە جگە لەبەشداریە گرنگەکانی لەسینەماو شانۆدا.. بەشداریەکانی لەفیستڤاڵە جیهانیەکاندا کە بۆ ئاشتیو سەربەرزیو سەربەستی گەلانو لەناو چوونی رەگەز پەرستیو چەوساندنەوەو داگیرکردن دەیان گۆرانی بەرزو ناوداری چری لەگۆرەپانەکان لەسەر شانۆ مەزنەکانی جیهان، بوە هێمای ئاشتی خوازانو سەربەستی پەرستانو ناوبانگی هەموو ناوەندە هونەریو سیاسیەکانی گرتەوە.. ئەوەبوو تەنانەت شاعیرێکی کوردی وەك (گۆران)ی ئەمر بەهەڵبەستێك لە ساڵی **1954**دا پول روبسنی بەرز نرخاند لەژێر ناوی (بانگێك بۆ پۆڵ روبسن)و ئەڵێ:

*ئەی بولبلی ئاشتی خوازی، پۆڵ روبسن!*

*ئەو شێتانەی لەخوێندنت ئەترسن*

*دەمیان گرتی، نیازیان هەبوو ئاوازە*

*قەدەغەکەن لە گوێچکەی دنیای تازە*

*پۆڵ رۆبسن! ئەی پۆل رۆبسن! ئەی پۆل رۆبسن!*

*باڵەوانی ئاشتی! بلبلی وتن!*

بەم شێوەیە پۆڵ روبسن خزمەتێکی گەورەی هونەری قولەرەشەکانی ئەمریکای کرد چ لە گۆرانیو ئاوازدانانو سینەما..

### سینەمای فەرەنسیو قولەرەش

بزوتنەوەی رەش کەلەشاری پاریس دروست بو لە نێوان ساڵەکانی (*1930-1935*) رۆڵێکی گەورەو بەرچاوی هەبوو بۆ دانانی ئاراستەیەکی تایبەتی بۆ کارمەندانی بواری سینەمای فەرەنسی کاتێك ویستیان وێنەی چەند کەسایەتیەکی قولەرەش بخەنە فیلمەکانیانەوە. ئەو بزوتنەوەیەی کە لەلاوانی وڵاتە دەست بەسەرەکانی ئەفریقیا لەلایەن فەرەنساوە پێك هاتبوو لەرۆشنبیرو شاعیرو نوسەرو لێکۆڵەرەوەکانی دانیشتوی ناو پاریس.. بە سەر کەوتوانە توانی جەخت لەسەر چەمکی رۆشنبیریو شارستانێتی ئەفریقا بکات..

ئەمەش زەنگی دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێی لێدا بۆ نەمانی ئەو ئەفسانەیەی لە هەموو کاتو بونەیەکدا ئەو وترایەوە کە گوایە پیاوی سپی زاڵە بەسەر پیاوانی هەموو رەنگەکانی تردا بۆیە پێویستە لەهەموو کارو ئەرکو جوڵانەوەیەکدا پیشەنگ بێت. سەرکردایەتی بەدەستەوە بێت.. بێ هیچ لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەو هیچ جیاوازیەکی هزرومێشکو مافو باوەرێك.. بۆیە سینەمای فەرەنسی رەشو سپی پێکەوە نیشان ئەدات.. بە ئاسودەیی ئەژین.. پێدەکەنن.. لەیانەکان پێکەوە سەما ئەکەن بێ شەرم کردن بەبێ بوونی دیوارێکی جیاکەرەوەی رەگەز پەرستی.. ئەمانەمان لە فیلمە بەناوبانگەکان بەدی کرد وەك فیلمی:

(گەمەی مەزن—*The Great Game*)ی دەرهێنەر (جاك فایدر—*Jack Faider*)و(تونی—*Tony*)ی دەرهێنەر (جان رینوار—*Jan Renuar*)و دیمەنی گازینۆ ناودارەکە لە فیلمی (ئەتلانتا—*Atlanta*)ی (جان فیجو—*Jan Fejo*)و دیمەنەکانی ئوپێرای پاریس لە فیلمی (مردنی قاز—*Death of Swan*) (جان بنوالیفی—*Jan Bnwalify*).. کارەکانی ئەم فیلمانەو فیلمەکانی تر پەیوەندیەکانی مروڤی بەمرۆڤەوە زیاتر بەرجەستەو ئاشکراو توند تۆڵ کرد لەم جیهانە پانو بەرینە.

ئەو پەیوەندیە توندو تۆڵانە فەرەنسیەکان کاری وەستایی باشیان تیادا کرد لەدانانو چەسپاندنی، دوور لە گێرمەو کێشەی ڕەگەز پەرستی کوێرانە.

دوای جەنگی جیهانی دووەم چالاکی هێزی مرۆیی لە فیلمە فەرەنسیەکاندا دیارو ئاشکرا بوو لەچارەسەری کێشەی ڕەگەز پەرستی بەرامبەر ڕەش پێستەکان.. ئەم ئاراستە مرۆییە گەیشتە لوتکە لە فیلمەکانی: (سۆزانی ڕێزدار— *The Vietuouse Chasty*) کە لە ساڵی ***1952*** بەرهەم هێنرا لەدەرهێنانی (بالیرو برایانا—*Balero Brayana*)و (ئورفیوسی قولەڕەش—*Orpheus the Negro*) کە لەساڵی ***1959*** لەلایەن دەرهێنەری فەرەنسی ڕەش پێستو بەرەگەز ئەمریکی (ملفین فان بیلز—*Melfen Van Beels*) دەرهێنراوەو فیلمی (*1+1*)ی دەرهێنەر (جان لوك جودار—*Jan Look Judar*) کە لەساڵی ***1968*** بەرهەمی هێناوە.

### سینەمای سوڤیەتی جارانو قولە ڕەشەکان

دوای شۆڕشی ئوکتۆبەر سینەمای سوڤیەتی توانی ببێتە ئاوێنەیەك بۆ گۆڕانکاریەکان لەکێشە سیاسیو کۆمەلایەتیەکانی ناو ڕوسیاو هەوڵی دا



ئەکتەری قولە ڕەشی مەزن (سیدنی بواتییە)

ئەو هۆیانە بخاتە بەرچاو کە بوەهۆی پێکدادانی چینایەتی لەنێوان هەژارانو دەربەگەکان.. لە هەمان کاتدا هێرشی سەر ئاراستەکراوە ڕەگەز پەرەستیەکان.. لەرێگای چەند فیلمێکەوە هەوڵیدا جەخت بکات کە مرۆی قولە ڕەش هیچی کەمتر نیە لە مرۆی سپیو ئەتوانێت هاوکاری لە دروست کردنی ژیانی نوێدا بکات.

لە گرنگترین ئەو فیلمانەی بابەتی ڕەگەز جودایی خستە بە باسو لێکۆڵینەوە فیلمی (سیرك—*The Circus*) بو کە لەساڵی ***1936*** لە لایەن کۆمپانیای (موسفلم) بەرهەم هێنراو لە دەرهێنانی دەرهێنەر (جریجوری الکسندروف—*Gregory Alksndrof*)ی شاگردی دەرهێنەری مەزن (ئیزنشتاین—*Eisenstein*)[19] ە ئەم دەرهێنەرە هاوبەشیو هاوکاری ئیزنشتاین ی کرد لە دەرهێنانی هەردوو فیلم ((ئوکتوبەر—*October*)و (کۆنو نوێ—*Old and New*) ئەم فیلمە فیلمێکی میلۆدرامای پڕ لە هەڵوێستی

کۆمیدیە کە باس لەبەسەرهاتی کیژێکی ئەمریکیە لەیەکێك لەسیرکەکاندا کار ئەکات بۆ سەردانێکی هونەری هاتوەتە یەکێتی سوڤیەتی جاران.. وڵاتێکی نوێ پەیدا ئەبێ بۆ خۆیو منالە ڕەش پێستەکەی.. وڵاتێك جیاوازی ڕەنگی پێستو ڕەگەز پەرستی تیادا نیە..

کاتێك (سرجین بوتکیفنش-*Sergin Botkefensh*) شانۆگەری (عوتەیل-*Othello*)ی کردە فیلمێکی سینەمایی.. ویستی بەرەنگاری ئەوانە بێتەوە کە بەپلەی یەکەم عوتەیل بە مرۆیەکی قولەڕەشی ئاست نزمو دوا کەوتوو دڵ پیس دابنێن.. بەڵکو لەم فیلمەدا بەپیاوێکی داوێن پاكو ڕاستگۆی دائەنێن کە بەرەنگاری خیانەتو داوێن پیسی ئەبێتەوەو وێڵە بەدوای سۆزو عاتیفەو بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتی.

بەم لۆژیکە سەریەستانە.. بەم پێوانەیە سینەمای سوڤیەتی جاران مامەڵە لەگەڵ بابەتەکان ئەکاتو چەندەها فیلمی تۆماریو زانیاری پێشکەش کردوە لەوانە فیلمی (لومومبا-*Lumomba*)[20] و (ڕویەڕو بوونەوە لەگەڵ ڕەگەز پەرستی-*Face to Face With Element*). فیلمی دووەمی ساڵی ***1968*** بەرهەم هێنراوە کە بەشێوەیەکی کۆمەلایەتی سیاسی چەند ڕاستیەك وەك بەلگەنامەی زانیاری ئەخاتە پێش چاوو شێوازی هاوچەرخانەی ڕەگەزپەرستی لە هەموو جیهاندا ڕیسوا ئەکاتو هەموو ئەو تیورانەی ناو دەبرێن بەتیوری زانیاریە باوەکان بەدرۆ ئەخاتەوەو پوچەڵیان ئەکاتەوەو لە هەمان کاتدا تیشك ئەخاتە سەر ئەو دۆزینەوە زانیاریانەی کە لە سەدەی پێشو لە (ئەڵمانیاو سومەترەو ئەفریقای باشورو بیابانی کەلەهاری) کراو هەموو ئەو دۆزینەوەو بیردۆزانە ڕیسواو ڕەت دەکاتەوە.

**ئەفریقای ڕەشو.. ڕەگەکانی کیشەکە!**

بۆ ماوەی سەدان ساڵ ئەفریقای ڕەش داگیر کراو خەڵکەکەی کران بەکۆیلەو ژیانی کۆمەلایەتی شێوێنراو.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کیشوەرە چڕو پڕ ترین ڕۆشنبیری میللی بەخشی بەهەردوو کیشوەری ئەورپاو ئەمریکا.. وەك گۆرانیە ئاینیەکان. گۆرانی کرێکاران.. گورانی بلوزو جازو هونەری میللی.. بەسەدان وەرزشکاری کە ناویانگیان سەرتاسەری جیهانە..جگە لەوەی لەم ساڵانەی دوایی سەدەی بیستەم نوسەرە ئەفریقیەکان پێشەنگی کاروانی نوسەرانی ڕۆمانو چیرۆكو شیعرو لێکۆڵینەوەی وێژەییو زانیاری بوونو بەدەیان کتێبی بەبەهایان بەچاپ گەیاندووە..

بەلاَم تا ئێستا هەنگاوەکانی سینەمای ئەفریقی تەواو نیەو لەرزۆکە هۆیەکەشی ئەگەڕێتەوە بۆ باری خراپی ئابوریو هونەریو کۆمەلایەتی قورس کە زۆربەی وڵاتەکانی ئەم کیشوەرە بەدەستیەوە ئەناڵێنن بەتایبەتی لاوازی ئابوریان.. بەلاَم ئەم بارە ناهەموارو قورسە هێشتا ڕێگای لەوە نەگرتووە کە بەکەمیو هەندێ جار ئەتوانم بڵێم بەدانسقە فیلمی باشو ڕەسەن لەهەندێ لەو وڵاتانەدا دەرکەوتوەو بەرهەم هێنراوەو بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی سەربەخۆیو سەربەستیان لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا بەدەست هێناوە. و لەئایندەشدا ڕاچاوارِوان ئەکرێت بەرهەمی هونەری سینەمای باشتر دەربکەوێت..

ئەو وڵاتانەی کە کارمەندی سینەمایی چالاكو دەرهێنەری باشو فیلمی دیاری بەرهەم هێناوە..

ولاتانی (سەنغال)و (سومالّ)و (غینیا)و(نیجیریا)و(مالی)یە..

بەلاّم تائێستا شێوازی زۆربەی زۆری ئەم فیلمانەی لایان بەرهەم هێنراوە شێوازی تۆماریوزانیاریە وەك لەسەرەوە باسمان كرد. بەلاّم تاكە تاكە فیلمی چیرۆكو رۆمانو بابەتی تایبەت بەكێشەكانی كیشوەرەكەشی تێدایە..

لەپێش ئەم ولاتانەی ئەم كیشوەرە ولاتی (سەنغال)ە كە یەكەم جار لە فیستڤالّی سینەمایی موسكو لە سالّی **1965** بە فیلمی (ناریوجان–***Nariogan***) بەشداری كرد كە لەدەرهێنانی (بولان ڤیرا–***Bolan Vera***) بو كەباسی لە داستانێكی كۆنی ئەفریقایی ئەكاتو بەشێوەیەكی پڕ هەستو شارەزایی هونەری بەرهەم هێنرابو.

دوای ئەم فیلمە سەنغال فیلمی (بودوم شاریت–***Bodom Sharit***) بەرهەم هێنا كە لەنووسینو دەرهێنانی شاعیری سەنغالی ناسراو (عوسمان سمبتین–***Osman Sembiten***) بو.. ئەم فیلمە باسی ژیانی شۆفێرێكی سەنغالی هەژار ئەكات.. فیلمەكە توانی یەكێك لە خەلاّتەكانی فیستڤالّی (تور)ی سینەمایی كە هەموو سالّێك لە فەرەنسا ساز ئەكرێت.. وەربگرێت.. وە ئەم دەرهێنەرە لە سالّی **1961**دا فیلمی (خاتونە رەشەكە– ***Black Lady***)ی دەرهێنا كە لە فیسڤالّی (كان)ی سالّی **1967**دا نمایش كرا.. ئەم فیلمە خەلاّتی یەكەمی فستڤالّی هونەرەكانی تولەرەشی لە هەمان سالّدا وەرگرت كە لەشاری (داكار) سازكرابوو.

لەدوا فستڤالّی سینەمای (تاقشەند) فیلمێكی تری عوسمان سمبتین بەناوی (پۆست–***The Post***) خەلاّتی یەكێك لە فیلمە باشەكانی پێبەخشرا.

سەرچاوەكان


1–جورج سادول– تأريخ للسينما في العالم / منشورات عويدات بيروت **1968**.

2–مامي السينما؟ / اندرية بازان / مكتبة الانجلو–القاهرة **1970**.

3–الفن السينمائي / لودفكين / دار الفكر – القاهرة **1970**.

4–الزنوج والهنود الحمر قضايا شائكة / برت جوميز - ترجمة الدكتور احمد فرنسيس / دار اليقضة– القاهرة **1981**.

5–سيرجي ايزنشتاين، مذكرات مخرج / المؤسسة المصرية للتأليف والترجمة والنشر / القاهرة **1963**.

6–تضايا عالمية في السينما / ادوارد جوزيف / ترجمة عامر احمد بيسنى دار الفكر / القاهرة **1985**.

***1-Film Guid 11 th Edition / by Halli's / Harperr Collins Publshers / London 1993.***

***2-Fimcor's Companion / John Walker / Great Britan by Bath Press / Avon 1991.***

***3-John Russel Taylr / Cinema Ear, Cinema Eye, Methuena,Co London 1964.***

***4-M. Martin / Le Langage Cinematographiaue. 1962*** باريس (اللغة السينمائية)-.


پەراوێزەكان:

(1) ئەبرەهام لنكولن، ***Abraham Lincoln*** / سەرۆكی شانزەهەمە لەسەرۆكەكانی ولاتە یەككرتووەكانی ئەمریكا (**1809–1865**) لە سالّی **1861**دا پۆستی سەرۆكایەتی وەرگرت تالەسالّی

**1865**دا تێپەڕ کرا.. ئەم سەرۆکە بڕیاری جەنگی‌دا دژی ولایەتە هەڵگەڕاوەکانی باشووری ئەمریکا کە دەستیان دابووە چەك لەبەرئەوەی ڕەزامەند نەبوون لەسەر دەرکردنی یاسای نەهێشتنی کۆیلایەتی لە ئەمریکا لەلایەن سەرۆك لنکولنەوە.. ناوی ئەبرێت بە ڕزگارکەری کۆیلەکان.

(2) پانتۆیم / زاراوەیەکی زانیاری هونەرییە واتای نواندنە بەبێدەنگ. (التمثيل الصامت).

(3) کوخەکەی مام تۆم، **Vncle Tom Cottage** چیرۆکێکی بەناوبانگە لە ساڵی **1852** لەلایەن هاریت بیتشرسنو وە نوسراوە.. چەند جارێك کراوە بە فیلمی سینەمایی لە ساڵانی **1909**و**1913**و**1918**و**1927** دا.

(4) جەنگی ناوخۆ، **civil War** / ئەو جەنگەیە کە لەنێوان باشورو باکوری ئەمریکا ڕوی‌دا دوای هەڵگەڕانەوەی ولایەتەکانی باشور لەبەر ناڕەزاییان لەسەر دەرچوونی یاسای نەهێشتنی کۆیلایەتی لەلایەن حکومەتی مەرکەزیەوە..

(5) فیلمی (لەدایك بوونی نەتەوەیەك—**The Birth of Nation**) یەکێکە لە فیلمە مەزنەکانی جیهانی سینەما لە ڕووی هونەرییەوە لەدەرهێنانی دەرهێنەر (د.و.جریفث— **D. W Griffith**) لەساڵی **1915**دا بەبێدەنگ بەرهەم هێنراوە.

(6) ڕێکخراوی (کوکلوکس کلان—**Ku Klux Klan**) ڕێکخراوێکە لەلایەن توند ڕەوە ڕەگەز پەرستەکانی ولایەتەکانی باشوری ئەمریکا دروست بوە دوای دەرچوونی یاسای نەهێشتنی سیستەمی کۆیلایەتی‌و ژێرکەوتنی باشور لەجەنگی ناوخۆی ئەمریکادا.. ئەم ڕێکخراوە لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە دروست بوو چالاکیەکانی تا کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم بەردەوام بووە.

(7) هارلم—**Harlem**/ گەرەکێکی گەورەی شاری نیویۆرکەو بەمەڵبەندی سەرەکی قولەڕەشەکان دادەنرێت.. یانەی سەماو مۆسیقاو گۆرانی‌و یانەی وەرزشی ناودارو ناوەندی ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی‌و بارەگاو چاپخانەو زۆربەی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی تایبەت بەقولەڕەشەکان لەم ناوچەیەدایە.. جگە لەباندی قاچاغو بازرگانی مادە بێهۆشکەرەکان‌و سەندیکای جۆراو جۆری تێدایە..

(8) وشەی (دیکسی—**Dixie**) زاراوایەکە واتە / ولایەتەکانی باشوری ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

(9) فیلمی (ترادسیونی ژیان—**Imitaion of Live**) جگە لەوەی لەساڵی **1931** بەرهەم هاتوە.. دووجاری تر کراوە بە فیلم.. لە ساڵانی **1946**و **1959**دا..دوا بەرهەم لە دەرهێنانی (دوجلاس سیرك—**Douglas Sirk**)و لەنواندنی ژنە ئەکتەری بەتوانا (لاناتێرنر—**Lana Turner**) بوە.

(10) دەرهێنەر (ستانلی کرامر—**Stanley Kramer**) یەکێکە لە دەرهێنەرە سینەماییە ئەمریکی‌و جیهانیەکان‌و شوێن دەستی لەم هونەرەدا دیارو ڕەنگینەو بەدەیان فیلمی سەرکەوتوی دەرهێناوە لەوانە بۆ نمونە:

ا)دادگاییەکانی نورمبرغ – **Judgment at Nuremberg**، کە لەساڵی **1963**دا بەرهەم هێنراوە.

ب)نیرە ڕۆژێکی گەرم – **High Noon**، کە لەساڵی **1952**دا بەرهەم هێنراوە.

ج)ئەمە جیهانێکی شێت شێت شێتە – It's a Mad. Mad. Mad.World، کەلەسالی 1963 بەرهەم هێنراوە.

(11)بڕوانە کتێبی (فیلم لە جەنگدا – Film in War) کە لە نووسینی ڕەخنەگری سینەمایی ناودار: (جون هوارد لوسون – John Haward Loson)ە.

(12)دەرهێنەر (ئیلیا کازان – Elia Kazan) یەکێکە لە دەرهێنەرە سینەماییە مەزنەکانی هولیودو جیهانی سینەما بەرەگەز ئەرمەنیەو لە تورکیا لەدایك بووەو لە سالانی بیستەکانەوە چوە بۆ ئەمریکاو ئێستا ڕەگەزنامەی ئەمریکی هەیە.. بەدەیان شاکاری مەزنی دەرهێناوە.. ئەوانە:

أ)ڕێکەوتنی بەڕێزەکان – Gentimans Agrreement کە لەسالی 1947 بەرهەم هێنراوە.

ب)ئەمریکا، ئەمریکا – America . America کە لەسالی 1963 بەرهەم هێنراوە.

ج)لای تەوژم – On the Waterfront کە لەسالی 1954 بەرهەم هێنراوە.

(13)دەرهێنەر (ئوتو پریمنجر – Otto Preminger) یەکێکە لە دەرهێنەرو بەرهەم هێنەرە بەتواناکانی هولیود کە زۆربەی زۆری بەرهەمەکانی لەسەر کێشەی قولەڕەشەکانە و ئەتوانم بلێم: لایەنی ڕەوای کێشەکەیانە.. لە فیلمە ناودارەکانی:

أ)کارمن جونز– Carmen Jones، کە لەسالی 1954 بەرهەمی هێناوە.

ب)کاردینال – The Cardinal کە لەسالی 1963 بەرهەمی هێناوە.

(14)دەرهێنەر (جون فورد – John Ford) یەکێکە لەمەزنترینو ناودارترین پێنج دەرهێنەری سینەمایی لە جیهاندا..و(4)جار خەلاتی ئۆسکاری باشترین دەرهێنەری وەرگرتوە لە سالانی (1935)و (1940)و (1941) و (1952).

لە فیلمەکانی کە بەفیلمە مەزنەکان دائەنرێت:

أ)چۆن دۆلەکەمان سەوز بوو – How Green Was My Valle کە لەسالی 1941 دەریهێناوە.

ب)هێشوەکانی تورە – The Grapes Of Warth کەلەسالی 1940 دەریهێناوە.

جـ)پیاوێکی ئارام – The Quiet Man کەلەسالی 1952 دەریهێناوە.

د)خۆشەویستە میهرەبانەکەم – My Darling Clementine کە لەسالی 1946 دەریهێناوە.

(15) (تەرەزان – Tarzan) کەسایەتیەکی سپی پێستی دروست کراوە کە لەلایەن هولیودەوە کە بەرێکەوت کەوتۆتە ناودارستانە چڕوپڕەکانی ئەفریقیاو لەداوێیدا بوەتە پێشەنگی ئاژەلو مرۆیی ئەو کیشوەرەو ڕێگا پیشاندەرو چرای تاریکی ژیانیانە.. ئەمەش بەزەقی هنزو بیرو باوەڕی رەگەز پەرستانو داگیرکەران بەرجەستە ئەکات.. ئەم کەسایەتیە لەچەند فیلمێکدا دەرکەوت بەو ناوەی سەرەوە.. دیارترین ئەکتەر لەم ڕۆلەدا پالەوانی یاری مەلەی خولی ئولومپی جیهانی پێشووە لە پاریس سالی 1928 (جونی ویسملر – Johny Weissmuller)ە.. ئاواتو

ئامانج لەم فیلمانە ئەوەیە بیسەلمێنن کە ڕەگەزی سپی سەرکەوتو ترە لە ڕەگەزی ڕەش.

(16) خەرتوم – Khartoum ، مەبەست لە شاری خەرتوم ی پایتەختی وڵاتی سودانە.

(17) ڕۆڵی سیدنی بواتیە لەم فیلمەدا بەپێچەوانەی سروشتی ڕۆڵە مەزنو پیرۆزەکانیەتی کە کەسایەتی شۆڕگێڕی قولە ڕەشی بەرجەستە نەکردو بوە ئەوەی ناوبانگی هەموو جیهان پڕ بکاتەوە.. لەم ڕۆڵەدا خزمەتی کێشەی قولەڕەش ناکات.. بەڵکو بەپێچەوانەوەیە.. (نووسەر).

(18) کلیفلاند – Cliffland ، یەکێکە لە ولایەتەکانی وڵاتە یەککرتوەکانی ئەمریکا.

(19) (ئیزنشتاین Sergei Eisenstein) مەزنترینو بەناوبانگ ترین دەرهێنەری سینەمای سوڤێتیجارانە.. یەکێك لەبەهاترین فیلمەکانی کە جێگای خۆی هەیە لەلیستی فیلمە جیهانیە ناودارەکانو تا ئێستا بەڕێزەوە ناوی ئەبرێت فیلمی (کەشتی جەنگی پوتمکین – The Battle ship Potemkin)ە کە لەساڵی 1925 بەرهەمو دەریهێناوە.

(20) (لومومبا – Lumomba) سەرکردەیەکی قولەڕەشی ڕێگای ڕزگاری خوازی ئەفریقیا بوو.. لە ساڵی 1960 لە کونغو بوە سەرەك وەزیران.. بەپیلانی کۆنە پەرستانو ئیمپریالیزم کودەتایەکی سەربازی دژی کراو بەدەستی (موبوتوسی سیکو)ی نۆکەری بێگانەکان کە لەدواییدا لە شوێنی ئەو بو بەسەرەك وەزیران کوژرا.

**بە بۆنەی تێپەڕینی سەد ساڵ بەسەر مەرگی فەیلەسووفی گەورە ( فریدریك نیچە )دا ژمارەی ئایندەی گۆڤاری سەردەم فایلێکی تایبەت ئەکاتەوە چاوەڕوانی بەشداریی نووسەران و خاوەن قەڵەمەکانین لەم فایلەدا.**

# وێستگەکانی سەردەم

- کۆچی دوایی شاعیری گەورەی ئێرانی (ئەحمەد شاملو)
- کۆتەو عەشق
- دەرەوەی شوێن کتێبێکی تازەی ئیدوارد سەعید
- نازیزم و کۆمۆنیزم
- ئۆکەری کۆرانی تورکیا
- کۆمەڵە شیعرێکی کوردی بە عەرەبی
- ژیانەوەی مەولانا جەلالەدین

# مەرگی شاعیر

• سەردەم

رۆژی **2000/7/26** لەشاری تاران، شاعیری ناودارو داهێنەری ئێرانی– ئەحمەد شاملو– لەتەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

شاملو بە درێژایی تەمەنی ئەدەبیو روناکبیری خۆی، کە نزیکەی نیو سەدەیە، هەمیشە یەکێك بووە لەو هەنگاوە گورجانەی کە دەنگی شیعری نوێی ئێرانی بەهەموو دنیا گەیاندوە، زۆربەی کارە شیعریەکانی وەرگێراونەتە سەر زمانەکانی بێگانە، بێجگە لەوەی کە شاملو کاریگەریەکی هەرە دیارو بەرچاوی لەسەر ئاستی شیعری ئێرانی دروست



ئەحمەد شاملو

کردوە. بۆیە لەگەڵ رابەری شیعری نوێی فارسی نیما یوشیجو شاعیرانی ناوازەی وەك سوهرابی سوپهریو فەروغی فەروخزادو اخوان ثالث (م. أمید) دا ناوی شاملو دەبرێت.

شاملو هەر لە تەمەنی لاویدا– لەبیست ساڵیدا– کەوتە دنیای سیاسەتو زیندانی کردنو رۆژنامەنووسی. لە ژورنالیزمی ئیرانیدا: (بەرێوەبەری نووسینو بیرازی گۆفارو رۆژنامەی ئەدەبیکردووە لە ئەدەبیاتی چیرۆك رەخنەو لێکۆڵینەوە، تەنز، شانۆنامەدا بەرهەمی دیاری هەبوە. لەبواری

وەرگێڕانیشدا بەرهەمی شایستەی پێشکەش بە کتێبخانەی فارسی کردوە. لەوانە وەرگێڕانی شیعری شاعیرانی گەورەی وەك پاپلۆ نیرۆدا، لۆرکا، مایکۆفسکی، سان جۆن پێرس، ڤرلین، رامبۆ ویۆدلێرە.

سەرەتای ئەزمونی شیعری شاملو لە کۆتایی سالآنی چلی سەدەی رابوردوە وە دەست پێ دەکات،و بەردەوام گەشەی بەتواناو روناکبیری خۆی لەو بوارەدا داوە تاگەیشتۆتە لوتکەی (شاملۆیی) کە پەیڕەو لێ کەرانی ئەو ناوەیان لێناوە.

یەکێك لەکارە هەرە دیارەکانی شاملۆ کە تاکۆتایی تەمەنی سەرگەرمی ئەنجامدان،و تەواوکردنی بوو، نووسینی بەرهەمێك بوو بەناوی (کتێبی کۆلآن) کە تائێستا زیاتر لە دە بەرگی لێ بلآوبۆتەوە، ئەم کارە بریتیە لە ئەنسکلوپیدیایەکی زمان، زاراوە، ئیدیۆم، دەربڕین، پەندی فارسی، فەرهەنگێکی زانستی عامیانەی خەلکە کە دەماودەم هاتوون،و شاملو تۆمارو بەرەگو ریشەدا چون،و لێکدانەوەی خۆی لەسەر کردوون. ئەوەی لەم کارە گەورەیەدا زۆر یارمەتی داوە ((ئایدا))ی ژنیەتی، ئایدا سێیەم ژنی شاملو، لە دە سالّی دواییدا کە شاملوو تووشی چەند نەخۆشیەك هاتبوو ئەنجامەکەیشی برینەوەی قاچێکی بوو، ئایدا بێجگە لەهاوسەر، پزیشك،و هاوڕێی بەردەوامی سەفەرو تەنانەت ئارایشت کاریشی بوو.

ناوی ئایدا لە چەند شیعرێکی شاملۆدا هەیە،و چەند دیوانێکیشی بەناوی (ئایدا لە ئاوێنەدا)و دیوانی (ئایدا درەخت،و خەنجەرو بیرەوەری) هەیە.

شاملو چەند جارێك لەلایەن لیژنەی بالآی خەلآتی نۆبلّی سویدیەوە بۆ وەرگرتنی ئەو خەلآتە کاندید کراوە. لەسەر ئاستی ولآتانی دەرەوەیش چەند خەلآتێکی ئەدەبی وەرگرتووە.

لەبەرهەمە شیعریەکانی شاملو دیوانی (باغ آینه، آیدا درآینه، آیدا درخت،و خنجرو خاطره، ققنوس در باران، مرثیەی خاك، شكفتن درمه، ابراهیم در آتش،و، دیس و در آستانه‌یه).

بەرانبەر بە مەرگ هیچ نیە بیلّێیت، بە تایبەتی لەمەرگی شاعیرو وشەدا هەموو پرسیارەکان سەراسیمە،و گشت نهێنیەکان خۆیان دووبارە دەکەنەوە. دەبێت بێدەنگ بیت، هەرچەندە ((بێدەنگی بەهەزاران زمان قسەدەکات)) ئەوەی بەتەنیا لەو بێدەنگیەدا دەتوانین بیلّێین، دووبارە کردنەوەی خودی شاملوە:
**((چی بلّێم؟ هیچ قسەیەکم لا نیە)).**

# عەشقی شاعیر

• سەردەم



گۆتەی شاعیری گەورەی ئەڵمانی، لە ساڵی (*1823*)دا تووشی خۆشەویستیەکی سەیر هات. لەو ساڵەدا کە تەمەنی (72) ساڵ بوو کەوتە داوی خۆشەویستی کچێکی تەمەن حەڤدە ساڵەوە. کچەکە ناوی ئولریکە ڤون لیڤتزو (***Ulirke von Levetzow***)بوو.

گۆتە لە ساڵی (*1821*)ەوە بۆ حەسانەوە سەری لە مارینیباد لەهەرێمی بوهمین (***Boehman***)داوە، خاوەن ماڵو خانە خوێکەی ئەوێی ناوی (ڤون برویزیسکە) بوو، ئولریکە یەکێك بوو لەسێ کچەزاکەی ئەو. لەساڵی ***1823***دا گۆتە بۆ دواجار سەفەری مارین بادی کرد.

لەوێ دڵی بە ئولریکەی تەمەن *19* ساڵدا چوو، کچێکی زۆر جوان کە تا ئەو کاتە دێرێکی لە نووسینەکانی گۆتە نەخوێندبوەوە، تەنانەت نەی دەزانی ئەم زانا گەورەیە (ئەو خۆی ئەم نازناوەی لێنابوو) گۆتەیە، گۆتە رۆمانی– سالانی ئاوارەیی ویاهلم مایستەر– کە رۆمانێکی ناوداری خۆی بوو بۆ خوێندنەوە دابوویە. خوێندنەوەو تێگەیشتنی رۆمانەکە بۆ ئولریکە ئاسان نەبوو، ناچار گۆتە چەند بەشێکی هەڵبژاردەی رۆمانەکەی بەزمانێکی سادە تر بۆ ئەو وەك خۆی دەڵێت ئەو – کیژۆڵەیە– گێڕایەوە.

ئولریکە زۆر بەوە دەنازی کە کەسایەتیەکی وەك گۆتە

خۆشی دەوێت، خۆشەویستیەکەی بۆ ئەو (کیژۆڵەیە) تا دەهات زیاتر لە دڵیا بڵێسەی دەسەند. گۆتە لە پزیشکەکانی دەپرسی کە ئاخۆ ژن هێنان لە تەمەنی ئەودا زیانبەخشە یان نا؟ پزیشکەکان دڵنیایان دەکرد. سەرئەنجام گۆتە چیرۆکی خۆشەویستیەکەی خۆی بۆ (دوق کارل ئاگوست) فەرمانڕەوای ڤایمارو هاوڕێی گێڕایەوە. سەرەتا گاڵتەی بە گۆتە کردو پێی پێکەنی. بەڵام گۆتە تێی گەیاند کە مەسەلەکەی لا گرنگە. منداڵەکانی گۆتە زمانی ڕەخنەو ناڕازی بوونیان پژا. دوق مزگێنی دەرامەتێکی دڕۆی بە ئولریکە دا کە ئەگەر گۆتە پێش ئەو بمرێت دەبێتە میراتگری. یان بەوتەی خۆی ماڵێك بۆ ئەو بووکە جوانە دروست دەکا بەرانبەر بە کۆشکەکەی خۆی. تەمەنی ئولریکە ببوە 19 ساڵو گۆتە 74 ساڵ. کەس نازانێت دەربارەی خۆشەویستی شاعیری پیر چی لەدڵی ئەو کچەدا بوە.

ئولریکە نزیکەی سەد ساڵ ژیاو لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کۆچی دوایی کرد. لە کۆتایی تەمەنیا دەربارەی عەشقی خۆی و گۆتە بۆ ئەوانەی خۆیان لەم بابەتانە هەڵدەقورتاند دەی وت: ئەو ((هەستی بەخۆشەویستی)) گۆتە کردوە. بەڵام سەرزەنشتەکانی خانەوادەی گۆتە وایان لێ کرد کە نەی هێنێت، ئەویش پەیوەندی بە شووکردنەوە نەبوو بەڵکو وەك باوکێك لە گۆتەی ڕوانیوە.

سەرئەنجام گۆتە بەدوا ماچی ئولریکە ماڵ ئاوایی کردو سواری گالیسکە بوو، گەڕایەوە ڤالیمار، لەناو گالیسکەکەدا ئەم شیعرانەی نووسی کەیادی سەر هەڵدانی ئەو خۆشەویستیەیە. ئەمانە بەشێکی کەمن لەو شیعرانە:

جارێکی تر تۆ دەوێریت،
ئەی سێبەری تەنیا کریاو
ئازادانە خۆت بگەیەنیتە روناکی رۆژ
لەنێو چیمەنی تازەی لەگوڵ لێوان لێودا
لەگەڵ مندا ڕووبەڕوو بیت
لەنیگایشم خەجڵەت نەبیت
وایە، هەر لەوە دەچوو
تۆ لە بەرەبەیاندا بژیت
لەو شوێنەدا کە شەونمی سەرمەزراکان
ئێمە تێر ئاو دەکات
دوا تیشکی خۆر بۆنگاکەمان
دەکاتە شەیدای عەشق
من بە تەنیا بۆ مانەوەو
تۆیش بە تەنیا بۆ دابڕان دروست بووین
پێشدەستیت کرد..
ئێستایش بە بەرتەوە ماوە
ژینی مرۆڤ، وەک
چارەنووسی شکۆدار خۆی دەنوێنێت
رۆژ چ عەشق ئەنگێزو،
شەویش هەروا چەند مەزنە
ئێمەش لەنێو شادی بەهەشت روێنراوین
لە دژواری لە شکۆمەندی بەرزی خۆر..
چێژو وەردەگرین
لەوێ ئێمە دەستەو یەخەین
هەندێک جار لەگەڵ خۆماندا و
هەندێک جاریش لەگەڵ دەوروبەرمان
هیچ کەس لەوی دی بەپێی
ئارەزووی خۆی کامڵ نابێت
لە دەرەوە تاریک دەبێت،
چونکە ناوەوە لەدرەوشانەوەدایە
دەرەوەیەکی روناک
ڕوانینێکی تاریک دادەپۆشێت
لەوێ، لەونزیکیەداو -
مرۆڤ بەختەوەری ناناسێت.

# دەرەوەی شوێن

## ئێدوارد سەعید ژیاننامەی خۆی دەنووسێتەوە

• ئا: ش



ئێدوارد سەعید ناوێکی گەورەی دنیای فیکرە لە رۆژگاری ئەمڕۆداو، دەگەمەنن ئەو زمانانەی کە تاکو ئێستا بێ بەشن لە شاکارەکانی ئەو: (ئۆرێنتالیزم/ نیشاندانی ئیسلام/ کلتورو ئیمپریالیزم/ رۆڵی روناکبیران و.. هتد). (دەرەوەی شوێن) دوایین بەرهەمی سەعیدەو، تیایدا بە وردی باس لە مێژووی ژیانی خۆی دەکات، هەر لە شاری قودسەوە بۆ قاهیرە و لەوێشەوە بۆ بەیروت و تا دەگاتە نیویورك. لەسەرەتای نەوەدەکانەوە، ئەوکاتەی پزیشکەکان پێیان راگەیاند کەوا دوچاری شێرپەنجەی خوێن (لۆکیمیا) بووەو چارەسەرکردنی نەخۆشیەکی وا ئەستەمە، بڕیاری دا دەست بکات بە نووسینەوەی سەربوردەی ژیانی خۆی.

ئەم مەزنە بیریارەی کە ئێستا بە دەنگێکی دیارو ناسراوی ناو خۆرئاوا دادەنرێت و، مامۆستای زمانی ئینگلیزی و ئەدەبی بەراوردکاریە لە زانکۆی کۆلۆمبیا کە یەکێکە لە کۆنترین زانکۆکانی شاری نیویورك لە ولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا، سالّی ***1935*** لە بەشی خۆرئاوایی شاری قودس لە فەلەستین چاوی بەدنیا هەلّهێناوە. بەلاّم ماوەی مانەوەی لەوێدا زۆر نەبووەو، هەر دوای راگەیاندنی دەولّەتی ئیسرائیل لە سالّی ***1948***دا خانەوادەکەی ناچار دەبن



فەلەستین جێ بهێڵن و روو بکەنە وڵاتی میسرو لە شاری قاهیرەدا نیشتەجێ بن.

سەعید نزیکەی دە ساڵێك لە قاهیرەدا دەمێنێتەوە و لەوێ لە کۆلیژی (ڤیکتۆریا)دا دەخوێنێ و، یەکێك لە هاوەڵەکانی لەو قۆناغەدا ئەکتەری بەناوبانگی میسری "عومەر شەریف" بووە. لە ساڵی **1958**دا بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن روو دەکاتە ئەمریکاو لەوێ لە هەردوو زانکۆی "برنستۆن و هارڤەرد" دەخوێنێ و بڕوانامەی دکتۆرا بەدەست دێنێت. کارنامەی دکتۆراکەشی لەسەر (جۆزێف کۆنراد) دەبێت. ئێدوارد سەعید لە (دەرەوەی شوێن)دا باس لە زۆر شتی تایبەتی ژیانی خۆی دەکات.. دارکاری کردنی لە لایەن مامۆستایانی قوتابخانەوە، پەیوەندی عەشق و خۆشەویستی، ژیانی تاراوگە، ساردوسڕی پەیوەندیەکانی بە باوکیەوەو، تێکەڵ بوونی بە ژیانی سیاسی و.. چەندین مەسەلەی تر.

سەعید تاقانە کوڕێ دایك و باوکی بووەو، چوار خوشکی هەیە. وەدیع سەعیدی باوکی یەکێك بووە لە بزنسمانە سەرکەوتووەکان و، بەهۆی ئەوەی کە خاوەن رەگەزنامەی ئەمریکی بووە لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە ریزی سوپای ئەمریکیدا خزمەتی کردووە. دایکی یەکێك بووە لەوانەی بەژیانی ئەمریکا هەراسان بووەو، بە درێژایی ئەو ساڵانە نەیتوانیووە بۆ چەند مانگێك نەبێت لە ئەمریکادا بمێنێتەوە. هەر بۆیە بڕیاری ژیانی لە لوبنان دا داوەو لە رێی "شارل مالك"ی باڵوێزی لوبنانەوە بۆتە خاوەن رەگەزنامەی لوبنانی. وەك (سەعید) لەم کتێبەیدا باسی دەکات و دەڵێت: دایکم تەنانەت دوای هێرش و پەلامارەکانی لوبنانیش لەلایەن ئیسرائیلەوە، هەر لەوێدا مایەوەو نمونەیەکی ئازایی و خۆڕاگری بوو.

سەبارەت بە تێکەڵ بوونی بەژیانی سیاسی، (ئێدوارد

سەعید) سەرەتای ئەم کارەی دەگێڕێتەوە بۆ ساڵی **1967** کاتێك تەمەنی سیو دوو ساڵان بووە. خانەوادەکەی دژی ئەم هەنگاوەی وەستاون و پێیان باش بووە تەنها هەر سەرقاڵی کاری ئەکادیمی خۆی بێت و تێکەڵ بە دنیای سیاسەت نەبێت. ئیتر ئەو لەوکاتەوە داکۆکی کەرێکی سەرسەختی خەباتی گەلی فەلەستینیەو، ئەمەش کێشەی زۆری بۆ ناوەتەوە لەلایەن جولەکە توندڕەوەکانی ئەمریکاو چەندین تۆمەتی وەك تیرۆریست و رەگەزپەرست و دژە جولەکە تاوانبار کراوە. تا ساڵانێکی زۆر ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی فەلەستینی بووە لە مەنفا. بەڵام لە دوای رێکەوتننامەی (ئۆسلۆ)وە، لەگەڵ (مەحمود دەروێش)ی شاعیردا دەستیان لەکارکێشایەوە. چونکە هەردووك پێیان وابوو لەو دانوستانانەدا (یاسر عەرەفات) دەستبەرداری مافە رەواکانی فەلەستینیەکان بووەو، سازشی گەورەی لەبەرامبەر ئیسرائیلیەکان دا کردووە. (سەعید) لەسەر پرۆسەی ئاشتی عەرەب-ئیسرائیل و رێکەوتننامەی (ئۆسلۆ) کتێبێکی نووسیوەو تیایدا بە توندی رەخنەی هەنگاوەکانی (عەرەفات) دەکات دەرهەق بەو مەسەلەیە.

لە دەرەوەی سیاسەت و دەربارەی ژیانی تایبەتی خۆی سەعید لەم کتێبەدا دەنووسێت: لە تەمەنی لاویەتیدا پەیوەندیم لەگەڵ زیاد لە ئافرەتێك هەبووەو گرنگترینیان پەیوەندیم بوو بە (ئیڤا عماد)ەوە، لەگەڵ ئەم خانمەدا پەیوەندیەکی خۆشەویستی توند هەبوو، تا گەیشتە ئەوەی بیر لە خواستنی بکەمەوەو ببینە ژن و مێرد، بەڵام بەهۆی ئەوەی لە تەمەندا حەوت ساڵێك لە من گەورەتر بوو، خانەوادەکەم رێگیریان کردوو نەیانهێشت ئەو کارە سەر بگرێت. سەربوردەی ئەم خۆشەویستیەش لە بەیروتی پایتەختی لوبناندا بوو. پاشان (سەعید) ژنێکی تر دەخوازێت کە ئێستا هاوسەریەتی و هەردووکیان خاوەنی کوڕو کچێکن.

ئێدوارد سەعید لە (دەرەوەی شوێن)دا زۆر شتی تر باس دەکات، وردەکاری زۆر وردی دیکەی ژیانی خۆی لە فەلەستین و ئەمریکا دەنووسێتەوە. رەنگە کاریگەری و تارمایی مردن بێت (سەعید)ی راپێچابێ بۆ ئەوەی لە کاری ئەکادیمیەوە بگوازێتەوە سەر نووسینەوەی ژیاننامەی خۆی بە هەموو خۆشی و ناخۆشیەکیەوە. لەبەرئەوەی ئەو دەزانێت دووچاری دەردێکی کوشندە بووە کە چارەسەرکردنی ئەستەمە، ئەوەشی وا دەکات هەڕەشەکانی ئەم نەخۆشیەی بەجدی وەرگرێت ئەوەیە کە دایك و باوکیشی هەریەکەیان بە دەردی شێرپەنجەوە ماڵئاواییان لە دنیا کرد.

سەرەڕای ئەو راستیانە بەڵام هەر ئومێدی تەمەنێکی درێژتر بۆ (سەعید)ی بیریارو روناکبیر دەخوازین، چونکە نەمانی ئەو خەسارەتێکی گەورە دەبێت و مردنیشی رووداوێکی ئاسایی نابێت.

# نازیزم و کۆمۆنیزم

## -خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانی نێوانیان-

• جۆرج تەرابیشی

• و: ب. لاوکۆ

گومانی تێدا نیە کە فەزڵی بڵاوبوونەوەی چەمکی "تۆتالیتاریەت" وەك چەمکێکی سێنتراڵ لە فەلسەفەی سیاسی هاوچەرخ دا، دەگەڕێتەوە بۆ خاتوو هانا ئارنت (1906-1975)ی نووسەری ئەڵمانی و هەڵگری رەگەزنامەی ئەمریکی.

هانا لە کتێبەکەیدا (بنەماکانی تۆتالیتاریەت) کە لە ساڵی 1951دا دەرچوو، کەوتە تەوزیفکردنی ئەم چەمکە (بۆ ئەوەی دەست پێشخەر بوویێت لە داتاشینیدا) بەو مەبەستەی خوێندنەوەیەکی هاوبەش دەربارەی هەردوو سستەمی (نازیزم و کۆمۆنیزم) بخاتەڕوو، کە لە کاتی خۆیدا بەڕادەیەکی زۆر ناکۆك و جیاواز بەیەك دەهاتنە پێش چاو.

بەراوردێکی وەها لە نێوان ئەو دوو سستەمەدا، ئەوسا بەردەوام تا ئێستاش، جێگای مشتومڕێکی زۆری ئەو نێوەندە رۆشنبیرییە ئەورووپاییانەیە کە پەیوەندییان بە تیۆرەی سیاسیەوە هەیە، بەتایبەت لە ئەڵمانیاو فەرەنسادا کە بە درێژایی پەنجا ساڵی رابردوو داکۆکی کردن و هەڵگەڕانەوە لە کەلەپووری مارکسیزم بۆتە تەوەرێکی بەردەوامی ژیانی فیکرییان.

لێرەدا دەپرسین رادەی مەشروعیەتی ئەو چەمکی تۆتالیتاریەتە چەندەو، ئاستی کارایی تا چ رادەیەکە وەك نمونەیەك بۆ تەفسیرکردنی تیۆریای دوو سستەمی سیاسی و ئایدیۆلۆژی بەشەڕهاتوو، کە لە گۆڕەپانی جەنگدا نەبێت لە هیچ جێگایەکی دیدا بە فیعلی



هیتلەر

رووبەرووی یەكدی نەبوونەتەوە؟

یەكەم شت كە (نازیزم و كۆمۆنیزم) لێك جیادەكاتەوە ئەوەیە هەردووكیان دوو دیاردەی تازەن و، پێشتر لە مێژووی مرۆڤایەتی‌دا شتی وەها نەبووە. زەبرو قورسایی ئەم دوو رژێمە تەنها لە ناوەكانیاندا نیە، بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەردووكیان هەر لە سەرەتاوە لەسەر زاری تیۆرسینەكانیانەوە ئەوەیان راگەیاند، كە دوو دیاردەی تازەن لە مێژوودا. بەڵام تازەیی هەردوو دیاردەكە بەس نیە بۆ ئەوەی بەراوردكاری لە نێوانیاندا كارێكی رەوا بێت. چونكە بەراوردكاری كاتێك دەكرێت كە خاڵی هاوبەش هەبێت. گومانیشی تێدا نیە هانا ئارنت لە دۆزینەوەو دەست نیشانكردنی خاڵی هاوبەشی نێوان (كۆمۆنیزم و نازیزم)دا دەست پێشخەربوو، وەك بوونی دەسەڵاتی تاك حزبی و گوڵاگ و كۆنترۆڵكردنی تەواوی كۆمەڵگە.

سەرەڕای ئەم خاڵە هاوبەشانەی نێوانیان بەڵام جیاوازی زۆریشیان هەیە: نازیزم راست رەوەو كۆمۆنیزم چەپڕەو. نازیزم نەتنیەو كۆمۆنیزم ئومەمی. نازیزم شەڕانی و جەنگ خوازەو، كۆمۆنیزم میانڕەوو ئاشتی خواز. نازیزم بە توندی دژایەتی دیموكراسی دەكات، لە كاتێكدا كۆمۆنیزم پێی خۆشبوو خۆی وەها وەسف كات كە (دیموكراسیەتێكی میللییە). مەرجەعیەتی تیۆرەی نازیزم بەها جێرمانیەكانی سەدەكانی ناوەڕاستە، لە كاتێكدا مەرجەعیەتی تیۆریای كۆمۆنیزم فەلسەفەی رۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسی بوو.

هەر لە رووی خاڵە جیاوازەكانی نێوان ئەو دوو سستەمەوە دەتوانین بڵێین تەنانەت ستالینیش هتلەر نیە. لەبەرئەوەی هتلەر هەموو نازیزمە، بەڵام ستالین قۆناغێك لە قۆناغەكانی كۆمۆنیزمە. شەخس پەرستی لە سەردەمی ستالیندا وەك كاریزماپەرستی سەردەمی هتلەر نیە. سەركردەی نازی بەرجەستەبوونی مرۆڤی باڵابوو، هاوكات سەركردەیەك بوو جەماوەری نەزان و نابینای بەرەو روناكی دەبرد. بەڵام جەماوەر لە سستەمی كۆمۆنیزمدا دروستكەری مێژووە.

ئەم جیاوازیانە لەسەر ئاستی مەرج و لەسەر ئاستی بەها ئایدیۆلۆژیەكان دواجار تەفسیری ئەو جیاوازیە گەورەیەمان بۆ دەكەن كە لە نێوان چارەنووسی مێژوویی نازیزم و كۆمۆنیزمدا هەیە. ئەوەتانێ رووخانی نازیزم تەنها لە رێی توندوتیژی و شەڕو دەست تێوەردانی دەرەكیەوە بوو. بەڵام هەرچی كۆمۆنیزمە ئەوا لەناوخۆوە هەرەسی هێناو، بە شێوەیەكی لەسەرخۆو بەبێ شۆڕشی خوێناوی كۆتایی هات.



ستالین

بە ڕووخانی نازیزم بەها مەرجەعیەکانیشی هەرەسیان هێنا، بەڵام لە کۆمۆنیزمدا ئەو بەهایانەی مەرجەعیەتی بوون، ڕۆڵێکی گەورەیان لە ڕووخانیدا گێڕا. شتێك بەردەوام کۆمۆنیزمی پێ ئیدانە بکرێت، ئەوەیە خیانەتی لە پراکتیزەکردنی ئەو بەهایانە کرد، کە مەشروعیەتی مێژوویی خۆی لەسەر بنیاد نابوو. بە واتایەکی دی دەکرێت بڵێین نازیزم تاوانێکی مێژوویی بوو، لە کاتێکدا کۆمۆنیزم درۆیەکی مێژوویی بوو، تاوانی دزێویش بەناوی ئەم درۆیەوە ئەنجام درا.

لەسەرویەندی ئەم لێکچوون و جیاوازیەی نێوان (نازیزم و کۆمۆنیزم)دا توێژەری پۆڵەندی (کریزستۆف بۆمیان) بۆچوونێکی جیاواز دەخاتە ڕوو. لای ئەم ئەو دوو ڕژێمە لەبەرئەوە لەیەك ناچن چونکە هەردووکیان تۆتالیتارین، بەڵکو ئەوان تۆتالیتارین لەبەرئەوەی خاڵێکی هاوبەش کۆیان دەکاتەوە، لەوەدا هەردووکیان لەیەك دەچن کە دژایەتیەکی توندی دیموکراسیەتی پەرلەمانی دەکەن و، دژ بە هەڵبژاردنی گشتی و دروستبوونی حیزبی جەماوەری و سەندیکاو ڕۆژنامەوانی میللین.

ئەگەر سستمی دیموکراسی دان بە جیاوازی و ململانێی شارستانی نێوان هێزو گروپە جیاجیاکانی کۆمەڵدا بنێت، ئەوا (نازیزم و کۆمۆنیزم) لە خاڵێکی ترەوە دەست پێ دەکەن و هەردووکیان پێیان وایە، نەتەوەو کۆمەڵگەی تەندروست ئەوانەن کە هیچ ناکۆکی و ململانێیەکی ناوخۆییان تێدا نیە. چونکە بەلای ئەوانەوە بوونی وەها ململانێیەك بەڵگەی نەخۆشیە نەك تەندروستی.

بەلای ئەم دوو ئایدیۆلۆژیایەوە بوونی هەر کێشەو ململانێیەك دەرەنجامی دەست تێوەردانی هێزێکی دەرەکیە لە کاروبارەکانی نەتەوە یان کۆمەڵدا. بەلای نازیزمەوە وەها دەستتێوەردان و ئاژاوەگێڕیەك لە ئەستۆی ڕەگەزە بیانیەکانی وەك یەهود یان قەرەج یاخود سلاڤیەکان دایە، بەلای بەلشەفیەکانیشەوە پاشماوەی چینە موڵکدارو

کۆلاك و ئەكلیرۆس و، ئەوانەی لەژێر کاریگەری کلتووری بۆرژوازی خۆرئاوادان لەو کارە بەرپرسیارن.

لە هەردوو حاڵەتەکەشدا قڕکردن و پاکتاوکردن ڕێگاچارەن بۆ پاراستنی یەکیەتی نەتەوەیی ئومەی ئەڵمانی و، یەکیەتی و یەکڕیزی چینایەتی کۆمەڵگەی سۆڤیەتی. لە پێناو پاراستنی یەککگرتوویی نەتەوەو کۆمەڵگەداو بۆ ڕێگەگرتن لە دروستبوونی ناکۆکی و جیاوازی، پێویستە هەموو دیاردەکانی دابەشبوون کە لەسەردەمانی کۆنەوە بەجێ ماون بنەبڕ بکرێن. وەك: ململانێی حیزبایەتی و، ئازادی ڕۆژنامەگەری و، فرەمینبەری و، کاری سەندیکایی و، تەواوی ئەمانەش بگۆڕدرێن بە چەند دام و دەزگایەکی دیسپلین کراوی کۆنکرێتی: یەك حیزب و، یەك سەرکردەو، یەك رای گشتی.

لێرەوە دەبینین خاڵی هاوبەشی نێوان ئایدیۆلۆژیای نازیزم و ئایدیۆلۆژیای بەلشەفیەت، ڕەتکردنەوەی هەموو جۆرە شێوازێکی ململانێی سیاسی و کۆمەڵایەتیە. وەها ڕەتکردنەوەیەکیش بەگەڕخستنی ماشێنی تیرۆرو، مۆبێلەکردنی ئایدیۆلۆژی دەستەجەمعی و سەراپاگیر بەدوای خۆیدا دێنێت.

ئەگەر سیاسەتیش یەکێك لە پێناسەکانی بریتی بێت لە هونەری بەڕێوەبردنی ململانێی کۆمەڵایەتی، ئەوا یەکەمین شتێك کە هەردوو ڕژێمی نازی و بەلشەفی لێی بێ ئاگابن بریتیە لە هونەری سیاسەت. چونکە سیاسەت لە بۆچوونی هیتلەرو ستالیندا درێژە پێدانی شەڕەو، کۆمەڵگەی سیاسیش گۆڕەپانی هەمیشەیی ئەو شەڕەیە. شەڕێك کە لە ڕێی سندوقەکانی دەنگدانەوە ناکرێت، بەڵکو لە ڕێیپاکتاوکردن و لەناوبردنی مادیەوەو، بەشێوەیەکی یەکجاری بەڕێوە دەچێت.

بە بڕوای (کریزستۆف بومیان)یش ئەمە بۆخۆی جەوهەری تۆتالیتاریەتی نازیزم و کۆمۆنیزمی بەلشەفیە، جگە لەمە هەرچی خاڵێکی هاوبەش و جیاواز لە نێوانیاندا هەبێت شتێکی سانەوی و لاوەکیە.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی (الحیاة)، ژمارە (13508).

# ئەگەری گۆڕانی "تورکیا"

## لەسەردەمی گۆڕاندا

• شوان ئەحمەد



**کتێب: تورکیا لەسەردەمی گۆڕاندا**
**-نیگەرانی شوناس و ململانێی ئەگەرەکان-**
**نووسەر: محەمەد نورەدین**
**وەرگێر: ئازاد بەرزنجی**
**لەبلاوکراوەکانی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**
**چاپی یەکەم/ 2000 - سلێمانی/ کوردستان**
**قەوارە: 477 لاپەڕە**

ڕەنگە زیادەڕۆیمان نەکردبێ گەر بلێین بەهێندی گرنگی تورکیا بۆ جیهانی عەرەبی یاخود بایەخدانی عەرەب بە ناسینی تورکیا، ئەمەندەش ئەو کارە بەلای نێمەی کوردیشەوە بایەخ و گرنگی خۆی هەیە. هەربۆیە چەندێك جیهانی عەرەبی لە خەمی کردنەوەی دەرگاکانی دابێت بەڕووی تورکیادا و، چەندێك هەوڵی ئەوە بدات کەناڵی زیاتر بدۆزێتەوە بەمەبەستی ناسینی تورکیاو ئاشنابوون پێی و، دواجاریش دروست کردنی رایەڵێکی پەیوەندی لەگەڵیدا لەسەر هەموو ئاستەکان، ئەوەندەش نێمە پێویستمان بەو تەقەللایەیە.

سەرنجدانێکی خێرای کتێبخانەی عەرەبی لەم دەساڵەی دواییدا ئەوە نیشاندەدات کە توێژەرو لێکۆڵەرەوەکانی عەرەب چ گرنگیەکی تایبەت بە تورکیا دەدەن. لەم سەرو بەندەشدا رەنگە قەڵەمەکەی "محەمەد نورەدین:" کە توێژەرێکە لە کاروباری تورکیاو مامۆستای زمان و مێژووی تورکیایە لە زانکۆی لوبنانی دیارترین یان بێت.

سەرقاڵی "نورەدین" بە تورکیاوە هەمە لایەنەو بەتەنها لایەنێك و کونجێکی ئەو مەسەلەیەی نەگرتووە، بەڵکو

ئەو بەشێوەیەکی سەراپاگیر کایە مێژوویی و سیاسی و جیوگرافی و کلتورییەکانی تورکیا بەسەر دەکاتەوەو بەشێوەیەکی ئەکادیمییانە باسیان لێوەدەکات.

"محەمەد نورەدین" لە ماوەی کەمتر لە دووساڵدا سێ کتێبی تایبەتی لەمەڕ تورکیا خستۆتە بەردەستی خوێنەرانی،ساڵی ئەوەدو حەوت دوو کتێب: (تورکیا لەسەردەمی گۆڕان دا - نیگەرانی شوناس و ململانێی ئەگەرەکان) ئەو کتێبەی کاك ئازاد بەرزنجی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و بابەتی ئەم نووسینەمانە، لەگەڵ کتێبی: (شەبقە و مێزەر - دەروازەیەك بۆ بزوتنەوە ئیسلامیەکانی ناو تورکیا). هاوکات ساڵی *1998* (تورکیا کۆمارە سەرگەردانەکەی) بەچاپ گەیاندووە.

ئەم کارەی (بەرزنجی) بۆ بەکوردی کردنی ئەم کتێبە سەرباری گرنگی و تایبەتمەندی خۆی شتێکی دیکەشمان بۆ ئاشکرا دەکات، ئەویش ئەوەیە کە کوردی تائێستاش چەند خەمساردو چەندێك بێ باکە لەوەی ئەوەکانی دی بناسێ، یان هەر هیچ نەبێت بەو وڵاتانە ئاشنابێت کە تەوقیان داوەو تەماسی بەردەوامی لەگەڵیان هەیەو، بگرە بەشێك لە نیشتمان و خەڵکانی میللەتەکەی لە ژێر دەستی ئەواندایە.

دەتوانین ڕونتر بڵێین بەکوردی کردنی ئەم کتێبە نیشانەی فەقیرییەکی زۆرە لە هەبوونی ئەو سەرچاوانەی تایبەتن بە تورکیا، یاخود لە بوونی نووسین و لێکۆڵینەوەی جیدی وەها کەواقعی تازەی تورکیا، لەبەردەم گۆڕانکارییە نوێکانی دوای جەنگی سارد و هەلومەرجی ئێستادا بخوێنێتەوە.

وەرگێڕانی ئەم کتێبەش هەوڵێکە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بەتاڵییەی کە پێ ناچێت تا ئایندەیەکی نزیکیش پڕبکرێتەوە و، ببێتە جێگە بایەخی نێوەندە پەیوەندی دارەکان بەو مەسەلەیە.

ناونیشانی ئەم کتێبەی "محەمەد نورەدین" (تورکیا لەسەردەمی گۆڕان دا) ناونیشانێکە بێ ئەندازە سادەو بێ گرێ و گواڵە. خوێنەری ئاسایی هەر بەر لەوەی دەست بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی بکات و بکەوێتە خوێندنەوەی بەشە جیاجیاکانی، دەمودەست لەوە حاڵی دەبێت کە تورکیای سەردەمی گۆڕان مەبەست لێی ئەو زەمان و قۆناغە تازەیەیە کە لە پاش کۆتاییهاتنی جەنگی ساردو، لەبەریەك هەڵوەشانی یەکیەتی سۆڤیەتی جارانەوە هاتۆتە ئاراوە.

ئەگەر بەکۆتایهاتنی جەنگی دووەمی جیهانی و دروست بوونی بلۆکبەندییەك لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لە نێوان بلۆکی خۆرئاواو خۆرهەڵاتدا، تورکیا وەك سوپەرێك لەبەرامبەر تەوژمی کۆمۆنیزم و پەلکوتانی زیاتری یەکیەتی سۆڤیەتی جاران دا ڕۆڵی گەورە و بەرچاوی درابێتی و، مەوقیعیەتێکی دیاری لەسەر نەخشەی سیاسی جیهان بۆخۆی گرتبێ، ئەوا دوای نیوسەدە و لە ئاکامی یەکالابوونەوەی ئەو ململانێ ئایدیۆلۆژی و سیاسیەی نێوان لیبرالیزم کۆمۆنیزم و (گەیشتنی مێژووی مرۆڤایەتی بە کۆتایی خۆی - بەبڕوای فرانسیس فۆکۆیاما)، پێ دەچێت تورکیا ڕۆڵێکی بەرچاوترو چارەنووسسازتر ببینێ، چ لەسەر ئاستی ئیقلیمی یاخود لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. کەم نین ئەو پسپۆڕو شارەزایانەی جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە (گەر تورکیا لە هەڵبژاردنەکانیدا کارامە بێت، ئەوا سەدەی بیست و یەك سەدەی خۆی دەبێت).

بەلام لەپای ئەم هەموو گەشبینی و خۆشباوەڕیەدا بە ڕۆڵی ئەکتیڤانەی تورکیا لەسەر نەخشەی سیاسی و ئابووری ناوچەکەو جیهان، نابێت ئەو ڕاستیانە لەبەر چاو نەگرین کە تورکیا بۆ گەیشتنەوەها دەرەنجامێك لەبەر هەلومەرجی گۆڕانکاریە تازەکانی دنیادا، ئەویش بۆ خۆی پێویستی بە گۆڕانکاری هەمەلایەنە هەیە.

شارێگای ئەو گۆڕانکاریانەش بەچارەسەرکردنی کێشەی کورد و ڕەخنەکردنی عەقلیەتی عەسکەرتاریەت و، ئایدیۆلۆژیای کەمالیزم دەست پی دەکات. ئەگەرچی کارێکی وا قورس و گران دێتە پێش چاو، بەلام ڕەنگە کارێکی مەحاڵیش نەبێت.

ئەوەی ڕێگای ئەوەشمان دەداتێ ئەوە بلێین، ئەو هەنگاوانە بوو کە سەرۆکی کۆچکردوو "تۆرگۆت ئۆزال" هەڵی هێنا. لەلایەك بەکردنەوەی دەرگا بۆ قسەکردن لەسەر ئایدیۆلۆژیای کەمالیزم، لەلایەکی تر بەگرتنە بەری سیاسەتێکی شێلگیرانە تر لەبەرامبەر مەسەلەی کوردو، گرتنەبەری ڕێگاچارەی ئاشتیانە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە. هەروەها فراوانکردنی ڕوبەری ئازادی لەبەردەم چاپەمەنی و ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکاندا، ئەمەو سەرەڕای ئەو ریفۆرم و گۆڕانکاریە تازانەی لەسەر ئاستی ئابووری پەیڕەوی کرد.

بەر لەوەی پرسیاربکرێت لەوەی تورکیا دوای جەنگی ساردو گۆڕانکاریە تازەکانی دنیا بەکۆی دەگات؟ یان چانسی ئەو لەسستمی نوێی جیهانیدا کەم دەبێت یان زۆر؟ یاخود نوقلانە بۆ پێگەو مەوقیعیەتی ئەو لەسەر نەخشی سیاسی تازەی جیهان لێ بدرێت، پێویستە سۆراخ لەوە بکرێت کە ئەو تاچەندە لە پای ئەو گۆڕانکاریە خێراو بەپەلانەی دنیادا توانای خۆگۆڕین و، دەسکاریکردنی ئەو خەت و هێڵە گشتیانەی هەیە کەسێ چارەکە سەدەیەکە دەقی پێیانەوە گرتووەو، زاتی دەسکاری کردنیان ناکات.

تورکیای ئەمڕۆ پاش کاندیدکردنی بۆبوونە ئەندام لە ریزی وڵاتانی ئەورووپیدا، لەبەر ڕۆشنایی ئەو هەلومەرجە تازەیەی لەنەوەدەکانەوە لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی هاتۆتە ئاراوە، لەبەردەم دووریانێکدایە:

ڕێگایەکیان داننانە بەمافە سیاسی و کلتوریەکانی گەلی کوردو، باوەڕهێنانە بە فرە شوناسی تورکیا لەبەرامبەر تاك شوناسیداو، گۆڕینی ئەو دیموکراسیەتە رووکەشەیە بە دیموکراسیەتێکی ڕاستەقینەو، سنووردار کردنی دەسەلاتی عەسکەرو ژەنەراڵەکانە لەدەست خستنە ناو کاروباری سیاسی دەوڵەت و، پەیڕەوکردنی عەلمانیەتێکی نوێو کراوەترە، لەگەڵ گرتنە بەری سیاسەتێکی نەرمتر لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکەدا. کە کۆی ئەمانە تورکیا لەو خەونانەی نزیکتر دەکەنەوە تاببێتە یاریکەرێکی کارا لەسەر ئاستی ناوچەکەو جیهان بۆ سەدەی بیست و یەك. بەلام لەبەرامبەریشدا هەڵبژاردنی ڕێگایەکی تر لە دەرەوەی ئەم هەنگاوە واقیعیانەش دا هەیەو، کارێکە بەتەواوی پێچەوانەی ئەو ڕێگایەیە کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا. ڕێگایەکی واش دوورنییە لە تورکیادا بەلقانێکی تر دروست نەکات و، پاشەکشەی زیاتر و زۆرتر بە ڕۆڵی تورکیا بکات لەناوچەکەو تەواوی جیهاندا. لەسەردەمی گۆڕان دا ئەگەری گۆڕانی تورکیاش لە ئارادایە، بەلام بە چ ڕووەیەکدا، ئەوا وەلامەکەی ئەو هێزانە دیاریی دەکەن کە جڵەوی بڕیاردانیان لەووڵاتەدا لەدەستدایە.

# عار تماماً كالماء

## کۆمەڵە شیعرێکی کوردی بە عەرەبی

**• ئاسۆ**




**ناوی کتێب: عار تماما کالماء**

**شیعری: دلاوەر قەرەداغی**

**وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: ئازاد بەرزنجی**

**شوێنی چاپ: دار الطليعة الجديدة - دمشق/ سوريا**

**ساڵی چاپ: 2000**

راستیەك کە بە زەقی هەستی پێ دەکرێ ئەوەیە کە بزووتنەوەی وەرگێڕان لە زمانی کوردیەوە بۆ زمانی تر بەدەست لاوازی و سستیەکی فرەوە دەناڵێنێت. ئەگەر کەسێکی بیانی بیەوێ سەبارەت بە ئەدەب و کەلتووری کوردی ئاشنایەتی پەیدا بکات ئەوا جگە لە هەندێ هەوڵی پەرتەوازە هیچی دی نابینێتەوە. بۆیە ئەمڕۆ وەرگێڕان وەکو پێداویستیەکی سەردەم خۆی دەسەپێنێ و هەر وەرگێڕانیشە دەبێ بەو پردەی بە دونیای تازەو هاوچەرخەوە دەمانبەستێتەوە.

لەم دواییەداو لە دیمەشقی پایتەختی سوریادا کۆمەڵە شیعرێکی کاك (دلاوەر قەرەداغی)ی شاعیر بە چاپ گەیەنرا. ئەم کۆمەڵە شیعرە کە کاك (ئازاد بەرزنجی) بۆ عەرەبی تەرجەمەی کردوون ئەم قەسیدانەی شاعیر دەگرێتە خۆی: وەك ئاو ڕووت و قووت، لە چاوتروکانێکا سەری وڵاتم سپی بوو، تا هەناسەبڕکا قووڵایی، لەگرگاشە دابەزین هەیە، رەشنووسی تەیرەکانی ئیسماعیل، چڵە سێبەرێکی شکاو.. شکاو، غەدر.

شایانی ئاماژە پێکردنە کە لە سەرەتای کتێبەکەدا پێشەکیەکی کورت هەیە بە قەڵەمی رێبین هەردی و هەروەها لێکۆڵینەوەیەك لەسەر قەسیدەی وەك ئاو ڕووت و قووت بە قەڵەمی ئازاد سوبحی.

ئەم کتێبە لە چاپخانەی (دار الطليعة الجديدة) بە تیراژی هەزار دانە بەچاپ گەیەنراوە.

# ژیانەوەی مەولانا جەلالەدین

• ئەریك فرۆم

• و. شاهۆ

**ئاماژەیەك:**

**ئەم نوسینە وەرگێرانی پێشەکیەکە بە قەڵەمی (ئەریك فرۆم)ی فەیلەسوف و دەرونناسی بەناوبانگ بۆ کتێبی (ژیانەوەی مەولانا جەلالەدینی بەلخی لە داهێنان و عەشقدا)، کە (د. رەزا ئاراستە) مامۆستای پێشوی دەروونناسی لە زانکۆی جۆرج واشنتۆن و پرینستۆن لە ئەمریکا نوسیویەتی. لەم کتێبەدا کە ساڵی *1965* لە خۆرئاوا چاپکراوە وەرچەرخانی رۆحانی و ژیانەوەی مەولانا، کە دوو نیشانەی میهرەبانی و کیانی داهێنان، لە روانگەی سایکۆلۆجی و دەرونشیکاریەوە خروانەتە بەر شیکردنەوەو لێکۆڵینەوە. هەروەها دۆخی ئەنتۆلۆژی مرۆڤ و خودناسی و رێوشوێنی کاریگەریی ئەندێشەو فەلسەفەی مەولانا لەسەر ئاستی ئەنتۆلۆژی مرۆڤی هاوچەرخ باسکراوە. ئەم کتێبە دوو جار لە ئەمریکاو ئینگلتەرا لە چاپ دراوەو، بۆ زمانی ئیسپانی تەرجەمە کراوە، لە ئەرجەنتین و مەکسیکیش جارێکی تر تەرجەمە کراوە بۆ ئیسپانی، ئێستاش دەستکراوە بە تەرجەمەکردنی بۆ سەر زمانی فەرەنسی، ئەم کتێبە لە ئێران لە ژێر ناوی "لەدایکبوونێك لە عەشق و داهێناندا" لەلایەن حسەینی نەجاتیەوە تەرجەمە کراوە بۆ فارسی و، چاپی یەکەمی لە بەهاری ساڵی *1993*دا بلاوکراوەتەوە. ئەو دەقەی کە سەرچاوەی وەرگێرانە فارسیەکەیە لە پاکستان بە زمانی ئینگلیزی لە چاپدراوە.**

ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین مرۆڤایەتی لە بەردەم ئەگەری روودانی جەنگی ئەتۆمی و،

پاشەکشێی بەها مەعنەویەکاندایە. مرۆڤ لە ئەنجامی نامۆبوونی لە خودی خۆیو، هاوچەشنەکانیو، سروشت.. هەروەها لە ئەنجامی ئەو سەرقاڵیو ماندووبوونە سەختەی لە ئارادایە لەبەردەم هەڕەشەی لەناوچووندایە. ئایا مایەی سەرسوڕمان نیە لە سەرانسەری وڵاتانی جیهاندا کەسانێك هەبن بەرامبەر ئەم دوو مەترسیيە پەرچەکرداریان هەبێو، جارێکی تر جەخت لەسەر مرۆڤدۆستی بکەنەوە؟!

لە راستیدا ئێمە لە چەندین وڵات و کامپی ئایدیۆلۆژیدا رێنیسانسێکی مرۆڤدۆستی دەبینین. دەتوانین ئەم مرۆڤدۆستیە تازەیە لە قسەی فەیلەسوف و زاناکان، سۆسیالیستە مارکسیەکان و حەکیمە ئیلاهیەکانی ئاینزای پرۆتستانت و کاتۆلیکدا بدۆزینەوە، کەسانی وەك برتراند راسل، ئەلبێرت ئەنیشتاین، ئەلبێرت شڤایتزەر، کارل رامنەر، جۆرج لۆکاش و ئێرنست بلاك.. لە نوێنەرە دەرکەوتوەکانی مرۆڤدۆستی هاوچەرخن. ئەم مرۆڤدۆستیە نوێیە بیروباوەڕی مرۆڤدۆستە گەورەکانی رێنیسانس بەشێوەی جیاو لە فۆرمی جیاوازدا دەژێنێتەوە. ئەم مرۆڤە مەزنانە بەشێوازی ئاینی و نائاینی باس لەوە دەکەن کە دەبێ متمانە بەهێزی مرۆڤ بهێنرێ لە پێناو بەرزڕاگرتن و پەکخستنی مرۆڤایەتیدا، لەپێناو ژیان و لێبوردن و سەقامگیرکردنی ئاشتی و ئارامیدا.. بە بڕوای ئەوان هوشیاری و خۆشەویستی ئەو دوو ئەنگێزەیەن کە توانای خۆناسین بە مرۆڤ دەبەخشن، ئیتر تاك دەتوانێ ببێتە ئەو کەسەی کە خۆی دەیەوێ. جگە لە هیومانیزم بە مانا گشتیەکەی، مەیلێکی تر لە ئارادایەو روو لە زیادبوونە، ئەویش عیرفانە کە شێوازێکی لە ئەندێشەی هیومانیزم.. مرۆڤی ئەم سەردەمە بەدوای مانایەکدا دەگەڕێ بۆ ژیان، رێبواری رێگایەکە لە پێناو نرخاندنی بەها مەعنەویەکان و وازهێنان لە جیهانی مادەو دەسەڵات و شۆرەت. ئەم مرۆڤە پێڕەوی ئاراستەیەکی ئاینی دەکا کە لەسەر ئاستی یەزدانناسی و ئایدیالی و ئەندێشەی کولتوری تەنها لە گەوهەری یەزدان وردنابێتەوە، بەڵکو زیاتر بایەخ بەو لایەنانە دەدا کە پەیوەندیان بە ئەزموونە دەرونیەکانی مرۆڤ و هاوئاهەنگبوونی لەگەڵ جیهان و ئازادبوونی لە کۆتی ئارەزوەکانی جەستە هەیە، هەروەها رزگاربوونی لەو وەهمانەی بەرهەمی جۆرێك لە خۆپەرستی هەمیشەیین و، دواجار، هەڵاتن لەو زیندانەی کە زێدی ئەو جۆرە وەهمانەن.

عیرفان کە بەبڕوای شڤایتزەر دوا بەرهەمی فەلسەفەی عەقڵانیە، زۆر بە روونی لە کارەکانی مایستەر ئەکهارت و قوتابخانەی (زن بودیسم)دا رەنگی داوەتەوە. هەرچەندە زن بودیسم قوتابخانەیەکی ئیلاهی نیە، بەڵام ئەکهارت پابەندی بیرۆکەی یەزدانە بە چەمکە مەسیحیەکەی، لەوەش زیاتر گەوهەری ئالوهیەتی وەك چەمکێك خستۆتە روو. هەروەکو سوزوکی دەڵێ سەرەڕای هەندێ جیاوازی لەنێوان نوسینەکانی ئەکهارت و زن بودیسم، جیهانبینیەکی هاوبەش لە نێوانیاندا بەدی دەکرێ، هەروەها لەنێوان هیومانیزمی خۆرئاوایی و عیرفانی ئەقڵانیدا جیهانبینیەکی هاوبەش هەیە، بەڵام ئەو پەیوەندیە رەنگ و بۆیەکی خۆرئاوایی هەیە، یان هەڵگری کۆمەڵێك نیشانەی

خۆرهەڵاتی دوورن. هیومانیزم و عیرفانی ئیسلامی مانایەکی قووڵیان هەیە، بەشێوەیەك رەنگە لە لایەن توێژەرو بیریارانی ئەو قوتابخانەیەوە دەرکی پێبکرێ. نوسەری کتێبی (ژیانەوەی مەولانا جەلالەدین..) جیهانبینی یەکێك لە گەورەترین عارف و هیومانیزمە ئیسلامیەکان پێشکەش بە جیهانی ئینگلیزی زمان دەکاو، لە راستیدا خزمەتێکی گەورەی مرۆڤی هاوچەرخ دەکا. جیهانبینی ئەم عارفە ئێرانییە جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ جیهانبینی عارفی گەورەی مەزهەبی کاتۆلیکی ئەڵمانیدا نیە، بگرە هەندێ جار بابەتەکان بە جورنەتێکی زیاترەوە، دوور لە مەزهەبگەرایی، خراونەتە روو. (بۆ نمونە ئەو قسەیەی کە دەڵێ مرۆڤ دەبێ سنوری یەککرتن لەگەڵ یەزداندا تێپەڕێنێ، یەککرتن لەگەڵ ژیاندا دەست بخا، یەکێکە لەو بابەتانە..).

نزیکەی *200* ساڵ پێش رێنیسانس، مەولانا ئەو باوەڕە هیومانییەی لە شێوەی وانەی تەحەمول و هەڵکرندا لەسەر بنەمای رێنماییەکانی ئاین باسکردووە، کە لە زۆر رووەوە لە کارەکانی ئەراسمۆس و نیکولاس دوکاسا دەچێ، هەروەها لە پێش (چینۆ)وە مەولانا خۆشەویستی بە سەرچاوەی ئەفراندن دەزانێ. مەولانا عارف و شاعیرێکە لەژێر کاریگەری (سروتە) رۆحانیەکاندا دەکەوێتە سەما، یەکێکە لە گەورەترین عاشقەکانی ژیان، لەهەر دێڕێکدا کە دەینوسێ، لە هەر شیعرێکدا کە دەیڵێ، ئەو عەشقە دیارو بەرجەستەیە.

مەولانا هەر بەتەنها شاعیرێك و سۆفییەك و دامەزرێنەری ئاراستەیەکی ئاینی تایبەت نەبوو، ئەو کەسێك بوو کە سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ روانینێکی قووڵی هەبوو. ئەو لە بارەی دەسەڵاتی ئەقڵ بەسەر غەریزەکان و ئاکارو ویژدانی بەئاگاو ویژدانی بێئاگاو هوشیاری گەردوونیدا توێژینەوەی ئەنجام داوە، مەسەلەی ئازادی ئارامیی مرۆڤ و پلەوپایەو تواناکانی دەخستە روو. مەولانا لە تەواوی ئەو بوارانە دواوەو، لێدوانەکانی بۆ کەسانێك گرنگە کە لە سروشتی مرۆڤ دەکۆڵنەوەو، گرنگی خۆیان هەیە، نوسەری ئەم کتێبە کە خۆی قوتابیەکی رێبازی لێکۆڵینەوەیە لە سروشتی ئادەمیزادو، رێگەچارە جیاوازەکانی سەرفرازبوونی مرۆڤە لە نارێکیە زەینیەکان، یاریدەدانی بۆ گەیشتنی بەسەربەخۆیی و ئارامی رۆح، لەو کارەیدا سەرکەوتووە کە لە سیستمی فیکریی مەولانا بەتەواوی بکۆڵێتەوەو، لە هەمان کاتیشدا پێوەندیی نێوان فیکری مەولاناو مەسەلەکانی دەرونشیکاری ئەمرۆ پیشان بدات. نوسەری ئەم کتێبە بە روونکردنەوەی بیروباوەڕەکانی یەکێك لە مرۆڤدۆستە گەورەکان و وردبوونەوەیەکی زیندو لە بیروبۆچونەکانی و، جەخت کردنی لەو هزرانەی کە پەیوەندییان بە هزری سەردەمەوە هەیە بەشدارییەکی باشی لەژیانی کولتوری دنیای ئینگلیزدا کردووە.

**سەرچاوە:**

تجدید حیات مولانا، نوشته: اریك فروم، ت: دکتر سعید علوی نائینی. همشهری. شماره *1838*، *5* خرداد *1378*–*1999*، ص*11*.

